## تێبنی:

ئەم کتێبە پێکهاتوە لە (٣٠٠) پرسیار و وەڵام دەربارەی بیروباوەڕی ئیسلامی لە نێوان قورئان و سوننەتدا، کە وەك بەرنامە بۆ رۆڵەکانی ئیسلام نوسراوە، هەموو کون و قوژبنەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی لە ژێر رۆشنایی قورئان و سوننەت بە تێر و تەسەلی بە بەڵگە روون کردۆتەوە.
بیری هەڵەی چەند تاقمێك دەخاتە بەرچاو کە لەبەردەم هەندێك باسی بیروباوەڕدا ساتمەیان بردوە، بەتایبەت دەربارەی هەقیقەتی باوەڕ و ناو و سیفەتەکانی خوا و قەزا و قەدەر و بیدعە و....هتد .
ئاماژە بە چاکترین و رێك و پێکترین بیر و بۆچوون و رێرەو دەکات کە رێبازی رەسەنی سەلەفی ساڵحە.
رێز و نەوازشێکی چاك دەنێ لە زانا و پێشەوایانی ئیسلامی، بەتایبەت ئەوانەی فەزلی زۆریان هەبوو بەسەر ئوممەتی ئیسلام و کۆمەڵی موسڵمانان.
برایان و خوشکانی فێرخوازی زانستی شەرعی داوام وایە وەکو برایەکی بچووك و دڵسۆزتان هەوڵدەن بۆ خوێندنی ئەم کتێبە و تێگەیشن لێی واتە بزانن باسی چی دەکات، بە جۆرێك حەق و راستیت بۆ روون بێتەوە ئامانجت لە خوێندن و بەژداری کردنی ئەوە بێت کە چاك و خراپ، رێگای راست و باتڵ و رێگای شەیتان و گومرای شارەزا بی و بناسی و چەسپاو بی لە سەر رێگای حەق و دوور بکەویتەوە لە رێگای شەیتان و گومرای، دوای خوێندنەوەی کاریگەری وسوودی هەبێت نەك تەنها خوێندنەوەیەکی بێسوود.
داواکارین لە الله تعالی بمانکاتە خزمەتکاری ئیسلامەکەی و پاسەوانێکی دڵسۆزی شەریعەتە پاکەکەی، امین.
برای بچووکتان: بەندەی الله.

**پرسیار:** بیروباوەڕ(العقیدة) مانای چییە؟

**وەڵام:** زاراوەی (العقیدة) لە بنچینە بەواتای (عقدة) دێت واتە (گرێ) مەبەست لە گرێش ئەوەیە کە خوای پەروەردگار وای لەبەندەکانی خۆی دەوێت کە بەجۆرێک پەیوەست و هۆگربن بە ئاین بەرنامەکەی خۆی کە وەکو گرێیەک پێیەوە قایم بن لێی جیانەبنەوە، بۆیە گەر بینرا کەسێک نوێژ ناکات یان ڕۆژوو ناگرێت یان خوانەناسە ئەوا خۆی لەگەڵ بەرنامەی الله تعالی شل کردۆتەوە تاکو بەتەواوی لێی جیا ئەبێتەوە وەکو چۆن دوو گرێی لێک گرێدراو لەئەنجامی شل بوونی (گرێ) کە لێک جیائەبنەوە.

هەروەها (العقیدة) بەمانای (العهد الموثوق) دێت واتە: پەیمانێکی پتەو یان بەمانای (البیع) دێت واتە فرۆشتن بۆیە الله تعالی وای لەبەندەکانی دەوێت کە پەیمان بدات لەسەر ئاوەی کە خۆی بە خوا بفرۆشێت لەبری ئەوە بەهەشتی پێ بدات وەک دەفەرموێت: **(إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ)** التوبة:١١١ واتە: خوا گیان و ماڵی لە بڕواداران کڕیوە لەبری ئەوە بەهەشتیان پێ دەبەخشێت.

**پرسیار:** گرنگی بیروباوەڕ چییە لە ژیانی ئادەمیزاد؟

**وەڵام:**

١. بۆئەوەی خەڵکی نیەت پاک بن و بێ کینە و غەرەز بن تاکو بتوانن بە چاکی خوای خۆیان بپەرەستن کە حەتمەن بۆ ئەوەش خولقێنراون

٢. ڕزگارکردنی بیرو ژیر (الفکر و العقل) لە بیروباوەڕی تێک چرژاو و گەنیوی بێگانە کە هیچ کات مشوری کێشەکانی مرۆڤایەتی نەبوون و خەڵکیان زیاتر بەرەو چاڵ و نەفامی و دواکەوتووی بردوە.

٣. ئۆخژن و شادمانی دەدات بە دەروونی ئادەمیزاد هەروەک خوای گەورە دەفەروێت: **(أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ)** الرعد:٢٨ واتە: بە یادی الله تعالی دڵەکان ئۆقرەگیر دەبن.

٤. پاراستنی مەبەست و گوفتاری ڕاستەقینە لە هەڵدێر و کەندەرانی کوێرەوەری و تاریکی، واتە لە ڕێگەی بیروباوەڕی ئیسلامیەوە خواپەرەستیەکەمان دووچاری کزبوون و سست بوون نایەت.

٥. خاوەنی بڕیار و حزم و جزم دەبێ، واتە :بڕیار و توانامان لەدەست خۆ دەبێ و بەدەستی خۆ پشتی خۆمان دەخورێنین پێغەمبەری نازداریش ﷺ دەفەرموێت: **(المؤمن القوي احب الی الله من المؤمن الضعیف)** مسلم، واتە: بڕواداری بەهێز خۆشەویسترە لای خوا لە بڕواداری لاواز.

٦. ئومەتێكی داڕێژراو و پتەوی لەسەر بنیاد ئەنرێت كە توانای هەموو شتێكی هەبێ بەجۆرێک دوژمن نەتوانێت زەفەری پێ ببات، هەر حوكمەتێک ئەگەر لەسەر بنچینەی باوەڕ بەخوا بوون و باوەڕێكی ڕاستەقینە دانەمەزرابێت ڕۆژێک دێت بڕوخێت گەلانی پێشوو وەک]فیرعەون، كیسرا، هرقل، هیتلر، هۆلاكۆ، هتد ..چاكترین بەڵگەن بۆ ئەم ڕاستیە...

صلاح الدين الايوبي یش بە ئیسلام توانی قودس ڕزگار بكات، بەڵام نەوەكانی دوای ئەو پشتیان لە ئیسلام كرد بۆیە قودس داگیركرایەوە..

٧. گەشتن بە كامەرانی دونیا و دوارۆژ، ئەویش بە چاكردنی كۆڕ و كۆمەڵ لەسەر بنچینەی بیروباوارِی ئیسلامیەوە..

٨ . بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارە نەمرەكانی (الاسئلة الخالدة) كە بریتیە لەم پرسیارانە: لە كوێ هاتووی؟، بۆچی هاتووی؟، بۆ كوێ دەچی..؟

**پرسیار:** ئەو شتانە چین پێویستە موسڵمان بیزانێت؟

**وەڵام:** چوار شت هەن پێویستە هەموو موسڵمانێک بیزانێت:

١. سێ بنچینەكە كە ئینسان پێویستە بیزانێت ئەویش بریتین لە ناسینی: الله تعالى پاشان پێغەمبەرﷺ و دینی ئیسلام بە بەڵگە [هەروەک پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: **(ذَاقَ طَعْمَ الْإِيمَانِ مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا)** مسلم واتە: تامی باوەڕی چەشتووە ئەو كەسەی ڕازی بێت پەروەردگاری الله بێت و ئیسلام ئاین و بەرنامەی بێت و محمد ﷺ پێغەمبەر و سەرقافڵەی بێت.

٢.كارپێكردن بەو سێ بنچینە دوای ناسینیان

٣.بانگەواز بۆ كردنیان.

٤. ئارامگرتن لەسەر ئەو پەرچ و ئازاردانەی هاوشان لەگەڵ بانگەوازییەكە دێتە ڕێت، الله ئەفەرموێت: **(وَٱلْعَصْرِ، إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَفِى خُسْرٍ، إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلصَّبْرِ)** العصر ١- ٣. واتە: سوێند بە زەمانە سوێند بەكاتی عەسر بەڕاستی ئادەمیزاد لە زەرەرمەندی و خەسارەتمە ندیدایە بێجگە لەوانەی كە باوەڕیان هێناوەو كارو كردەوە چاكەكانیان ئەنجامداوەو ئامۆژگاری یەكتریشیان كردووە كە هەمیشە پابەندی حەق بن پابەندی حەقیش پێویستی بە خۆگری هەیە لەبەر ئەوە بەردەوام ئامۆژگاری یەكتریان كردووە تا هەمیشە و بەردەوام، خۆگرو ئارامگریش بن.

**پرسیار:** خوای خۆت بەچی ناسیوە؟

**وەڵام:** خوای خۆم بە نیشانەكان و دروستكراوەكانی و گۆڕینی شەو و ڕۆژ... هتد ناسیوە، هەروەک خوای گەورە ئەفەرموێت: **(وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ لَا تَسْجُدُواْ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ)**٣٧ فصلت.

واتە: لە نیشانە و بەڵگەكانی دەسەڵاتی پەروەردگار شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگە، هەرگیز نەكەن سوژدە بۆ خۆر، یان مانگ ببەن، بەڵكو سوژدە تەنها بۆ ئەو خوایە ببەن كە دروستی كردوون، ئەگەر ئێوە خۆتان بە بەندەی ڕاستەقینەی ئەو دەزانن و هەر ئەو دەپەرستن، یان دەفەرموێت: **(يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ، ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ فَلَا تَجْعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا وَ أَنتُمْ تَعْلَمُونَ)**البقرة٢٢,٢١

واتە: ئەی خەڵكینە پەروەردگاری خۆتان بپەرستن، ئەو زاتەی كە ئێوە و پێشینانی ئێوەشی بەدی هێناوە، بۆ ئەوەی ڕێبازی خواناسی و تەقوا و پارێزكاری بگرنە بەر، هەر ئەوزاتە زەوی كردووە بە فەرش و جێگای نیشتە جێ بوون و ژیان بۆتان، ئاسمانی وەكو سەقفێك بەسەرتانەوە ڕاگیر كردووە، لە ئاسمانەوە ئاوی بۆ باراندوون، جا بەهۆیەوە جۆرەها بەرهەمی) درەخت و گژوگیای (بەدەرهێناوە تا ببێتە ڕزق و ڕۆزی بۆتان، كە واتە شەریك و هاوتا بۆ خوا بڕیار مەدەن، كە خۆشتان دەزانن پەرستراو دەبێت بەدیهێنەر بێت.

**پرسیار:** ئاین(دین) چییە؟

**وەڵام:** وشەی دین لە زمانی عەرەبی بە زۆر مانا دیت لەوانە:

١. سەركۆنەكردن و دەسەڵات و حوكمڕانیەتی، هەروەک دەڵێن **(دَانُ النَّاسَ)** واتە: زۆرلێكردن تا بەگوێیان بكەن، یان **(دنتهم فدانوا)** واتە: سەركۆنە كردن و ئەوانی بەگوێیان كردن.

٢.گوێڕایەڵی و ملكەچپێكردنیان بۆ حاكمیەتی الله، هەروەک پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: **(أُرِيدُ مِنْ قُرَيْشٍ كَلِمَةً تُدِنُ بِهَا العَرَبَ)** واتە: قسەیەكم لە قوڕەیشیەكان دەوێ تاكو ملی عەرەبەكانی پێ كەچ بكەن، یان لە باسی خەواریج دەڵێ: **(يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرَقَ السَهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ)** واتە: لەگوێڕایەڵی دین دەردەچن هەروەک تیر لە كەوان دەردەچێت.

الله تعالی ش بۆ هەردوو خاڵی پێشوو دەفەرموێت: **( قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ، وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ)** ١٢,١١الزمر

واته: ئەی پێغەمبەرﷺ پێیان بڵێ: بەڕاستی من فەرمانم پێدراوە هەر خوا بپەرستم و لەهەموو ژیانمدا ملکەچ و فەرمانبەرداری دین و ئاین و بەرنامەی ئەو بم، فەرمانیشم پێدراوە کە یەکەمین کەس بم لە خواپەرستی و ئیسلامەتی و دینداریدا.

٣.شەریعەت و یاسا و مەزهەب وداب و نەریت ... هەروەک دەڵێن: **(مَازَالَ ذَلِكَ دِينِي و دَيْدَنِي)** واته: بەردەوام ئەوە داب و نەریتی منە .

یان الله تعالی دەفەرموێت: **(كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلْمَلِكِ)** يوسف٧٦

واته: ئا بەو شێوەیە یوسفمان فێری نەخشەی گلدانەوەی براکەی کرد،

٤ . پاداشت و تۆڵە و لێ پێچینەوە، هەروەک کافرەکان دەڵێن: **(أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ)** الصافات ٥٣ واته: ئایا ئەگەر بووینە خاک و ئێسک ئێمە بەڕاست پاداشت دەدرێینەوە؟!

یان دەڵێن: **(إنَّهُ كَان دَيَّانْ هذه الأمة يعد نبيها)** واته: ئەم پیاوە قازی و حاکمی دادگای ئەم وڵاتەیە لەدوای پێغەمبەرەکەیان، الله تعالی ش ئەفەرموێت: **(أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ)** الماعون١

واته: ئایا سەرنجت نەداوە لەو کەسەی ئاینی خوا بە درۆ دەزانێت؟!

کەواتە: بەپێی ئەم چوارخاڵەی سەرەوە دەتوانین بڵێین:

دین ئەو دەستوور و یاسا و ڕێسایەیە کە دەبێ لە ژیان کاری پێ بکرێ و ملی بۆ کەچبکرێ گوێڕایەڵی گشت مادده و دەستوورەکانی بکرێ دەبێ چاوەڕێی پاداشت و سزای ڕۆژی دوایی بن لەسەر جێبەجێ کردن و جێبەجێ نەکردنی ئەم دەستوورە، چاکترین پوختترین و ڕێکترین ئاینیش لەلای الله ئیسلامە، هەروەک دەفەرموێت: **(إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ)** آل عمران ١٩واته: بەڕاستی دین و ئاینی پەسەند لای خوا تەنها ئاینی ئیسلامە.

هەروەها دەفەرموێت: **(وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ)** آل عمران٨٥

واته: جائەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت

پێغەمبەریشﷺ دەفەرموێت: **(والذي نفسي بيده لايسمع بي أحد من هذه الأمة يهودي ولا نصراني ثم لم يؤمن بالذي أرسلت به الا كان من اصحاب النار)**مسلم، واته: سوێند بەو ئەو زاتەی نەفسی منی بەدەستە هیچ کەسێک نییە لەم ئوممەتە لە یەهود و نەسارا نای منی بیستبێت و بڕوا بەو ئاینە نەهێنێت کە من بۆی نێردراوم ئەوا بێگومان نیشتەجێی ئاگرە.

**پوختەی قسان:**

ئیسلام ئاینی گشت پێغەمبەران (علیهم صلاة والسلام) و پیاوچاکان بووه، ئەوەتا نوح (علیه‌السلا) دەفەرموێ: **(أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمين)** واته :فەرمانم پێ کراوه کەوا له موسوڵمانان بم، (إبراهیم و إسماعیل علیهم صلاة والسلام) دەفەرموون: **(رَبَّنا واجْعَلنا مُسْلِمَيْنِ لَکَ)** واته :پەروەردگارمان وامان لێ بکه تەسلیمی تۆ بین، یان موسی (علیه السلام) دەفەرموێت: **(فَعلَيهِ تَوَكَّلوا إِنْ كُنْتُمْ مُسْلِمينَ)** واته پستی خۆتان به الله ببەستن ئەگەر ئێوه موسڵمانن، هەروەها یوسف (علیه السلام) دەفەرموێ: **(تَوَفَّني مُسْلِماً وأَلْحِقْني بِالصَّالِحِينَ )** واته: بەموسڵمانی بممرێنه و بمخه کاروانی به چاکه کاران...هتد.

**پرسیار:** بەشەکانی دین یان ڕوکنەکانی دین چین؟

**وەڵام:** دین لەسێ بەش پێک دیت که بریتین له:

**ئیسلام:** هەروەک پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **(الْإِسْلَامُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلًا )** مسلم، واته: ئیسلام بریتیه لەوەی که دانبەوەیا بنێیت جگه له الله شایستەی پەرەستن نییه و محمدﷺ یش نێردراوی ئەوە، نوێژ ئەنجام بدەیت و زەکات بدەیت و ڕۆژوو بگریت و ئەگەر لەتوانات هەبوو حەجی ماڵەکەی بکەیت.

هەروەها الله تعالی دەفەرموێت: **(إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ )** آل عمران ١٩ واته :بەڕاستی دین و ئاینی پەسەند لای خوا ئیسلامه.

**ئیمان:** هەروەک پێغەمبەرﷺ لەوەڵامی جبریل کەلەسەر شێوەی عەرەبێکی خێڵەکی هاته لای پێغەمبەرﷺ و پرسیاری لێکرد دەربارەی ئیمان ئەویش فەرمووی: **(أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ، خَيْرِهِ وَشَرِّهِ )** واته: ئیمان بریتیه له بڕواهێنان به الله تعالی پاشان فریشتەکانی و کتێبەکانی پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و قەدەر به خێر و شەڕی.

**ئیحسان:** بەهەمان شێوه له وەڵامی جبریل پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **(أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ)** واته :خوای خۆن بپەرەستی بەجۆرێک که خوا ئەبینیت، خۆ ئەگەر تۆ ئەو نابینیت خۆ ئەو تۆ ئەبینێت.

**پرسیار:** ئیسلام چییه؟

**وەڵام:** ئیسلام ئەو ناوەیه كه ئاین و بەرنامەی پێغەمبەریﷺ پێ ناسراوە، هەر وەک الله دەفەرموێت: **(وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ)** المائدة:٣. واته: ڕازیم بەوەی كه ئیسلام ببێته بەرنامەو دین و ئاینتان .

هەروەها لەڕووی زمانەوانی به سی مانا دێت:

یەكەم: خۆبەدەستەوە دان و خۆیەكلایی كردنەوە

دووەم: ئاشتی و ئاسایش

سێیەم: گوێڕایەڵی و ملكەچی

لەڕووی شەرعیشەوە ئیسلام واته :یەكتایی و خۆبەدەستەوەدان و ملكەچی و یەكلابوونەوە، هەروەها بریتیه له بڕواهێنان بەو بنچینه ئاینیانەی كه بۆ پێغەمبەرﷺ هاتووە.

قورئانی پیرۆز ئیسلامی له دژی شرک داناوە، هەروەک الله دەفەرموێت: **(قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ)** الانعام١٤ . واته: ئەی پێغەمبەرﷺ پێیان بڵێ: ئایا بەعەقڵ و ژیریی ئێوە ڕەوایه كه جگه له خوا كەسێكی تر بكەمە پشت و پەنای خۆم كه بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەویه و هەر ئەویش ڕۆزی بەخشه و بێ نیازە له هەموو ڕزق و ڕۆزیەک، دووبارە بڵێ: من بەڕاستی فەرمانم پێدراوە یەكەم كەس بم كه تەسلیمی ئەو زاته ببم و موسڵمان بم و من پێت ڕادەگەیەنم كه :هەرگیز نەكەیت له موشریک و هاوەڵگەران بیت.

هەروەها قورئان ئیسلامی لەدژی كوفر داناوە هەروەک الله دەفەرموێت: **(وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرْبَابًا أَيَأْمُرُكُم بِٱلْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ)**آل عمران٨٠

واته: هیچ پێغەمبەرێک (فرمانی ئەوەی نەداوە كه فریشتەكان و پێغەمبەران بكەن به پەروەردگار) هەرگیز كاری لەو جۆرە لەوان ناوەشێتەوە (ئایا ڕاسته فرمانی بێ باوەڕیی و كوفرتان پێ بدات دوای ئەوەی كه ئێوە موسڵمانن و ملكەچی پەروەردگارن؟!

هەروەها بەمانای یەكلایی بونەوە بۆ الله هاتوە، هەروەک دەفەرموێت: **(وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ)**النساء١٢٥ واته: كێ هەیه ئاینی چاكترە پەسەندترو جوانتر بێت لەو كەسەی ڕووی كردۆته خوا و خۆی تەسلیمی ئەوزاته كردووەو لەكاتێكدا كارجوان و كار پەسەندە هەروەها بەمانای ملكەچ بوون و خۆ بەدەستەوەدان دێت، الله دەفەرموێت: **(وَ أَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ)** الزمر٥٤ واته: هەوڵ بدەن هەمیشه و به ردەوام دڵتان لای خوابێت و بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان و تەسلیمی ئەوبن.

**پرسیار:** تایبەتمەندییە گشتیەکانی ئیسلام چییە؟

**وەڵام:** ئاینی ئیسلام چەند تایبەتمەندییەکی گشتی هەیە، لەوانە:

١- ئاینێکی خواییە: هەروەک الله ئەفەرموێ: **( يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا)**النساء١٧٤ واتە: ئەی خەڵکینە بەڕاستی لە لایەن پەروەردگارتانەوە بەڵگەو نیشانەی ئاشکراتان بۆ هاتووە کە محمد پێغەمبەرەﷺ و نوورو ڕووناکیەکی ئاشکراشمان بۆ دابەزاندوون کە قورئانە .

٢- ئاینی ئسلام بەرنامەیەکی هەمەلایەنەیە **(الشمول)** هیچ شتێک نییە ئەم ئاینە باسی لێوەنەکردبێت، بەڵکو سیستەمێکی هەمەلایەنەیە بۆ هەموو لایەنەکانی ژیان، دەبێت بەپێی ئەم بەرنامە کارەکانی ڕێکبخات، بۆ هیچ کەس نییە بڕوای بە هەندێکی هەبێت و بڕوای بە هەندێکی نەبێ... هەروەک الله دەفەرموێت: **(أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ]**البقرة٨٥ واتە: کەوابوو چۆن دەبێت باوەڕتان بە بەشێکی هەبێت و بەشێکی تری باوەڕتان نەبێت؟ ئایا پاداشتی ئەوەتان کە ئەوکارە دەکات جگە لەسەر شۆڕیی و سووکی نەبێت لە ژیانی دنیادا هیچی تر هەیە؟ لە ڕۆژی قیامەتیشدا دەگەڕێنرێنەوە بۆ ناو سەختترین سزا، خوایش بێ ئاگانیە لەو کارانەی کە ئێوە ئەنجامی دەدەن .

٣- ئاینی ئیسلام بەرنامەیەکی جیهانییە: ئیسلام بەرنامەیەکە بۆ تاقم و چینێکی دیاریکراو نەهاتووە، بەڵکو بەرنامەیەکە بۆ سەرجەم گرۆهـ و نەتەوە و زمانێک، هەروەک الله دەفەرموێت: **(وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا )**السبأ٢٨. واتە: ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە، مەگەر بۆ ئەوە نەبێ کە بۆ هەموو خەڵکی ببیتە مژدەدەرو ترسێنەر.

٤- ئاینی ئیسلام ئاینێکی واقعییە: ئەم ئاینە لەگەڵ واقعیەتی ژیان و هەڵسو کەوتی ئادەمی گونجاوە کاڵای باڵایەتی، الله کارێکی وەهای پێ نەبەخشیوە کە لەتوانای نەبێت، بەڵکو هەرشتێک لە قورئان هاتوە بۆ ئاسانکاری ژیانیەتی، هەروەک الله دەفەرموێت: **(لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا)**البقرة٢٨٦ واتە: الله تعالی کارو فرمانێک ناخاتە هیچ کەس کە لەتوانای نەبێت.

هەروەها دەفەرموێت: **(وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ )**الحج٧٨ واتە :پەروەردگار لە دوونیا هیچ شتێکی بۆ ئێوە نەکردووە بە مایەی تەنگی و نارەحەتی.

٥- ئاینی ئیسلام ئاینێکی مرۆڤایەتییە :مرۆڤ بە فطرەت موسوڵمانە، ئیسلامیش ئاینێکە لەگەڵ سروشتی مروڤ مامەڵە ئەکات..

ئیسلام هاتووە مەکانەتی ئادەمی لە بوونەور دیاری بکات، ناسنامەی خۆی لەژیان پێ ببەخشێت کە بریتیە لە جێنشینی لەسەر زەوی، هەروەها دەیەوێت ئینسان بەرەو کەمالبەرزی بچێت، گرنگی بە شتی بەرز بدات لە ژیاندا بەسەر بەرزی بژی و ملی بۆ ستەم کەچ نەکات، هەروەک الله دەفەرموێت: **(إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَ إِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ )** النحل.٩ واتە: بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بە خزمان و قەدەغە لە گوناهو تاوان و دەستدرێژی دەکات بۆ سەر ماڵ و نەفس و نامووس.

**پرسیار:** ئیسلام بۆچی هاتووە؟

**وەڵام:** بۆ ئەم پرسیارە هەمان وەڵامی (ربعي کوڕی عامر) دەدەینەوە کەوا لە شەڕی قادسیە (ڕۆستەم) کە سەرکردەی فارسەکان بوولێ پرسی: ئێوە بۆچی هاتوون شەڕ لەگەڵ ئێمە دەکەن؟

ربعي یش وەڵامی دایەوە و فەرمووی: **(إن الله إبتعثنا لنخرج من شاء من عبادة العباد إلى عبادة الله وحده، ومن ضيق الدنيا إلى سعة الدنيا والاخرة، ومن جور الأديان إلى عدل الاسلام)** البداية و النهاية.

واتە: الله تعالی ئێمەی ناردووە تا بەندەکان لە بەندایەتی بەندە بۆ بەندایەتی الله بە تاک و تەنها، وە لە تەنگ و تاریکی دونیا بۆ فراوانی دوونیا و دوارۆژ، وە لە زوڵم و زۆری ڕێبازەکان بۆ دادگەری ئیسلام...

کەواتە: ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە تاکو خەڵکی بەتەنها الله بپەرەستێت، ڕوو لە هیچ لە خەڵک و ڕێبازێکی دەستکرد نەکات.

چونکە ئەگەر خەڵک الله ی نەناسی و پشتی کرد لە دین ئەوا دونیای لەلا تەنگ و تاریک ئەبێ، بەڵام بەپێچەوانەوە دونیا، دوارۆژت بۆ فراوان دەبێ.

دواتر ئەگەر خەڵکی نەهاتنە ناو ئیسلام ئەوا ئەبنە پاروویەکی چەوری تاغوتان زۆر بەئاسانی هەزم ئەکرێن، بەڵام بەهاتنی ئیسلام عیزەت و ماڵ و کەرامەتت پارێزراو ئەبێ، هەر وەک ئیمامی عومەر (ڕەزای الله تعالی لێبێت) فەرمووی: **(نحن قوم اعزنا الله بالإسلام )** واتە: ئێمە قەومێکین الله بە ئیسلام بەعیزەتی کردووین.

**پرسیار:** ئیسلام بۆ پاراستنی چی هاتووه؟

**وەڵام:** ئیسلام بۆ پاراستنی پێنج شت هاتووه، لەوانه:

١- بۆ پاراستنی ئاین: اللهتعالی دەیەوێت پیاوی ئیسلام زۆر بکات و نایەوێت موسڵمان زەلیلی دەستی ئاینانی تر بن، هەروەها ڕێ نادان وڵاتی موسڵمان نشین حوکم به شەریعەتی و یاسای غەیری ئیسلام بکەن و مەیدان چۆڵ بکەن بۆ بێ بڕوایان تا بەکەیفی خۆیان بێ دینی بڵاو بکەنەوه، چونکه ئەمانه دەبێته هۆی بێ حورمەتکردنی ئاین و بەرنامەی الله و لەبەر چاوی خەڵک نامۆ و بێ نرخ دەبێ، هەر وەک الله دەفەرموێت: **(هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ)**الصف٩ واته: هەر ئەو خوایه پێغەمبەرەکەی خۆی ڕەوانه کردووه هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنموویی و ئاینی حەق و ڕاستیدا، تا سەری بخات بەسەر هەموو ئاین و بەرنامەکاندا، هەرچەندە موشریك و هاوەڵگەڕان پێیان ناخۆش بێت.

٢- بۆ پاراستنی ژیری (العقل) هەرچی یاسا و ڕێسای دەستکرد هەیه نەک لەبەرژەوەندی عقل نین بەڵکو گشتیان وەسیلەیان تێکدانی عقلی مرۆڤه.

ئیسلام پێت ئەڵێ عەرەق مەخۆ چونکه عەقلت تێک دەدات، پێت ئەڵێ جگەر مەکێشه چونکه عەقل و ژیری لاواز دەکا، ئیسلامه دەڵێ با پیاو و ژن تێکەڵ نەبن چونکه مێشکی ئینسان تەرت و وێران دەکا، هەروەک الله تعالی دەفەرموێت: **(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ)**النساء٤٣

واته :ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوه نزیکی نوێژ مەکەون لەکاتێکدا ئێوه سەرخۆشن .تاکو دەزانن چی دەڵێن

٣- بۆ پاراستنی ماڵ و دارایی: ئیسلام ڕێ نادات ماڵ و دارایی بەتەنها له گیرفانی هەندێک خڕ بێتەوه هەندێک لەسەریان بڕژێت و هەندێکیش لەبەریان ببڕێت، ئیسلام هاتووه تاکو خەڵک هەست به چینایەتی و بەرزی و نزمی نەکەن له کۆمەڵگادا، ئەویش بەوه دەبێ لەو ماڵەی هەیانه سەرفی بکەن بۆ ئاوانەی که نییانه، هەروەک الله تعالی دەفەرموێت: **(وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ)**النور٣٣ واته: پێیان ببەخشن لەو ماڵەی الله تعالی پێی داون.

هەروەها دەفەرموێت: **(وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ )** البقرة ١٨٨ واته: نەکەن ماڵ و دارایی یەکتر له نێوانتاندا به ناحەق بخۆن (وەك بەرتیل و سوو، یان داگیرکردن و فڕوفێڵ) نەکەن هەندێکی بدەن بەکاربەدەستان بۆ ئەوەی هەندێك ماڵی خەڵکی بخۆن له ڕێگەی ناحەق و گوناهەوه، له کاتێکدا خۆشتان دەزانن که ئەو کاره ڕەوا نیه .

٤- بۆ پاراستنی گیان: ئیسلام هاتووه مرۆڤ بکات به جێنشینی ئەو دروستکراوانەی پێش خۆی به جێ بەجێ کردنی فرمانی الله تعالی و ئاوەدان کردنەوەی زەوی به خواپەرستی و برایەتی و ئاشتی نێوان بڕواداران، هەر وەک الله تعالی دەفەرموێت: **(وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ)** الإسراء٧٠ واته: سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمه ڕێزمان له نەوەی ئادەم گرتووه.

وه ڕێزی لێناوا و هەڕەشەی کردوه لەوەی خوێنی کەسێک به ناحەق بڕژێت وەک دەفەرموێت: **(مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا)** ٣٢ المائدة واته: لەبەر ئەوەی کارەساتی کوشتنی ناڕەوای ئاوا ڕوو نەدات ئێمه پێویستمان کرد لەسەر نەوەی ئیسرائیل ئەوەی کەسێک بەناحەق بکوژێت و له جیاتی کوژراوێک نەبێت، یان گوناهو تاوانی گەورەی ئەنجام نەدابێت لەزەویدا (وەکوجەردەیی و دەستدرێژی و ...هتد) ئەوه وەک ئەوە وایه هەر هەموو خەڵکی کوشتبێت، ئەوەش کەسێک له مەرگ ڕزگار بکات، هەروەک ئەوە وایه هەموو خەڵکی له مەرگ ڕزگار کردبێت و ژیانی پێ بەخشی بن.

**پرسیار:** پایەکانی ئیسلام(أركان الإسلام) چەندن؟

**وەڵام:** پایەکانی ئیسلام پێنجن وەک پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **( الْإِسْلَامُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَتُقِيمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلًا )** رواه مسلم.

واته: ئیسلام ئەوەیه شایەتی بدەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییه جگه له الله تعالی وه محمدﷺ نێردرای ئەوە وه نوێژ بەرپا بکەی و زەکات بدەی و ڕۆژوو بگریت و ئەگەر توانات هەبوو حەجی ماڵەکەی بکەیت.

**پرسیار:** شایەدمانی (لا اله الا الله محمد رسول الله) چییە؟

**وەڵام:** شاتیدانه بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییه جگه له الله تعالی محمد یشﷺ نێردراوی ئەوە..

ئەمەش دەبێ له دڵ دابمەزرێت به زمانیش دانی پێدابنرێت و به ڕەفتاریش جێ بەجێ بکرێت.

**پرسیار:** مەرجەکانی هاتنە ناو ئیسلام چین؟

**وەڵام:** مەرجەکان بریتیە لە وتنی هەردوو شایەتیەکە هەر وەک پێغەمبەرﷺ فەرموی: **(أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، لَا يَلْقَى اللَّهَ بِهِمَا عَبْدٌ غَيْرَ شَاكٍّ فِيهِمَا إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ )**رواه مسلم

واتە: شایەتی ئەدەم جگە لە الله کەس شایستەی پەرستن نییە و منیش نێردرای ئەوم، هەر کەس ئەم دوو شایەتیە بدات و گومانی لێ نەبێت ئەچێتە بەهەشت.

**پرسیار:** ئایا بە دانپێدانان(الإقرار) ی یەک بەشی شایەتی دەبێتە موسڵمان؟

**وەڵام:** نەخێر چونکە لەکاتی خۆی هەر کەس بهاتایەتە نێو ئیسلام ئەبوو ئەم دوو شایەتیە بڵێ، هەروەک پێغەمبەرﷺ بە کەنیزەکێکی گوت: **(أَيْنَ اللَّهُ ؟ ." قَالَتْ :فِي السَّمَاءِ .قَالَ " :مَنْ أَنَا ؟ ." قَالَتْ :أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ . قَالَ " :أَعْتِقْهَا ؛ فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ)**

واتە: پرسی الله لە کوێیە؟

گوتی: لە ئاسمان

پرسی من کێم؟

گوتی: نێردراوی الله

فەرموی: ئازادی بکە ئەو موسڵمانە.

واتە شایەتی لاالەالاالله و محمد رسول الله دەبێ دان بەهەردووک بنرێ نەک بەتەنها بە لاالەالاالله و بەڵام دان بە محمد رسول الله نەنێت ئەوە ئیمانت نەهێناوە و تۆ ئیماندارنیت بۆیە دەبێ دان بەهەردووک بنێرێت..

**پرسیار:** ئەو کەسەی دوای تاقم و ڕێبازێکی جاهیلی کەوتوە، ئایا بەتەنها شایەتی هێنانێک بەسە بۆ موسڵمان بونی؟

**وەڵام:** مەرجی هاتنە نێو ئیسلام ئەوەیە، کە دەبێت سەرەتا بەرگی جاهیلی لەخۆیان دابماڵن و سڵ بکەنەوە و لە ژیانی تاغوتی قێز بکەنەوە واز لە ڕێبازی جاهیلی بهێنن، ئینجا بێنە نێو ئیسلام، هەروەک الله دەفەرموێت: **(فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا)** البقرة٢٥٦ واتە: هەر کەس بێ باوەڕ بێت بە هەر شتێک کە ئەپەرستێت لە غەیری الله و بڕوا بهێنێت بە الله ئەوا دەستی گرتوە بە پەتێکی

زۆر بە هێز کە پچڕانی نییە(کە بریتییە لە یەکخوا پەرستی التوحید) کەواتە تا واز نەهێنێت لە ڕێبازی بێ باوەڕی، ئیمان لە دڵ ناچەسپێت.

چونکە کەسێک بڕوا بهێنێت بە الله بەڵام کوفر بە طاغوت نەکات، وەک ئەوەیە دان بنێت بە لا الە الا الله بەڵام بڵێ لە لە فلان شوێن خوایەکی تریش هەیە.

بۆیە دەبێ خۆمان بەری بکەین لە هەموو تاقم گروپ و ڕێبازێک جگە ڕێبازی ئیسلام و لاالەالاالله ئەوکات موسڵمانی ڕاستەقینەی ڕێبازی پێغەمبەرینﷺ

**پرسیار:** چۆن دەتوانین دان (إقرار) بەم شایەدیانە بنێین؟

**وەڵام:** داننان بە لا الە الا الله بەوە دەبێ خۆت بۆ ئەم وشە یەکلای بکەیتەوە، وە داننان بە محمد رسول الله بەوە دەبێ هەرچی ئەو هێنای وەری بگریت و بەدوای بکەویت.

**پرسیار:** گرنگی ئەم شایەدییە چییە؟

**وەڵام:** شایەتی بۆ نوێکردنەوەی بەڵێن و پەیمانە لەگەڵ الله لەسەر ئەساسی باوەڕبوون بە تاک و تەنهایی لەڕێگەی کارکردن بە شەریعەتەکەی و شوێنکەوتنی پەیامبەرەکەی کە محمد ە.ﷺ

**پرسیار:** نوێژ (الصلاة) گرنگی چییە؟

**وەڵام:** نوێژ بریتییە لە خواپەرستیەکی ڕاستەقینە لە ڕێگەی کردارەوە، گرنگی ئەم نوێژەش بریتیە :لە ڕۆشنکردنەوەی دڵ و چاوساغ بونەوە و دورکەوتنەوە لە تاوان و سەرپێچی، جگە لەوەی دووبارە بەستنەوەی پەیوەندیە لەگەڵ الله تعالی.

**پرسیار:** زەکات چییە و گرنگی چییە؟

**وەڵام:** زەکات بریتیە لە خوا پەرستی لە ڕێگەی سەرف کردنی ماڵ و دارایی، گرنگی زەکاتیش بریتییە لە پاککردنەووی دەرون لە چاوچنۆکی وە پێکهێنانی ئاتاج بۆ هەژاران.

**پرسیار:** ڕۆژوو (الصوم) چییە و گرنگی چییە؟

**وەڵام:** بریتییە لە خواپەرستیەک لە ڕێگەی خۆ گرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە لە ڕۆژانی ڕەمەزان، سوود و گرنگی ڕۆژو بۆ لە خواترسان و حەسانەوەی جەستە و هەستکردن به ژیانی هەژاران.

**پرسیار:** حەج چییە و گرنگی چییە؟

**وەڵام:** بریتییە لە خواپەرستیەک ک بەنیەتی (بيت الحرام) بەرزکردنەوای دروشم ئەنجام ئەدرێ، گرنگی حەجیش بریتیە لە دەستەمۆ کردن (ترويض)ی دەروون لە توانای سەرفکردنی ماڵ و سامان و جەستە لە پێناوی الله تعالى، بۆیە حەج کردن جۆرێکی جیهادکردنە لە پێناوی الله و یەکبونی موسڵمان دەردەخات.

**پرسیار:** دژەکانی ئیسلام (نواقض الإسلام) چین؟ یان بەچی شایەدمانەکەی هەڵدەوەشێتەوە؟

**وەڵام:** مەرجەکانی ئیسلام بریتییە لە بەڕاست دانان لە دڵ دانپێدانان به زمان و سەلماندنی هەردوو شایەتیەکە.

زۆر لە خەڵکی بڕوایان وایە هەر گوتیان **(أشهد أن لا اله الا الله و أشهد أن محمد رسول الله)** یەکسەر بەری خۆیان لە ئاوی دەرهێناوە و بەهەشت مسۆگەر ئەکەن، بەڵام نازانن زۆر شت هەن ئەگەر ئەنجامی بدەن پێ ی لە ئیسلام دەشۆرێتەوە و شایەدمانەکەیان هەڵدەوەشێتەوە، هەندێک لەو خاڵانەی ڕێخۆشکەرن بۆ لە ئیسلام دەرچوون و کافر بوون بریتین لە:

١- کارکردن بۆ غەیری الله تعالى (شەریک ئەنجامدان) بەنی ئادەم بۆیە دروستکراوە بۆ الله تعالى نەبێ بۆ هیچ کەسێکی تر عیبادەت ئەنجام نەدات و ملکەچی نەنوێنێت، گەر وانەبوو ئەوا لە ئیسلام دەردەچێت پەیوەندی پێوە نامێنێت، الله تعالى دەفەرموێت: **(قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ)**الانعام١٦٢

واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ ئەی ئیماندار بڵێ: بەڕاستی نوێژو حەج و دروشمەکانی و سەرجەم چاکە و بەندایەتیم هەروەها ژیان و مردنم تایبەتە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانەوە.

**(لَا شَرِيكَ لَهُۥ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَ أَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ)**الانعام١٦٣

واتە: ئەو زاتە هیچ هاوەڵ و هاوبەش و شەریکێکی نیە و من بەوە فەرمانم پێدراوە و من یەکەم کەسی موسڵمانانم.

هەروەها دەفەرموێ: **(وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ)** الزمر٦٥ واتە: سوێند بەخوا بادڵنیابن کە وەحی و نیگا نێردراوە بۆ تۆو بۆ ئەوانەی پێش تۆش :ئەگەر هاوەڵگەر بیت و شەریک بۆ الله بڕیار بدەیت کاروکردەوە چاکەکانیشت پووچە و دەچیتە ڕیزی خەسارەتمەند و زەرەرمەندانەوە .

دووبارە دەفەرموێت: **(وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ)** الأنعام٨٨ واتە: خۆ ئەگەر شەریک و هاوبەش بڕیار بدەن، ئەوە هەرچی کارو کردەوەیەکی) چاکیشیان (هەیە هەمووی پووچ و بێ نرخ دەبێت.

٢- پشتبەستن بە غەیری الله تعالی: الله دەفەرموێت: **(وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ)** المائدة٢٣ واتە: بە تە واوی پشت بە خوا ببەستن ئەگەر ئێوە ئیماندارن .

٣- زەوتکردنی مافی الله تعالی: مافی الله تعالی لەسەر بەندەکانی ئەوەیە بیپەرستن و هیچ شەریکێکی بۆ بڕیار نەدەن نە لە عیبادەتکردن لە لە حوکمڕانی وەرگتنی حەرام و حەڵاڵ لە غیری الله، مادام الله تعالی بە دیهێنەر و ژێنەر و مرێنەرە بەهەمان شێوە هەر ئەویش حوکمڕان و یاسا و ڕێسا دانەرە، هەروەک الله دەفەرموێت: **(وَللهِ الأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ)** واتە: هەر بۆ الله فەرماندان لە پێشەوە و لەماودوایش، هەروەها دەفەرموێت: **(فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ)** النساء٦٥

واتە: نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی) لاڤی بڕوا لێدەدەن (بڕوا ناهێنن هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدا لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن.

هەروەها دەفەرموێت: **( إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔوا۟ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّوا۟ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ زُيِّنَ لَهُمْ سُوٓءُ أَعْمَٰلِهِمْ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ )** التوبة٣٧

واتە: بەڕاستی دواخستن و دەستکاری کردنی ئەو مانگانەی کە جەنگ تیایاندا حەرامە، بۆ کاتێکی تر؛ سەرکە شی و ڕۆچونێکی زیاترە لە کوفرو خوانەناسیدا، ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون پێی گومڕا دەکرێن، ساڵێک ئەو دە ستکاریە بەحەڵاڵ دادەنێن و ساڵێکیش بەحەرام، بۆ ئەوەی ئەو مانگانە ڕێک بکەون لەگەڵ ژمارەی ئەو مانگانەی کە خوا حەرامی کردوون، بەم جۆرە ئەوەی خوا حەرامی کردبوو حەڵاڵیان دەکرد، ئەوانە کردارە ناپەسەندەکانی خۆیان لا جوان کرابوو، خوایش هیدایەت و ڕێنموویی هۆزی بێ باوەڕان ناکات.

٤- گوێڕایەڵی بۆ غەیری الله تعالی: ئەمەش دەبێتە دەرچون لە ئیسلام بە هۆی ملکەچی و گوێڕایەڵی بۆ غەیری الله، هەروەک الله دەفەرموێت: **( يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ)**آل عمران١٤٩ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ملکەچ و گوێڕایەڵی ئەوانە بن کە کافر و بێ دینن، ئەوە بەرەودوا دەتانگێڕنەوە و پاشگەزتان دەکەنەوە و لە دین وەرتاندەگێڕن، ئەوسا ئیتر بە دۆڕاوی دە گەڕێنەوە.

٥- ڕقبونەوە لە حوکمەکانی ئیسلا: جیاوازی نییە دانەیەک بێت یان هەمووی بۆ نمونە بڵێ: نەدەبو الله وای کردبا!، یان دەبوو وای کردبا!، یان ڕقت لە ئایەتێک بێت چونکە لەگەڵ بەرژەوەندیت ناگونجێت...، چونکە ئەمە پێشەی بێ باوەڕانە، هەروەک الله دەفەرموێت: **( وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ)**محمد٨

واتە: ئەوانەش بێ بڕوا بوون خەجاڵەتی و سەرشۆڕیان بۆ هەیە کاروکردەوەشیان لەدنیادا بێ ئاکامەو لە قیامەتیشدا مایە پووچن .

**(ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ)**محمد٩ واتە: ئائەوەبەهۆی ئەوەوەیە بێگومان ئەوان ڕقیان لە قورئان بۆتەوە و حەزیان لەبەرنامەی خوا نەبووە، جا خوایش کارو کردەوەکانی پووچ کردنەوە.

٦- خۆشویستنی دوونیا و ڕقلێبونی ئاخیرەت: زۆر زانا دەڵێن هەر کەس ئاخیرەت بفرۆشێت و دونیای پێ بکڕێت ئەوا لە ئیسلام دەردەچێت، هەروەک الله دەفەرموێت: **(وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ)** إبراهيم٢

واتە: هاوار و ئاهو ناڵە بۆ ئەو کەسانەی کە بێ باوەڕن لە سزایەکی زۆر توندو تیژ....

**(ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ)** إبراهيم٣ واتە: ئەوانەی کە ژیانی دنیایان لە بە نرخترو خۆشە ویستره لە ژیانی جیهانی دوایی.

٧- گاڵتەکردن بە شتێک لە قورئان و سوونەت: بۆ نمونە گاڵتە بکەی ڕیش و عەبا و قورئانخوێندن و سیواک، هەروەک الله دەفەرموێت: **(وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ)**التوبة٦٥ واتە: کاتێک تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ لەگوفتاری نابەجێیان ئاگادار دەبیت (و لێیان دەپرسیت) ئەوە خەریکی چین؟! ئەوە بێگومان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە تەنها دەمەتەقێ و گەمەو گاڵتەمان دەکرد، پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بە الله پاشان ئایەت و فەرمانەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد؟!

**(لَا تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ)** التوبة٦٦ واتە: ئیتر بێ سوودە پاکانە مەکەن، چونکە بەڕاستی ئێوە بێ باوەڕ بوون دوای ئەوەی لە ڕواڵەتدا باوەڕتان هێنابوو ئەگەر.

٨- بێ ئەدەبی نواندن بەرامبەر پێغەمبەرﷺو ئاکار و سونەتەکانی: بەهیچ جۆرێک ڕێگا نادرێت کەسێک فرمانی پێغەمبەری پێ بگات وەلای بنێت و شوێن ویستی خۆی یان کەسانی تر بکەوێت، هەروەک الله دەفەرموێت: **( يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ )** الحجرات١

ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە پێشی خواو پێغەمبەری خوا مەکەون لەبڕیار و پێشنیاردا .

هەروەها دەفەرموێت: **(وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ)** الأحزاب٣٦ واتە: هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار، نیە کاتێک کە الله پاشان پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێک بدەن ئەوان سەرپشک بن) لە ئەنجامدانی ئەو کارە .

٩- تێکچون و بێز کردنەوە کاتێک باسی تاک تەنهایی الله تعالی دەکرێت: واتە کاتێک باسی ئیسلام و ئایەتەکانی قورئان و موسڵمانان ئەکرێت، توشی ژانە سەر ببیت نێوچاوانت گرژ بکەی، هەروەک الله دەفەرموێت: **(وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ)** الزمر٤٥ واتە: کاتێکیش تەنها ناوی خوا برا، ئەوانەی کە باوەڕیان بەقیامەت و ڕۆژی دوایی نیە دڵیان دەگیرێت و بێزاری دایان دەگرێت، بەڵام کاتێکیش باسی شتی تر بکرێت جگە لە خوا، دەستبەجێ دڵخۆش و کەیف خۆش دەبن و حەزی پێدەکەن.

١٠- وەرنەگرتنی ئیسلام بەتەواوی و بڕوابوون بە هەندێکی و ڕەتکردنەوەی هەندێک دەقی قورئان و سونەتتەکانی پێغەمبەر :هەروەک الله دەفەرموێت: **(أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ)** البقرة٨٥ واتە: کەوابوو چۆن دەبێت باوەڕتان بە بەشێکی (تەورات) هەبێت و بەشێکی تری باوەڕتان نە بێت؟ ئایا پاداشتی ئەوەتان کە ئەوکارە دەکات جگە لەسەر شۆڕیی و سووکی نەبێت لە ژیانی دنیادا هیچی تر هەیە؟ لە ڕۆژی قیامەتیشدا دەگەڕێنرێنەوە بۆ ناو سەختترین سزا، خوایش بێ ئاگانیە لەو کارانەی کە ئێوە ئە نجامی دەدەن

پێغەمبەر دەفەرموێت: (من كذب على نبيه او على عينه او على والديه لم يريح رائحة الجنة )رواه طبراني
واتە: هەر کەس درۆ بدەم پێغەمبەرەکەیەوە یان چاوی یان دایک و باوکی بکات بۆنی بەهەشت ناکات.

١١- نکوڵی کردن لە صیفەتێک لە صیفەتەکانی الله تعالى یان ناوێک لە ناوەکانی: (فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ)آل عمران٨ واتە: جا ئەوانەی کە لە دڵیاندا لاری و لادان هەیە، حەز لە حەق و ڕاستی ناکەن، ئەوانە شوێنی ئەو ئایەتانە دەکەون کە مانای جۆراو جۆر و فراوانیان هەیە، بۆ ئەوەی فیتنە و ئاشوب و ناکۆکی و دووبەرەکی دروست بکەن، یان بۆ ئەوەی لێکدانەوەی هەڵەی بۆ هەڵبەستن، لە حاڵێکدا کە لێکدانەوەی ئەو جۆرە ئایەتانە هەر الله تعالى خۆی بە تەواوی دەیزانێت، جا ئەو کەسانەی کەلە زانستدا ڕۆچوون دەڵێن: ئێمە باوەڕی دامەزراومان بەهەر هەموو (ئەو ئایەتانە)هەیە کە لە لایەن پەروەردگارمانەوەیە و فەرمایشی ئەوە، لەڕاستیدا بێجگە لە خاوەن بیر و ژیرەکان یاداوەری وەرناگرن و بیرناکەنەوە لەم قورئانە.

هەروەها دەفەرموێت: ( وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا) الأعراف ١٨٠. واتە: هەر بۆ خوایە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکان، جا (ئەی ئیمانداران) بەو ناوانە دوعا و نزا بکەن و هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە بەرن.

١٢- نەناسینی پێغەمبەرﷺ بە ناسینێکی چاک، یان ڕازی نەبیت بە پێشەوایەتی ئەو: الله تعالى دەفەرموێت: (لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا)الأحزاب٢١
واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی لەپێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو ڕێك پێك هەیەتا چوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، هە میشە و بەردەوام یادی خوا بە زۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو چونکە شوێنکەوتی پێغەمبەرﷺ مایەی خۆشەویستی و ڕەزامەندی الله یە، هەرکەس پێغەمبەرﷺ نەکات بەسەر قافڵە مافی ئەوەی نییە داوای ڕەزامەندی الله بکا خۆی لای الله خۆشەویست بکا، بەڵکو خۆی دەبوغزێنێت و ڕوڕەشی دوونیا و قیامەت دەبێ، هەروەک الله دەفەرموێت: (قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ)آل عمران٣١ واتە: ئەی پێغەمبەرﷺبە ئیمانداران بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت دە شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەوکاتە خوایش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناهو هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت، ئەو خوایە لێخۆشبوو و میهرەبانە .

**(قُلْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ )**آل عمران٣٢ واته: دووباره پێیان بڵێ: فەرمانبەرداری الله تعالی پاشان پێغەمبەر ﷺبن، خۆ ئەگەر سەپێچی بکەن و پشتی تێبکەن ئەوه دڵنیابن خوا بێ باوەڕانی خۆش ناوێت .

١٣- تەکفیرکردنی ئەهلی ئیمان و تەکفیرنەکردی ئەهلی کوفر: یاسایەکی شەرعی هەیە دەڵێ: **(من كفر مؤمنا فقد كفر، ومن لم يكفر الكافرين فقد كفر، ومن شك في كفر الكافرين فقد كفر)** واته:ئەوەی بڕوادارێک بە کافر بزانێت کافره، ئەەشی کافرێک بە کافر نەزانێت کافره، ئەوەشی گومانی لە کافرێتی کافران هەبێ کافره. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: **(لَا يَرْمِي رَجُلٌ رَجُلًا بِالْفُسُوقِ وَلَا يَرْمِيهِ بِالْكُفْرِ، إِلَّا ارْتَدَّتْ عَلَيْهِ، إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُهُ كَذَلِكَ)** واته: هەرکەسێک پیاوێک (یان ئافرەت) بە کافر یان فاسق بزانێت لەکاتێک وانییه ئەوا کوفر و فسق ەکە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، هەروەها دەفەرموێت: **(أخوف ما أخاف على أمتي ثلاثة :رجل قرأ كتاب الله إذا رست عليه بهجته وكان عليه رده الإسلام إخترط سيفه وضربت به جاره ورماه بالشرك، قيل يا رسول الله الرامي احق به أم المرمي ؟ قال:الرامي)** رواه الطبراني واته: لە هەموو شت زیاتر لەسەر ئومەتم لێ بترسم سێ شتە، یەکیان پیاوێکە قورئانی خوێندبێت و خۆشەیستی ئیسلام لە دڵی چەسپیبێت پاشان دەبێ بە چاکی پاڵپشتی ئیسلام بکا بەڵام شمشێر لە کالان هەڵدەکێشێت و دەستدەکان بە پشتیوانان و خەمخۆرانی ئیسلام تۆمەتی کوفریان دەداتە پاڵ، گوتیان ئەی پێغەمبەری خواﷺ کامیان شایستەترن بە کوفر تۆمەتکەرەکە یان تۆمەت پێکراو؟ فەرموی: تۆمەتکەرەکە...

واته: کەسی واهەیە خۆی زۆر بە موسڵمان دەزانێت و قورئانیشی لەبەرە و بەڵام بە ناحەق خەڵک بە کافر دەزانێت، کەچی نازانێت بۆ خۆی دەگەڕێتەوە...

هەروەها بە کافر نەزانینی کافران و موشریکانیش کوفره هەروەک الله دەفەرموێت: **(وقال عزّ من قال أيضاً: (لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَهٍ إِلَّا إِلَهٌ وَاحِدٌ وَإِنْ لَمْ يَنْتَهُوا عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ)**. المائدة٧٣ واته: بەڕاستی کافربوون ئەوانەی گوتیان: خوایەکێکه لە سێ (واته الله و عیسا و دایکی) نەخێر هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییه تەنیا یەک پەرستراو نەبێ وە ئەگەر واز نەهێن لەوەی کە ئەیڵێن ئەوا کافران ئازارێکی زۆر سەخت ئەچێژن.

وە دەفەرمووێ: **(لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ)**المائدة٠(١٧) واته: بەڕاستی کافربوون ئەوانەی گوتیان: خوا هەر مەسیحی کوڕی مەریەمه.

**پرسیار:** پێغەمبەر محمدﷺ کێیە؟ کە بریتییە لە بنچینەی سێیەم؟

**وەڵام:** ناوی محمد کوڕی عبداللە کوڕی عبدالمطلب کوڕی هاشم لە هۆزی قورەیشە کە قورەیشیش لە عەرەبە و عەربیش ئەچێتەوە سەر نەوەی إبراهيم و إسماعيل عليهم السلام، ساڵی ٥٧١زاینی لە ڕۆژی دووشەممەی مانگی ربيع الأول لەدایک بووە.

هەروەها٦٣ساڵ ژیاوە ٤٠ساڵ پێش پێغەمبەرایەتی و ٢٣ساڵ دوای پێغەمبەرایەتی.

یەکەم سورەت کە موژدەی پێغەمبەرایەتی پێدرا إقرأ بوو و دەساڵ بانگەوازی کرد لە مەککە دوای سێ ساڵی نهێنی، داوای یەکخواپەرستی و تەرکی شرکی ئەکرد، لە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان و پێنج نوێژە فەرزەکەی پێبەخشرا،١٣ ساڵ لە مەککە مایەوە دواتر کۆچی کرد بۆ مەدینە، کاتێک لە مەدینە جێگیر بوو فەرمانی دا بە جێبەجێ کردنی فەرزەکانی و یاساکانی ئیسلام وەک زەکات و بانگ و حەج و جیهاد و فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە...هتد،

دوای دە ساڵ مانەو لە مەدینە لە١٢ربيع الأول لە ساڵی ١١کۆچی وەفاتی کرد، بەڵام ئاینەکەی هەرمایەوە و هەر دەشمێنێتەوە تا کۆتا زەمان.

**پرسیار:** یەکخواناسی(التوحيد) چییە؟

**وەڵام:** بریتییە لەوەی تەنها اللە تعالی بناسی و پوختەی عیبادەت بۆ اللە بکەیت، ئەویش سی جۆرە:

١- یەکخواناسی لە پەرستراوێتی(التوحيد في الألوهية)

٢- یەکخواناسی لە پەروەردگارێتی (التوحيد في الربوبية)

٣- یەکخواناسی لە ناو و سیفاتەکانی (التوحيد في الأسماء والصفات)

**پرسیار:** یەکخواپەرستی خوایەتی (التوحيد الألوهية) یانی چی؟

**وەڵام:** واتە باوەڕهێنانێکی ڕاستەقینە بەوەی اللە خوایەکی حەقە و هەر ئەو مافی ئەوەی هەیە بپەرسترێت و ملکەچی ببیت و خۆت تەسلیمی بکەی.

**پرسیار:** وشەی الله مانای چییە؟

**وەڵام:** زانایان لە پەیدابوون و تەفسیری ئەم وشە دوو ڕایان هەیە:

یەکەم: هەندێک دەڵێن ئەم وشەیە لە هیچ چاوگ (مصدر)ێکەوە نەهاتوە و ناوی تایبەتی زاتی خۆیەتی.

دووەم: هەندێک دەڵێن لەچاوگێکەوە هاتوە، کە لەسەر چاوگەکەش ڕاجیایی هەیە:

أ- دەڵێن لە **(أَلَهَ)** هاتوە چونکە **(آلَهتُ إلى فُلان)** واتە بەهۆی ئەو ئارامم بۆ هات.

ب- دەڵێن **(أَلَهَ الرجل يَأْلَهُ)**ەوە هاتوە، واتە لە ئاقار بەڵایەکەوە دەستەوسان بون و ڕزگاربون بەهۆی یەکێکی ترەوە.

ج- دەڵێن لە **(آلَهَ الرَّجُلُ إلى رَجُلِ)**ەوە هاتوە، واتە بەهۆی شەوق و خۆشەویستیەوە ڕوی تێکرد.

د- دەڵێن لە **(آلَهَ إلَهَةً وَأُلُهَةً)**ەوە هاتوە، واتە پەرستی و بەندایەتی بۆ کرد.

و- دەڵێن لە **(لاهَ يَليهُ)**ەوە هاتوە، واتە خۆی پەنهان کرد.

ی-هەندێکی تر دەڵێن لە **(الوَلَهُ)**ەوە هاتوە،**(وَلَهْ)**یش واتە سەرسامی و مات و حەیران بوون.

کەواتە الله ئەو زاتەیە پاکەیە:

١- بەنی ئەدەم بەهۆیەوە دڵی ئارام دەبێ **(أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ)** الرعد٢٨

٢- بەنی ئادەم لەکاتی تەنگانە هاناو هاواری بۆ دەبات: **(أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ)**النمل٦٢

٣- بەنی ئادەم لەئەنجامی سۆز و خۆشەویستی ڕووی تێدەکات: **(وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ)** البقرة١٦٥

٤- بەنی ئادەم دەیپەرستێت و بەندایەتی بۆ دەکات: **(إِيَّاكَ نَعْبُدُ)** الفاتحة٥

٥- بەنی ئادەم ئاستی ناسینیدا مەست و حەیران و سەرسام دەبێ ناتوانێت پەی بە زاتی ببات: **( لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ )** الشورى١١

٦- ناتوانێت لە دونیا ببینیت و لەبەر چاوی شاراوەیە: **(لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ )** الأنعام١٠٣

**پرسیار:** چۆن یەکخواناسی لە خوایەتی(التوحيد الألوهية) ئەچەسپێت؟

**وەڵام:** بەوەی دروشمەکانی پەرستن تەنها بۆ ئەو بکەیت، وەک:

١- الله تعالی ت لە هەموو کەس خۆشتربوێت، نابێ هیچ کەسێکت هێندەی ئەو زاتە یان زیاتر خۆش بوێت چونکە ئەگەر واتکرد ئەوا توشی شرک بویت، وەک الله دەفەرموێت: **(وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ )** البقرة١٦٥ واتە: لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانە دا هەندێك کەس هەیە لەجیاتی ئەوەی خواپەرست بێت، شتانی تر دادەتاشێت بۆ خۆی و شوێن ڕێنموویيە کانی خوا ناکەوێت و خۆشەویستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرناملۆکەو توولە ڕێگەیانە و خۆشی دەوێن، وە ك چۆن ئیمانداران خوایان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە زۆر زیاتر خوایان خۆش دەوێت هەر بەراورد ناکرێت.

٢- الله تعالی بەتەنها بزانیت لە پاڕانەوە و هاوارلێکردن، هەرووەک الله دەفەرموێت: **( وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ)**يونس١٠٦ هاناو هاواریش نەبەیت بۆ کەسێک یان شتێک لە جیاتی خوا، کە نە قازانجت پێ دەگەیەنێت نە زیان چونکە قازانج و زیان هەر بەدەست خوایە خۆ ئەگەر کاری وا ئەنجام بدەیت، ئەوە بەڕاستی تۆ لە ستەمکارانیت .

هەروەها دەفەرموێت: **(وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ)** غافر ٦٠ واتە: ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی :ئێوە هاناو هاوار بۆمن بهێنن؛ ئەوە من دوعاو نزاتان گیرا دەکەم، بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن ولووت بەرزی دەکەن لەئاستی پەرستنی مندا، لەئاییندەدا بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتی یەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

دووبارە دەفەرموێت: **(وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ)**المؤمنون١١٧ ئەو کەسەی خوایەکی تر بڕیار بدات و بیکاتە شەریکی خوا، لە کاتێکدا کە هیچ بەڵگەیە کی بە دەستەوە نیە، ئەوە بە ڕاستی حساب و لێپرسینەوەی لای پەروەردگاریێتی، بێگومان بێ باوەڕو خوا نە ناسان سەرفراز نابن. دیسان دەفەرموێت: **( وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا) الجن١٨**

واتە: دڵنیابن کە مزگەوتەکان تایبەتی خوای گەورەن، دەبێت هەر ئەوەی تێدا بپەرسترێت و ناوی کەسی تر نە کرێتە شەریك و هاوتای ناوی ئەو زاتە.

پێغەمبەریشﷺ دەفەرموێت: **(الدعاء هو العبادة)** واتە: هاناو هاواربردن و داواکردن عیبادەتە.

٣- الله تعالى بەتەنها بزانی لە ترسان لێی، هەروەک دەفەرموێت: ( فَإِيَّىَ فَٱرۡهَبُونِ)النحل٥١ واتە: کەوابوو بیم و ترستان با هەر لە من بێت. هەروەها دەفەرموێت: (فَلَا تَخَافُوهُمۡ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ)آل عمران١٧٥ واتە: بەڵکو هەر لە من بترسن ئەگەر ئیماندارن بێگومان ترسان لە خوا ئاسوودەیی و ئارامیی دەبەخشێت بە ئیماندار.

٤- هیوا و ئومێد بوونت تەنها ئەبێت بە الله تعالى بێت، هەروەک الله تعالى دەفەرموێت: (فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا )الكهف١١٠ واتە: ئەوەی ئومێدی هەیە بەدیداری پەروەردگاری شادبێت، بەخۆشنودیەوە با کارو کردەوەی چاک و دروست ئەنجام بدات و بەهیچ شێوەیەک لە پەرستندا هیچ کەسێک نەکاتە هاوەڵ و شەریک بۆی.

٥- پشتبەستن تەنها ئەبێت بە الله تعالى بێت: هەروەک دەفەرموێت: (وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ)المائدة٢٣ واتە: جا بۆ بەدەستهێنانی ئەو سەرکەوتنە دەبێت بە تەواویی پشت بە خوا ببەستن ئەگەر ئێوە ئیماندارن .

هەروەها دەفەرموێت: (وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ) الطلاق٣ واتە: جا ئەوەی پشت بە خوا ببەستێت، ئەو زاتەی بەسە، بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت.

٦- وە دەبێت هیوا و ئومێد و ملکەیت تەنها بە الله تعالى بێت، هەروەک دەفەرموێت: (إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ)الأنبياء٩٠ واتە: چونکە بەڕاستی ئەوانە چالاک و گورجو گۆڵ بوون لە ئەنجامدانی هەموو خێرو چاکەیەکدا و نزای بەکوڵیان دەکرد، بە ئومێدی ڕەحمەت و بەهەشتی ئێمە و لە دۆزەخ و خەشمی ئێمە دەترسانو ئەوانە هەمیشە گەردن کەچ بوون بۆ ئێمە.

٧- وە دەبێت تەنها بۆلای ئەو زاتە بگەڕێیتەوە و خۆتی تەسلیم بکەی، وەک دەفەرموێت: (وَ أَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ)الزمر٥٤ واتە: هەمیشە و بەردەوام دڵتان لای خوابێت بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان و تەسلیمی ئەوبن.

٨- دەبێت داوای یەرمەتی لەو زاتە بکەیت، وەک دەفەرموێت: (وَ إِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ) الفاتحة٥ واتە: هەر لەتۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین (لە کاروباری دین و دنیاماندا، بەکەسی تر لە بەدەکانت ناکرێت هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( إذا إستعنت فاستعين بالله) واتە: ئەگەر داوای یارمەتیت کرد داوا لە الله بکە

٩- دەبێت تەنها پەنا به الله بگریت و ئەو بکەیت به پەناگای خۆت: بەڵگەش وتەی الله تعالی یه لەهەر دوو سورەتی الفلق و الناس، که دەفەرموێت: **(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ)**الفلق١

ئەی محمد ﷺ ئەی ئیماندار بڵێ: پەنا دەگرم بەو پەروەردگارەی که بەرەبەیان پێش دەهێنێت.

**(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ)**الناس١ واته: ئەی محمد ﷺ ئەی ئیماندار بڵێ: پەنا دەگرم به پەروەردگاری خەڵکی.

١٠- وه دەبێت قوربانی هەمو سەربڕاوەکانت تەنها بۆ الله بێت، وەک دەفەرموێت: **(قُلْ إِنَّ صَلَاتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ)**الأنعام١٦٢ واته: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەی ئیماندار بڵێ: بەڕاستی نوێژو حەج و دروشمەکانی و سەرجەم چاکه و بندایەتیم هەروەها ژیان و مردنم تایبەته بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانەوه **(لَا شَرِيكَ لَهُۥ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَ أَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ)**الأنعام١٦٣ ئەو زاته هیچ هاوەڵ و هاوبەش و شەریکێکی نیه و من بەوه فەرمانم پێدراوه و من یەکەم کەسی موسڵمانانم.

پێغەمبەریشﷺدەفەرموێت: **(لعن الله من ذبح لغير الله)** واته: لەعنەتی الله لەو کەسی حەیوان بۆ غەیری الله تعالی سەردەبڕێت.

١١- وه دەبێت نەزریش تەنها بۆ الله بکەی، وەک دەفەرموێت: **(يُوفُونَ بِٱلنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُۥ مُسْتَطِيرًا)**الإنسان٧ واته: ئەو بەختەوەرانە، یەکێك له سیفاتیان ئەوەیه: وەفا بەنەزر دەکەن، یاخود به لێنێکیاندا وەفادارن و ئەنجامی دەدەن و بیمیان هەیه له ڕۆژێك که شەڕی لێ دەبارێت و پرشو بڵاوه.

**پرسیار:** یەکخواناسی له پەروەردگارێتی(التوحيد في الربوبية) واتا چی؟

**وەڵام:** واته باوەڕهێنانێکی ڕاستەقینه بەوەی تەنها الله بەدیهێنەر پێ گەیەنەر و بەخێوکەر و کاروبار بەڕێوەبەری گەردوونه، غەیری ئەو هیچ کەسێکی تر توانای نییه، واته الله تعالی بەیەک زانین لەڕێگەی ئەوەی که خوای پەروەردگار بەتەنها بۆ خۆی (خالق، رازق، مالك، محي، مميت، ضار، نافع، مدبيرالامر)ه .واته: الله تعالی به دیهێنەر و ڕۆزیدەر خاوەن و ژێنەر و مرێنه زیان گەیەنەر و سوود گەیەنەر و کاروبار بەڕێوەبەره.

**پرسیار:** وشەی (رب) مانای چییه؟

**وەڵام:** وشەی (رب) لە بنچینەدا بە مانای (التربیة) دێت، واته پەروەردە.

هەندێک جاریش بە مانای (هەڵسوڕاندن و چاککردن و تەواوکردن) دێت، بنچینەی وشەی (التربیة [لە] ربوة) وە هاتوه، واتە (تەپۆلکە) بۆیەش الله ئەم وشەی بەکارهێناوە تاکو خەڵکی لەوەرگرتنی ئەم دینە کام شتە هەوراز و ناخۆشی زیاترە ئەو شتە جێبەجێ بکەن، چونکە هەرکەسێک ئامادەبێت فەرمانە قورسەکانی ئیسلام جێبەجێ بکات ئامادەشە ئاسانەکان ڕاپەڕێنێت.

**پرسیار:** لە قورئان وشەی (رب) بەچەند مانا هاتووە؟

**وەڵام:** بە پێنج مانا هاتوه:

١- چاودێری بە پێکهێنانی پێویستیەکان و هەڵسان بە پەروەردەکردن و پێگەیاندن: هەروەک الله تعالى لەسەر زمانی یوسف پێغەمبەر(علیه السلام) دەفەرموێت: **(قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَ)**يوسف٢٣

واتە: پانا دەگرم بە الله کاری واناکەم، چونکە پەروەردگارم دەرووی لێ کردوومەتەوە: هەروەها مێردەکەشت چاك ڕەفتار بووە لەگەڵمدا (چۆن خیانەتی لێ دەکەم)

٢- چاودێری بەسەرچاککردنی حاڵی خەڵکی: هەروەک دەفەرموێت: **(فَإِنَّهُمۡ عَدُوّٞ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ)**

بێگومان هەموو ئەوانە دوژمنی منن، بە دوژمنی خۆمیان دەزانم جگە لە پەروەردگاری جیهانەکان...

**(ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهۡدِينِ)** ئەوەی دروستی کردووم هەر ئەو ڕێنموییم دەکات بۆ بەختەوەری هەردوو جیهان.

**(وَٱلَّذِي هُوَ يُطۡعِمُنِي وَيَسۡقِينِ)** ئەو زاتەش خۆی خۆراکم پێ دەبەخشێت و تینوێتیم دەشکێنێت...

**(وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ)** الشعراء ٨٠ تا ٧٧ کاتێکیش کە نەخۆش دەکەوم، ئەوە هەر ئەو چارەسەرم دەکات و شیفام بۆ دەنێرێت...

٣- بەمانای سەرکردە دێت کە خەڵکی لەدەوری کۆدەبنەوە و کارەکان دەچێتەوە بەردەستی ئە، هەروەک دەفەرموێت: **( قُلۡ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَا رَبُّنَا)**سبأ٢٧ واتە: پێیان بڵێ: ڕۆژێك دێت پەروەردگارمان هەموو لایەکمان کۆدە کاتەوە.

**(ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ)**الزمر٧ واتە: پاشان گەرانەوەتان بۆ لای پەروەردگارتانە

٤- بەمانای خاوەن دەسەڵات دێت، هەروەک دەفەرموێت: **(ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ)**التوبة٣١ واتە: گاورو جوو و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خوا ملکەچ و فەرمانبەرداریانن.

٥- بەمانای خاوەن دێت، هەروەک دەفەرموێت: **( فَلْيَعْبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ)** کەواتە با پەروەردگارو خاوەنی ئەم ماڵە پیرۆزە(کەعبە) بپەرستن.

**(ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ)** القریش٣-٤ ئەو زاتەی لەبرسێتی ڕزگاری کردن و خۆراکی پێبەخشین و لە ترس و بیمی (جەردە و ڕێگران) پاراستوونی و ئاسایشی بۆ دابین کردوون.

**پرسیار:** ئایا موشریکانی قورەیش بڕوایان بە بوونی الله هەبوو؟

**وەڵام:** بەڵێ بەپێی ئەم بەڵگانە:

أ- الله تعالی دەفەرموێت: **(قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ، سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ، قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ، سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ، قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ، سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ)** المؤمنون٨٤-٨٩

واتە: تۆش پێیان بڵێ :باشە زەوی و ئەو کەسانەی کە لەسەری دەژین کێ خاوەنیانە، ئەگەر زیرەك و هۆشیارن؟ ئەگەر شت دەزانن؟! سەرئەنجام هەر دان بە ڕاستیدا دەنێن و دەڵێن :هەرخوا، خاوەنیانە، هەر پەروەردگار بەدیهێنەریانە .ئەوسا پێیان بڵێ :جا ئەوە بۆچی یاداوەری وەرناگرن؟

پێیان بڵێ؛ ئەی کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکەیەو کێ پەروەردگاری عەرش و تەختی فەرمانڕەوایی گەورەو فراوانە؟ ئاسمانەکان و زەوی لە بەرامبەر عەرشی پەروەردگاردا، وەکو ئەڵقەیەکی پەنجە وایە لە پاڵ چیایەکی گەورەدا.

سەرەنجام دەڵێن: هەر خوا پەروەردگاریانە، ئەوسا بڵێ: باشە ئاخر ئێوە لێی ناترسن؟ خۆتان ناپارێزن لە خەشم و قینی؟ ئاخر ئێوە لە کێ یاخی دەبن؟

هەروەها پێیان بڵێ: کێ جڵەوی هەموو شتێکی بەدەستە، لە کاتێکدا هەر ئەو پەنا بەخشەو کەس ناتوانێت لە سزای ئەو زاتە، کەس پەنا بدات، ئەگەر ئێوە بزانن و شارەزابن. سەرەنجام بۆ ئەمەش دەڵێن: هەموو ئەوانە بە دەست خوایە، تۆش بڵێ :کەواتە چۆن جادووتان لێ دەکرێت؟ کە ئەمە دەزانن.

ب- الله تعالى دەفەرموێت: (قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ)يونس٣١

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: کێ هەیە لەئاسمانەوە بەهۆی تیشکی خۆرو بارانەوە و لەزەویەوە بەهۆی خاك و ئاوو هەواوە ڕزق و ڕۆزیتان بۆ فەراهەم بهێنێت و پێتان ببەخشێت، ئەی کێ هەیەخاوەنی دەزگاکانی بیستن و بینین بێت توانای بیستن و بینینیان پێ ببەخشێت ئەی کێ زیندوو لەمردوو دەردەهێنێت و مردوو لە زیندوو دەردەهێنێت، هەرواها کێیە کەهەموو کارو فرمانەکان جێبەجێ دەکات و گۆڕانکاریان بەسەردا دە هێنێت لەبەرامبەر هەموو ئەو پرسیارانەوە (خەڵکی دەڵێن: الله، خوا) هەموو ئەو کارانەو زیاتریش زۆر بە ئاسانی ئەنجام دەدات لەڕێگەی یاساو بەرنامەیەکەوەکەهەر خۆی دایڕشتووە، کەواتەپێیان بڵێ: ئایا ناترسن لەسەرەنجامی یاخی بوونتان، ئایا ناترسن لەخەشم و قینی اللهە؟!

ج- الله تعالى دەفەرموێت: ( وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ)الزمر٣

واتە: ئەوانەش جگە لەو زاتە کەسانی ترو شتی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان دەڵێن: ئێمە ئەم بت و شتانە ناپە رستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیکمان بخەنەوە.

د- الله تعالى دەفەرموێت: (وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ) يونس١٨ واتە: بێ باوەڕان وخوانەناسان شتێک دەپەرستن لەجیاتی خوا نە زیانیان پێدەگەیەنێت نە قازانج، دەشڵێن: ئا ئەو بت و شتانە تکا کارمانن لای الله تعالى.

**پرسیار:** ئەی ئەگەر بێ باوەڕەکانی مەککە بڕوایان بە پەروەردگاریێتی الله هەبووە بۆچی پێغەمبەر ﷺ بە کافری حساب ئەکردن و جەنگی لەدژ ئەکردن؟

**وەڵام:** ڕاستە بێ باوەڕان بڕوایان بە پەروەردگاریێتی الله هەبووە، بەڵام لە جیاتی ئەو بپەرستن دار و بەردیان پەرستوە، یان گەورە و دەسەڵاتدارەکانیان دەپەرست، هەروەها کار وپیشەی بەنی ئادەم دەبێت بریتی بێت لە الله پەرستی بە تاک و تەنها، چونکە هەر بۆ ئەوەش بەدیهاتوە، کەواتە ئەگەر ئەمەی نەکرد هەرچی بکات سوودی پێ ناگەیەنێت، چونکە تەنها بڕوابوون بە پەروەردگاریێتی الله ڕزگارت ناکا تاکو دان نەنێیت بەوەی تەنها الله شایستەی پەرەستنە و جێ بە جێ شی نەکەیت.

**پرسیار:** یەکخواپەرستی ناو و سیفاتەکانی الله چییە؟

**وەڵام:** دڵ دامەزران و دانپێداهێنانی تەواوە کە بەس الله سبحانە و تعالی خاوەنی هەموو سیفەتە بەرز و تەواوەکانە لە هەموو هەڵە و پەڵەیەک دوورە، ئیسپاتکردنی ئەمەش بە کردار، وە دەبێ هەموو ناو و سیفەتێک کە الله بۆخۆی دیاری کردبێت یان پێغەمبەر ﷺ دانی پێداهێنابێت لە قورئان و سوونەت هاتبێ، دەبێ بۆ الله بکرێت بەبێ تحریف، واتە نابێ دەسکاری ناوەکانی بکرێ و تعطیل واتە لەکارخستن، و تکیف، چۆنیەتی و تشبیە، واتە :چواندن.

**پرسیار:** یەکخواپەرستی ناو و سیفەتەکان لەسەر چەند بنچینە دادەمەزرێت؟

**وەڵام:** لەسەر سێ بنچینە دادەمەزرێت:

١- پاک ڕاگرتنی الله لە هەموو لەکە و ناتەواوییەک و لە پێچوونی دروستکراوەکانی.

٢- بەڕاست دانان و دانپێداهێنانی هەموو سیفەتە بەرز و بێ وێنەکان کە لە قورئان و سوونەتدا هاتون بەبێ کەم و زیاد و گۆڕین و دەستکاری.

٣- بێ هیوابوون لە پەیبردن بە چۆنیەتی ئەو ناو و سیفەتانە.

**پرسیار:** بەڵگەی ئەم سی بنچینەی ناو و سیفاتانە چین؟

**وەڵام:** بۆ خاڵی یەکەم و سێیەم الله دەفەرموێت: **(وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ)**الإخلاص٤

واتە: هەرگیز هاوتاو هاوشێوە و دەسەڵاتدارێکی تر نییە کە لەبەرامبەریەوە بەوەستێت و هاوشانی بێت.

هەروەها دەفەرموێت: **(لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ)الشورى١١** واتە: هیچ شتێك نیە لە وێنەی ئەوزاتە، هیچ شتێك لەو ناچێت.

بەڵگە بۆ خاڵی دووەمیش الله تعالی دەفەرموێت: **(وهو الغفور الرحيم، يان وهو العلي العظيم يان وهو العلي الحكيم يان الرحمن على العرش استوى)**

**پرسار:** مەبەست چییە نابێت ناو و سیفاتەکان (تحريف و تعطيل و تكيف و تشبيه) بکرێت؟

**وەڵام:**

**تحريف:** واته نابێت دەستکاری ناو و سیفاتەکان بکرێت، بەبێ کەم و زیاد و گۆڕینی سەر (فتحة [و]ضمة [بۆ ناوەکانی واته ئایەتی **(وَكَلَمَ اللهُ تَكْلِميا [بكرێت به] وَكَلَمَ اللهَ تَكلِميا)** هەروەها نابێت جۆرێک تأويل بکرێت کە مانای ئەسڵی نەمێنێت.

**تعطيل:** واته (لەکارخستن) ئەویش بریتیه لەوەی نابێ لابردن ئینکاری کردنی ناو سیفەتەکانی الله بکرێت ئەو تاقمەی (تأويل) ی ناو سیفەتەکانی الله دەکەن (جهمي) یان پێ ئەوترێت.

**تشبيه:** واته (چواندن) ئەویش ئەوەیە نابێ ناو سیفەتەکانی الله بە مەخلوقەکانی بچوێنرێت، وەک دەست و چاو و قاچی الله تعالى وەک هی دروستکراوەکانی سەیر بکرێت.

**تكيف:** واته (چۆنیەتی) ئەیش ئەوەیە نابێت لە چۆنیەتی و حەقیقەت و ناوەڕۆکی ناو و سیفەتەکان بکۆڵیتەوە.

**پرسیار:** سیفەتەکانی الله چەند جۆرن؟

**وەڵام:** دوو جۆرن:

**سیفەتە زاتیەکان:** کە بریتین لە (زانیاری، ژیان، ویستن، توانا، بینین، بیستن، ڕوو، قسەکردن، هەربوویی، هەمیشەیی، مەزنی، بێ نیازی، بەزەیی، کاربەجێیی)

**سیفەتەکاریەکان:** کە بریتین لە (بەرزبوونەوەی سەر عەرش، هاتنەخوارەوە بۆ ئاسمانی دوونیا، پێکەنین، تووڕەبوون، ڕازی بوون، خۆشی، خۆشویستن، ڕق لێ هەڵسان)

**پرسیار:** ئایا چی دەزانی دەربارەی ناوەکانی الله؟

**وەڵام:**

١- (دەبێ باوەڕمان وابێ کە ناوەکانی الله نەبەستراوەتەوە بە (٩٩)ناو، وەک زۆر لە موسوڵمانان وا حاڵی بوون ئەوەش بە پێی ئەم فەرموودەییە: **(آسألك بكُل أسْمٍ هُوَ لَكَ سَمَيْتَ بهِ نَفْسَكَ آوْ أنْزلتَهُ في كِتْابكَ أوْ عَلَمْتَهُ أحَداً مِنْ خَلْقِكَ أوْ اِسْتأثَرْتَ بِهِ في عِلْمِ الغَيْبِ عِنْدكَ)** رواه احمد واتە: داوات لێ دەکەم بە هەموو ناوێک کە هی تۆیە و خۆت پێ ناو ناوە یان لە کتێبەکەت دا ناردووتە خوارەوە، یان فێری بەندەیەکی خۆتت کردووە،یان لە(غیب)لای خۆت هەڵتگرتووە.

ڕەنگە لێرەدا یەکێک بپرسێ و بڵێ ئەوە نییە پێغەمبەر ﷺلە فەرموودەی: **(انَّ الله تسْعة و تسْعينَ آسماً مِآتة الاَّ واحَدة مَنْ أحصاَها دَخَلَ الجَنَةَ)**متفق عليه .ئاماژە بەوە دەکات کە الله (٩٩) ناوی هەیە؟ ئێمە دەڵێین نەخێر بەڵکو لەم فەرموودەیە وا دەردەکەوێ کە لە ناوەکانی الله (٩٩)ناو هەن هەر کەسێ بیژمێرێ دەچێتە بەهەشت. چونکە ئەگەر وا نەبوایە فەرموودەکە دەبوو: **(ان أسماء الله تسعة و تسعون آسماً)(الله أعلم)**

٢- ناوەکانی الله تعالی (توفیق)ین بواری ئەقڵی ئینسان نادەن بۆ پەی پێ بردنیان، بۆیە پێویستە لە قورئان و سونەت وەریبگرین نە لێی زیاد کرێ و نە لێی کەم کرێ.

٣- ناوە پیرۆزەکانی الله لەلایەکەوە ناون بۆ زاتێک و لەلایەکی تریشەوە ئاوەڵناو (صفة)ن بۆ ئەو زاتە بۆ نموونە کاتێ الله دەفەرمووێ: **(وهُوَ الغَفْورُ الرَّحيم)** لە هەمان کاتدا دەفەرمووێ: **(وَرَبُكَ الغَفْورُ ذُو الرَّحمْة)** واتە: لەلایەک الله (رحیم) بەڵام لە هەمان کاتیشدا وشەی (رحم) خۆی ئەو مانایە دەبەخشێ.

٤- ناوەکانی الله دەست کاری ناکرێن و گۆڕانکاری بەسەر ماناکانیان نایەت بەو مانایەی باوەڕ نەبوون بە هەندێکیان یان لادانیان لە ماناکەی خۆی واتە نە (تعطیل) دەکرێن کە بریتییە لە لابردنی ناوەکە یان سیفەت و حوکمەکەی، وە نە(تشبیە)دەکرێن، واتە بەیەک چواندنی لەگەڵ سیفەت و کرداری دروست کراوەکانی.

**پرسیار:** پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرمووێ: **(انَّ الله تِسْةً وتِسْعينَ اِسْماً مِاتَةً اِلاَّ واحِداً مَنْ أحْصَاهاَ دَخَلَ الجَنةَ)** رواه البخاری، واتە: الله (٩٩) ناوی هەیە هەرکەسێک بیانژمێرێ دەچێتە بەهەشت.

ئایا مەبەست لەم ژماردنە چۆنە؟

**وەڵام:** مەبەست لەم ژماردنە واتە:

١- یەک لە دوای یەک بیانژمێری.

٢- لەماناکانی بگەیت.

٣- زۆر بیری لێ بکەیتەوە.

٤- بەم ناوانە داوای لێ بکەیت و خوای خۆتی پێ بپەرستی.

٥- کار بکاتە سەر ژیانت.

**پرسیار:** ئایا ئایەتی **(وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا)** مانای چییە؟

**وەڵام:** واتە الله تعالى خاوەن ناوی ڕێک و پێک و بە ناوەڕۆکە و بەم ناوانە بانگی بکەن...

مەبەست لەو ڕێک و پێکیەش(الحسنى) واتە:

١- ناوەکانی الله لەو پەڕی ڕێک٠ و پێکین بۆ نموونە کاتێ دەڵێی (الحي) واتە: ژیانێکی بێ سەرەتا و بێ کۆتایی، یان (الحليم) واتە: زانیاری تەواو نەبڕاوە، یان (الرحمن) واتە: لە هەموو کەس بەبەزەیی ترە بەجۆرێک هێندە بە بەزەییە بەرامبەر بە بەندەکانی زیاتر لە دایکێک بۆ کۆرپەکەی

٢- ناوەکانی الله گشتیان ناونیشانن بۆ خودی خۆی واتە: کاتێک کە الله ناوی (الرحيم)ە سیافاتی(الرحيم)یشی هەیە، یان ناوی(العزيز)ە سیافاتی(العزيز)یشی هەیە بە کورتی دەتوانین بڵێین: هەموو ناوەکانی الله وەسفن بۆ خودی (الله).

٣- گشت ناوەکانی الله بواری بیرکردنەوەی ئادەمیزاد نین، واتە :ئادەمیزاد بۆ پەی بردن بەناوەکانی الله (وەک و خۆی) دەستە و وەسانە.

**پرسیار:** پێنج بنچینەی گرنگ بژمێرە لەسەر ناو و سیفەتەکانی اللە ؟

**وەڵام:**

یەکەم: قسەکردن لەهێندێ سیفەت وەکو قسەکردنە لە هەموو سیفەتەکانی، بۆ نموونە: دان بە هێندێ سیفەت لە سیفەتەکانی اللە بهێنی پاشان بڵێین ئەمانە سیفەتی حەقیقین...وەکو (الحياة والعلم والقدرة والسمع والبصر والكلام والارادة) بەڵام (خۆشەویستی و ڕەزامەندی و تورە بوون و رق هەڵسان) بەسیفەتی(مجازي)دابنێین!!

بێگومان هەڵوێستی ئەم کەسانەش وەک ئەوە وایە کەدان بەهیچ سیفەتێکی اللە نەنێن ؟!

هەروەها ئەوانەی دەڵێن اللە ناوی(حي)یە بە بێ ئەوەی سیفەتی بێ، یان ناوی(عليم)ە بەبێ ئەوەی سیفەتی (علم)ی هەبێ، دیسان ئەوانە وەک ئەوانەن کە دان بەهیچ سیفەتێکی خوو نەنێن.

دووەم: قسەکردن دەربارەی سیفەتەکانی اللە قسەکردنە دەربارەی زاتی اللە واتە: هەرچی دەربارەی سیفەتەکانی اللە بگوترێ ئەوا دەربارەی زاتی اللە گوتراوە.

بۆ نموونە: کاتێ کە اللە دەفەرمووێ: (اللە لە سەر عەرشە) بەڵام یەک بڵێت نەخێر اللە لەسەر عەرش نییە؟! ئەوە وەک ئەوە وایە کە نکوڵی لە بوونی(وجود)ی اللە بکات!!

سێیەم: لەکارخستنی (تعطيل)ی سیفەتەکانی خوا خۆی لەخۆیدا باوەڕ بوونە بە وێکچوون(التشبيه) چونکە باوەڕی وایە سیفەتەکانی اللە تعالى بە سیفەتی دروست کراوەکانی دەچێ بۆیە لەکاری دەخات.

واتە :پێش ئەوەی (تعطيل)ی سیفەتەکانی اللە بکات سیفەتەکانی اللە (تشبيه) کردووە بە دروست کراوەکانی چونکە(تعطيل) کردنی سیفەتەکانی اللە بۆ خۆ ڕزگار کردنە بە وێک چواندن بە دروست کراوەکانی اللە.

چوارەم: ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەربارەی ڕواڵەتی سیفەتەکانی اللە لێکچووەکان(المتشابه) نین واتە هیچ ئایەتێک لەبارەی سیفەتەکانی اللە نییە مانای دیار نەبێ تاوەکو پێویستیان بە(تأويل) هەبێ..

پێنجەم: هەقیقەتی(تأويل)

أ- بەواتای سەرەنجامی ڕاستەقینەی هەر شتێک دێت لە دوا قۆناغی دا بۆ نموونە سەرەنجامی ڕاستەقینەی ئینسان زیندوو بوونەوەیەتی لە ڕۆژی دوایی ئەمەش هەقیقەتی قورئانییە کە دەفەرموێ: **(ولما يأتهم تأويله)** يونس٣٩ واتە: هێشتا بۆیان نەهاتووە دوایە ڕۆژ سەرەنجامی بڕوا نەهێنانەکەیان یان دەفەرموێ: **(هل ينظرون الا تأويله)**الأعراف٥٣ واتە: ئایا بێ بڕوایان چاوەڕوانی هیچ شتێ دەکەن جگە لە دوارۆژ و سەرەنجامە ڕاستە کەی؟

ب- (تأويل) بەمانی تەفسیر لێکی دەدەنەوە

ج- (تأويل) بەمانی گۆڕینی وشەیەکی ئاشکرا لەبەر بەڵگەیەک کە هەیە، ئەم (تأويل)ەش لای زانایان لەلای زانایان ئوسوڵ وایە.

گۆڕینی واتای ووشەیەکی ئاشکراش لەلایەن زانایانەوە دەکرێتە سێ بەش:

١- واتاکە دەگۆڕێ لەبەر بوونی بەڵگەیەکی دروست لە قورئان و سونەت ئەمەشیان لە شەریعەتی ئیسلامدا دروستە.

٢- گۆڕینی واتای ووشەیەک کە گوایە زانایەکی(مجتهد) کاتی خۆی وای بۆ چووە کە دەبێ ئەم ووشەیە(تأويل) بکرێ کەچی(تأويل)یش ناکرێ، ئەمەش پێی دەوترێ (تآويل)ی دوور و هەڵە.

٣- گۆڕینی واتای ووشەیەک بەبێ بەڵگە ئەمە پێی دەگوترێ گاڵتەکردن بە دین.

وەک ئەوانەی کە(استوى) بە (استولي) لێک دەدەنەوە یان(ريد) بە (قدرة) یان (وجه) بە(ذات) ئەمانە گشتیان گاڵتەکردنن بە دینی الله تعالى.

**پرسیار:** ئایا سیفەتەکانی الله فراوانترن یان ناوەکانی؟

**وەڵام:** سیفەتەکانی الله فراوان ترن لە ناوەکانی بۆ نموونە هەر هەموو ناوەکانی الله سیفاتی الله تعالى ن، بەڵام الله تعالى چەندین سیفەتی تریشی هەیە کە ناونین بۆ الله، بۆ نموونە الله تعالى دەفەرمووێت:

**(وَجاءَ رَبُكَ)** واتە: پەروەردگارت دێت.

یان **(اِنَّ بَطْشَ رَبَكَ)** واتە: بەڕاستی تۆڵەی الله تعالى.

یان **(فَأَخَذهُمُ الله بِذُنُوبِهِم)** واتە: الله تعالى بەهۆی تاوان و سەرپێچیەوە قار و ڕقی لێگرتن.

لێرەدا دەبینین کەوا **(جاء، بطش، آخذ)** گشتیان سیفەتی الله تعالى ن بەڵام ناونین بۆ الله تعالى.

**پرسیار:** باوەڕ (الایمان) چیە؟

**وەڵام:** لەزمانەوانی (اللغة) بەمانای (بەڕاستدانان_التصدیق) دێت هەروەک کاتی خۆی براکانی یوسف (علیه السلام) بەباوکیان گوت: **(وَمَا أنْتَ بِموْمِنٍ لَنا وَلَوْ كُنَّا صادِقِينَ)** یوسف١٧، واتە: تۆ بە ئێمە بڕواناکەیت، ئەگەر ئێمە ڕاستیش بکەین.

هەروەها لە (شەریعەت)دا باوەڕ بریتییە لە باوەڕهێنان بە (الله تعالی، فریشتەکانی، کتێبەکانی، پێغەمبەران، ڕۆژی دوایی، قەزا و قەدەر) کە هەموویان ڕوکنەکانی باوەڕ پێک دەهێنن.

**پرسیار:** بنچینەنەکانی بیر و باوەڕی ئیسلامی چین؟

**وەڵام:** بنچینەنەکانی بیرو باوەڕی ئیسلامی بریتین لە باوەڕهێنان بە ( الله تعالی، فریشتەکانی، کتێبەکانی، پێغەمبەران، ڕۆژی دوایی، قەزا و قەدەر) هەروەک کاتی خۆی پێغەمبەری الله ﷺ لە پرسیاری (جبریل_علیه السلام ) کاتێ لێی پرسی (ئیمان)چییە؟ فەرمووی: **( الایَمانُ أَنْ تؤمِنُ بِاللّه وَمَلائِكتِةِ وَكُتُبَّهِ ورسُلِهِ وَالْيَومَ الآخرِ وتؤمِنَ بِالقَدرِ خَيْرِهِ وَشَرِه)**رواه مسلم.

**پرسیار:** باوەڕ بە الله چییە؟

**وەڵام:** باوەڕ الله بریتییە لە: (بڕوایەکی پتەو بەوەی کە الله تعالی وەدیهێنەری هەموو شتێکە وە هەر خۆی شیاوی پەرستنە ئەویش لە ڕێگەی نوێژ و ڕۆژو و پاڕانەوە و تکا و ترس و خۆ بەکەم زانین و مل کەچایەتیەوە هەروەها الله وەسف کراوە بە سیفاتێکی پاک و کامل و بێ خڵتە)، هەروەها پێک دێت لە باوەڕ بە (خوایەتی الله و پەروەردگارێتی الله و ناو و سیفەتەکانی الله).

**پرسیار:** جۆرەکانی باوەڕ بە الله چین؟

**وەڵام:** جۆرەکانی باوەڕ بە الله چوار جۆرن:

١- باوەڕ بە بوونی الله (وجود الله)

٢- باوەڕ بە پەروەردگارێتی الله (الربوبیة)

٢- باوەڕ بە خوایەتی الله (الالوهیة)

٤- باوەڕ بە ناو و سیفەتەکانی الله (الاسماء والصفات)

**پرسیار:** چۆن بوونی الله دەسەلمێنیت؟

**وەڵام:** بە چوار شتان:

١- زگماکی (الفطرة): ئادەمیزاد هەر کە زگماکیەوە کە لە دایک دەبێ موسڵمانە هەروەک پێغەمبەری ئازیزﷺ دەفەرمووێ: **(مَا مِنْ مَوْلُودٍ اِلاَّ يُولَدُ عَلَى الفِطرَة،فَآبَواهُ يَهوَدانِهِ أَوْ يُنْصِرانِهِ أَوْ يُجْسانِهِ)**رواه البخاري. واتە: هەر منداڵێک کە لە دایک دەبێ بە زگماک بە موسڵمانی لەدایک دەبێ، ئینجا باوک و دایکی دەیکاتە جوولەکە یان خاچ پەرست یان ئاگر پەرست.

٢- بەڵگەی ژیری: هەرشتێک لەم بونەوەرە بگریت ژیری ڕێت پێنادات تا بڵێیت لە خۆوە دروست بووە، یان بۆ خۆیان خۆیان دروست کردووە چونکە لە پێش بوونی خۆیان نەبوونە، ئیتر چۆن بوون بە دروست کەری خۆیان؟ هەروەک الله تعالی دەفەرمووێ: **(أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ)** الطور٣٥

واتە: ئایا بێ هیچ شت دروست کراون یان خۆیان خۆیانیان دروست کردووە.

٣- بەڵگەی شەریعەت: ئاینە ئاسمانییەکان گشتیان باسی تاک و تەنیایی الله تعالی دەکەن، هەروەک الله تعالی دەفەرمووێ: **(وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ)**النحل ٣٦ واتە: بۆ هەر گەلێک پێغەمبەرێکمان ڕەوان کردووە بۆ ئەوەی پێیان بڵێیت خوا بپەرستن و واز لە بێبڕوایان بێنن.

٤- بەڵگەی هەست کردن: کاتێ لە لە خوا دەپاڕێینەوە و دوعاکەمان گیرا بووە، هەست دەکەین کە خوایەک هەیە لەدوای دوعاکە دوعامان گیرا دەکات، هەروەک الله تعالی دەفەرمووێ : **(إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ)**الانفال ٩ واتە: کاتێ کە داوای کۆمەکی لە پەروەردگارتان دەکەن ئەو وەڵامتان دەداتەوە...

**پرسیار:** چۆنی تر بوونی الله دەسەلمێنی یان ئایا کێ ئێمەی دروست کردووە؟ کێ ئەو هەموو درەختەی دروست کردووە؟ کێ ئەم ئاسمان و مانگ و ڕۆژ و ئەستێرانەی دروست کردووە؟ کێ ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە؟

**وەڵام:** بۆ وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە، ئێمە کۆمەڵێک پرسیار و وەڵام دەخەینە بەر چاو:

- ئایا دەزانی ئەو کورسییەی کە لەسەری دادەنیشی کێ دروستی کردووە؟

+ بەڵێ: دارتاش دروستی کردووە.

- ئایا دەزانی ئەو خانوەی کە لەناویا دەحەوێیتەوە کێ دروستی کردووە؟

+ بەڵێ :کرێکار دروستی کردووە.

- ئایا دەزانی ئەو قوتابخانەیەی کە تیایدا دەخوێنین کێ دروستی کردووە؟

+بەڵێ :میری دروستی کردووە.

-ئایا دەزانی ئەم کات ژمێرەی لە دەستت دایە کێ دروستی کردووە بۆ چی دروست کراوە؟

+بەڵێ وەستایەکی زۆر زانا و شارەزا دروستی کردووە بۆ زانینی کات.

-ئایا دەشێ بڵێین ئەم کات ژمێرە هەر لە خۆوە بە بێ وەستا دروست بووە؟

+ نەخێر، هەرگیز شتی وانەبووە و نابێ کەوا شت سەربەخۆ بە بێ دەستی هێزدار و زانایەک دروست بێ، چونکە قسەی وا قسەیەکی ستەم و پڕوپوچ و بێ مانایە و لە تەرازووی حەقڵ و مەنتیقدا کێشی بۆ نییە لەبەر بێ بەڵگەیی.

- جا باشە، تا ئێستا دەرکەوت کە هەر شتێک هەر چەند بچووک بێ، وەک کاتژمێر و کورسی وە یان هەرچەند گەورە بێ وەکو قوتابخانە و زۆر شتی تر، دەبێ دروست کەرێکی هەبێ، ئەی چۆن دەشێ ئەم بوونەوەرە پەروەردگارێکی نەبێ کە لەسەرەتاوە دروستی کردبێ؟!!

**پرسیار:** ئایا ڕاستە ئەڵێن ئەوەی بە چاو نەبینرێ نابێ بڕوای پێ بکرێ؟

**وەڵام:** ئەو کەسەی کە ئەم جۆرە قسانە دەکات...

پێشەکی دەبێ دان بەوەدا بهێنێ کە بۆخۆی گەمژەی بێ ئەقڵە...

چونکە هەر شتێک گەر بە چاو نەبینرا بڕوای پێ نەکرێ، ئەوا عەقڵیش بە چاو نابینرێ کەواتە بەپێی ئەم بەڵگەیە هیچ کەس لەسەر ئەم زەوییە نابینی کە خاوەن عەقڵ بێ گشتیان شێت و وێڵ و سەرگەردان ژیان دەبەنە سەر.

خۆ زۆر شت هەن بە چاویش نابینرێن بەڵام دەبێ بڕوای پێ بکەین..

ئەم شتانەش وەکو (هەوا، هێزی موگناتیسی، گیانی ئادەمیزاد، هێزی کێش کردنی زەوی، گەردیلە، تەزووی کارەبا...هتد) ئەمانەش گشتیان بەچاو نابینرێن، بەڵام بڕواشمان پێیان هەیە...

**پرسیار:** ئایا بوونەوەر چۆن دروست بووە؟یان کێ بوونەوەری دروست کردووە؟

**وەڵام:** بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە فەیلەسوف و زاناکانی جیهان هەر لە دێرین ڕۆژگارەوە هەتا ئەمڕۆ چەند تیۆرێکیان لەم بارەوە بووە...

بەڵام ئەگەر هەموو ووتەکان هەڵسەنگێنین لەم چوار پێشنیار و تیۆرانە دەرناچن؟

١- دەڵێن: ئەم بوونەوەرە بێ یاسایە،واتە بوونەوەر بە بێ یاسا بەڕێوە دەچێ

٢- یان دەڵێن :ئەم بەڕێکەوت دروست بووە.

٣- یان دەڵێن: (سروست-طبیعة) ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە.

٤- یان دەڵێن: الله یەکی بە دەسەڵات و توانا دروستی کردووە.

**تیۆری یەکەم:** بوونەوەری بێ یاسا:

بە بڕوای ئێمە، هەرکەسێک ساتێک وورد بێتەوە لە بوونەوەر تێدەگات کە ئەم بوونەوەرە بە بێ یاسا هەڵناکات، تەنها یەک نموونە دەهێنینەوە ئایا لە کاتی حەج کردنا کێ دەتوانێ لە قەرەباڵغی ئەم ڕۆژە حەجی خۆی بکات بەڵام بەمەرجێ لەشی بە لەشی هیچ کەسێ نەکەوێ، ئایا کەسێک بڕوا دەکات دەڵێ ئەم ساڵ من چوومەتە حەج و حەجی خۆم کرد بەڵام بێ ئەوەی شانم بە شانی کەس بکەوێ؟ بێگومان نەخێر...

بەڵام خۆ ئەگەر ساتێک وورد بینەوە لە ئەستێرەکانی ئاسمان، کە زانایان دەڵێن هەر ئینسانێک لە ڕووی ژمارەوە (١٠) ملیۆن ئەستێرەی بەرامبەرە.

کەچی ئەم ئەستێرانە بەردەوام لە ناو یەکدا هاتوچۆ دەکەن، هەروەک الله تعالى دەفەمووێ: **(كُلٌ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونْ)**يس.٤٠، واتە هەر هەموو ئەستێرەکان لە بۆشایی ئاسمان مەلە دەکەن بەڵام بێ ئەوەی هیچێکیان بەریەکتر بکەون...

ئایا دەزانن بۆ؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: ئەگەر هەر ئەستێرەیەک بەر ئەستێرەیەک بکەوێ دونیا تەخت و وێران دەبێ.

کەواتە: دەبێ بڵێین ئەم بوونەوەرە یاسایەک هەیە کە بەڕێوەی دەبات.

**تیۆری دووەم:** بوونەوەر بەڕێکەوت دروست بووە

بۆ ئەمەش دەتوانین نموونەیەک بهێنینەوە.

ئەگەر تۆ خاوەنی چاپخانەیەک بیت و ئەو چاپخانەیە نیو ملیۆن پیتی تێدا بێت یەکێ لە کرێکارەکانی چاپ خانەکە هات گوتی:ئەم شەو بوومەلەرزەیەکی گەورە قەوما و هەموو پیتەکانی چاپخانە و کاغەز و کلێشەکان هەموویان تێکەڵاو بوون بەڕێکەوت دیوانێکی شیعر چاپ بوو کە لە هەموو ڕوویەکی وێژەوانییەوە لەوپەڕی وردەکاری دایە لە ڕووی کێش و سەروا (الوزن و القافية) و مانا و ڕێزمانەوە هیچ نارێکی تیا نییە و پتر لە (٥٠٠) لاپەڕەیە، ئایا بڕوای پێ دەکەی؟

لەوەڵامدا هەقتە پێی بڵێی، درۆی وا گەورەم قەت نەبیستووە و لە نیسانیش درۆی وا ناکرێت چونکە ئەم قسەیە بە عەقڵی هیچ کەسێکا نایە و ئەمە شتێکی نەگونجاوە...

دەی باشە ئەگەر نموونەیەکی وا نەگونجاو بێ،چۆن دەگونجێ بڵێین ئەم بوونەوەرە فراوانە بە ڕێکەوت دروست بووە، کەشتی وای تیایە گەلێ لە ڕادەی عەقڵی ئادەمیزاد بەدەرە ئایا دەزانی ئەم ڕۆژە بەشێوەیەک لە ئاسمان دانراوە کە ئەگەر چەند میلێک لە زەوی دوور کەوێتەوە هەموو دونیا دەیبیستێ،یان ئەگەر چەند میلێک لێی نزیک بێتەوە هەمووی گڕ دەگرێ،وە ئایا دەزانی ئەگەر مانگ چەند میلێک لە زەوی دوور کەوێتەوە هەرچی تەڕایەتی هەیە نامێنێ،یان ئەگەر چەند میلێک لێی نزیک کەوێتەوە ئەوا دونیا بن ئاو دەکەوێت؟ ئەمە و چەندین نموونەی تر...

کەواتە بوونەوەر بە ڕێکەوت دروست نەبووە.

تیۆری سێیەم :سروشت بوونەوەری دروست کردووە.

ئێمە پرسیارێک لەخاوەنی ئەم پرسیارە دەکەین و دەڵێین:بەڵگەتان چییە بۆ ئەم قسەیە؟

ئەقڵ و مەنتق و زانست ئەمە قبوڵ دەکا کە بڵێین و پڕوپاگەندە بکەین، کە سروشت ئادەمیزاد و گشت زیندەوەرەکانی دروست کردووە بەو شێوە جوانە؟

باشە ئەگەر ڕاستە بۆ هەتا ئێستا نەمان بینی و نەمان بیست کەوا سروشت بەڕێکەوت قوتابخانەیەک یا قەڵایەک وەیا ژوورێک وەیا کات ژمێرێک یا دەرزییەک دروست بکات تا قەناعەتمان بێت کەوا زەوی و ئاسمان و ئەستێرەکانیش بەڕێکەوت (سروشت دروستی کردوون).!!

ئەمانە گشتیان لەلایەکەوە، گریمان زەوی یاخود بڵێین سروشت بەهەرجۆرێک پیاوێکی بۆ یەکەم جار دروست کرد، باشە چۆن ئەقڵی پیا شکا و توانی ئافرەتێکیش لە چەشنی ئەم پیاوە دروست بکات کەلە چەند خاسیەتێک لەگەڵیا جیا بێت کە بشێت بۆ زاوزێ بەهۆی نزیک بوونەوەیان لەیەکتری!!

کەواتە ئەم تیۆرە بەڕاست دانانرێ.

تیۆری چوارەم: (الله تعالی)ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە:

بەپێی ئەم ڕوون کردنەوانەی سەرەوە بۆت دەردەکەوێ کە ئەم بوونەوەرە نەبەبێ یاسا و نەبەڕێکەوت و نە بەسروشت دروست بوون، بەڵکو لە ژوور ئەمانەوە خوایەک هەیە کە بوونەوەری بەدیهێناوە هەر ئەویش هەڵیدەسوڕێنێ،چونکە لە پێش پێش الله هیچ شتێک نەبووە،هەر خوای تاک و تەنیا هەموو شتی دروست کردووە بۆ زیاتر ڕوون بوونەوە نمونەیەک دەهێنینەوە:ئەگەر لە ژمارە چوار بپرسیت کێ لە پێش تۆ هەبووە تا تۆ لەدوای بێیتە ناو ناوان؟

لەوەڵامدا دەڵێ: ژمارە (٣) هەبووە، ئەگەر لە ژمارە (٣)ش بپرسیت تۆ ئەم ناوەت لە کوێ هێنا؟

لەوەڵامدا دەڵێ: لە ژمارە دووم وەرگرت ئەگەر لە ژمارە (٢)ش بپرسی ئەی تۆ ئەم ژمارەیەت لە کوێ وەدەست کەوت؟ لەوەڵامدا دەڵێ: لە ژمارە یەکم وەرگرت...

ئەگەر لە ژمارە یەکیش بپرسی ئەی تۆ لە کوێوە هاتووی؟ لەوەڵامدا دەڵێ ئەم ناوە هی خۆمە لە هیچ شتێکم وەرنەگرتووە، چونکە پێش من ژمارە(صفر)ە کەواتە **(هُوَ الأَوَلُ والأخِر)** واتە: الله تعالی هەر هەبووە و هەر دەشمێنێ، ووشەی(هەر) بۆ خۆی نامێنێ، لە کاتێک کە پێش الله ش ووشەی(هەر) هەر نەبووە.

کەواتە: الله تعالی بۆ خۆی هەر هەبووە و هەر ئەویش بوونەوەری دروست کردووە.

**پرسیار:** بۆ دەبێ باوەڕ بە الله بهێنین؟

**وەڵام:** چونکە ئەگەر باوەڕ بە الله نەهێنین، ئەوا:

١- لە ژیاندا وەکو ئاژەڵ دەژین، نازانین کە کێ دروستی کردووین و بۆچی دروست کراوین، هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ)**محمد١٢، واتە: بێبڕواکان ڕادەبوێرن و دەخۆنەوە هەروەکو ئاژەڵەکان.

٢- زەوی پڕ دەبێت لە ئاشوب و ئاژاوە.

نازانێ الله تعالى بۆ ژیانی ڕەخساندوە و بۆچیش تا سەر ئەم ژیانە نامێنێ و خەڵکیش هەر دەبێ بمرن.

٣- بێبەش دەبێ لە ڕەزامەندی الله تعالى هیچ کات الله تعالى سەری ناخا و پشتی ناگرێ.

**پرسیار:** باوەڕ بوون بە خوایەتی الألوهية یانی چی؟

**وەڵام:** باوەڕ بوون بە خوایەتی الله واتە :باوەڕ بوون بە:

١- دەسەڵات دارێتی الله، یان فەرمان ڕەوایەتی الله (الحاكمية).

٢- ئاسایی کردنەوەی دەرد و نەخۆشییەکانی ئادەمیزاد (التهذئة).

٣ - زاڵ بوونی الله بەسەر هەموو شتێکدا (الهيمنة)

٤- الله پەنا دەداتە هەموو کەسێک ( الأجارة).

٥- الله لە دونیا بەچاو نابینرێ (متوارياً عن الأنظار).

٦- خەڵک لە کاتی تەنگایی پێویستی پێی دەبێ و هانای بۆ دەبات (يفزع اليه الانسان).

**پرسیار:** هەقیقەتی باوەڕ چییە؟

**وەڵام:** بریتییە لە بەڕاست دانان بە دڵ و دان هێنان بەزمان و سەلماندن بە کردار، هەروەک شێخ (حسن البصري) ڕەحمەتی الله تعالى لێبێت دەفەرمووێ: **(لَيْسَ الآيمانُ بِالتَمَني ولا بِالتُحَلي وَلَكِنْ مَا وَقَرَ في القَلب وَصدقَهُ العَملْ)** واتە: باوەڕهێنان بە ئاوات و خۆ ڕازاندنەوە نییە بەڵکو باوەڕ ئەوەیە کەلەدڵدا جێگیر بێ و بە کردەوەش بیسەلمێنی.

**پرسیار:** گرنگی ئیمان چییە لە ژیانی ئادەمیزاددا؟

**وەڵام:** ئینسان بە بێ ئیمان هیچ نرخێکی نییە لەلای الله، بۆیە لەسەر ئینسان پێویستە ئیمانێکی پاکی بە ئیسلام هەبێ و کارەکانیشی لەسەر بنچینەی ئیمانەوە جێبەجێ بکات.

کەواتە ئیمان گرنگیەکی حەتمیە لە ژیاندا بۆ نموونە:

١- ئینسان لەڕێگەی ئیمانەوە تێکەڵ بەبەندایەتی الله دەبێت، هەروەک الله دەفەرمووێ: **(أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ، ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ)** يونس٦٢_٦٣ واتە: بەڕاستی دۆستانی الله ترس خومیان بەسەرەوە نییە، ئەو دۆستانەی کەوا بڕوایەکی پتەویان هەیە و هەمیشە خۆ لە گوناه دەپارێزن.

٢- بە ئیمان ڕەزامەندی الله دروست دەبێ: **(وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ)** التوبة٧٢

واتە: الله پەیمانی داوەتە بڕوادارن چ پیاو چ ژن کەوا بیان خاتە بەهەشت کەوا چەندین ڕووباری بەژێردا دەڕوات و بەنەمریش تیایدا دەمێننەوە وە خانووی چاکیان لە بەهەشتی(عدن)بە نسیب دەبێ و ڕەزامەندی الله ش بۆ ئەم کەسە لەم ڕۆژەدا لە هەموو شتێک گەورەترە، بەڕاستی گەورەترین سەرکەوتنە بۆ وان.

٣- الله بەرگری لە ئیمانداران دەکات :هەروەک دەفەرمووێ: **(إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ)**الحج٣٨،واتە: بەڕاستی الله بەرگری دەکات لە ئیمان داران.

٤- ئیمان دەبێتە مایەی دروست بوونی ژیانێکی خۆش و کامەرانی، هەروەک الله دەفەرمووێ: **(مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ)** النحل٩٧

واتە: هەرکەسێک کردەوەی چاک بکات لە پیاو و لە ژن بەمەرجێ بڕوادات بێ ئەوا دەیان خەینە ژیانێکی زۆر خۆشەوە و پاداشتیان دەدەینەوە بە چاکتر لەوەی کردوویانە.

٥- ئیمان دەبێتە مایەی ڕۆشنکەرەوەی دڵ، هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ)**التغابن١١.واتە: هەر کەسێک بڕوا بێنی بە الله، دڵی ڕۆشن دەبێتەوە.

٦- ئیمان دەبێتە مایەی خۆشەویستی الله یە هەروەک الله دەفەرمووێ: **(إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا)**مریم٩٦. واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و کردەوەی چاک ئەنجام دەدەن خۆشەویستی الله یان بۆ دروست دەبێ.

٧- الله تعالى پێگەی ئیمانداران بەرز دەکاتەوە، هەروەک دەفەرمووێ: **(يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ)** المجادلة١١، واتە: الله تعالى پلەی بڕواداراني گەر ئێوە و ئەوانەی کە زانست و زانیاریان پێدراوە بە چەندین قات بەرز دەکاتەوە.

٨- لەکاتی (خۆشی و ناخۆشی) دا ئیمان دار هەر سەرکەوتو و براوە دەبێ، هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(عَجَبًا لِأَمْرِ الْمُؤْمِنِ، إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ، وَلَيْسَ ذَاكَ لِأَحَدٍ إِلَّا لِلْمُؤْمِنِ، إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ، فَكَانَ خَيْرًا لَهُ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ، فَكَانَ خَيْرًا لَهُ)** رواه مسلم، واتە: سەرم دێ لە کاری بڕواداران، کە هەموو کارێکیان هەر بە خێر بۆ دەگێڕێ، کاتێ کە دووچاری شتێکی خۆش بوون سوپاسی تیا دەکەن، ئەوە بۆ وان شتێکی چاکە وە کاتێ کە

دووچاری شتێکی ناخۆش بوون ئارامی لەسەر دەگرن،کە ئەوەش بۆ ئەوان هەر شتێکی چاکە، ئەم خێرانەش بۆ هیچ کەس نانووسرێت تەنها بۆ بڕوادار نەبێ.

**پرسیار:** لقەکانی باوەڕ چەندن؟

**وەڵام:** پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: **(الإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ، شُعْبَةً فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ لاَ إِلَهَ إِلاّ الله، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيمَانِ)** متفق عليه .واتە: باوەڕ بریتیە لە(٧٣) تا (٧٩) لق، بەرزترینیان گوتنی(لا الە الا اللە) یەو نزمترینیان لابردنی بەردێکە لەسەر ڕێگا، شەرمیش لقێکە لە باوەڕ.

**پرسیار:** پتەوترین پەتی باوەڕ چییە؟

**وەڵام:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(أَوْثَقُ عُرَى الْإِيمَانِ الْمُوَالَاةُ فِي اللهِ، وَالْمُعَادَاةُ فِي اللهِ، والْحَبُّ فِي اللَّهِ وَالْبُغْضُ فِي اللَّهِ)**رواه الطبراني والطيالیسي عن ابن مسعود رواه أحمد و ابن آبي شيبة وبراء بن عازب،

واتە: پتەوترین لقی باوەڕ، بریتیە لە دۆستایەتی و دوژمنایەتی بۆ الله و خۆشویستن و ڕق بوونەوە بۆ الله.

واتە دەبێ ولاء و براء خۆشویستن و ڕق لێبوونەوەمان لەپێناو الله بێت، ئەوکات پتەوترین ئیمانمان هەیە، چۆن ئیمان جیاکەرەوەی حەق و باتڵە گەر برای شیریمان بوو بەڵام بێ باوەڕ بوو ئەوە ڕقمان لێی دەبێ و خۆشمان ناوێت، بۆیە دەبێ زۆر ئاگاداری ئەو خاڵە بین..

**پرسیار:** چۆن تامی باوەڕ دەچێژین؟

**وەڵام:** پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرمووێ: **(ثَلَاثٌ مَن كُنَّ فيه وجَدَ حَلَاوَةَ الإيمَانِ :أنْ يَكونَ اللَّهُ ورَسولُهُ أحَبَّ إلَيْهِ ممَّا سِوَاهُمَا، وأَنْ يُحِبَّ المَرْءَ لا يُحِبُّهُ إلَّا لِلَّهِ، وأَنْ يَكْرَهَ أنْ يَعُودَ في الكُفْرِ كما يَكْرَهُ أنْ يُقْذَفَ في النَّارِ)**متفق عليه. واتە: سێ شت هەن لە هەرکەسێک دابێت تامی باوەڕ دەچێژێت ئەویش :الله پاشان پێغەمبەرت لە هەموو شت خۆشتر بوێت، کەسێکت لەبەر الله خۆش بوێ و ڕقت لەوە بێ بچیتە ناو کوفر دوای ئەوەی الله تعالى لەو کوفرە ڕزگاری کردووی بە جۆرێک وەکو ئەوە پێت ناخۆشە بچیتە ناو ئاگر.

**پرسیار:** چۆن باوەڕ لە دڵدا کامڵ دەبێ؟

**وەڵام:** پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرمووێ: **(مَنْ أحَبُ لِلَّهِ و أبْغَضُ لِلَّهِ و أعْطَّى لِلَّهِ و مَنَعَ لِلَّهِ فَقَدْ أسْتَكمَلَ الإيمانْ في قلوبكَمْ)**متفق عليه،واتە: هەرکەسێک خۆشویستن و ڕق بوونەوە و بەخشین و نەبەخشینی بۆ الله بێت ئەو دەمە باوەڕەکەی کامڵ بووە.

**پرسیار:** جیاوازی نێوان (مؤْمِنُ) ئیماندار و (مُسلِمْ) موسڵمان چیه؟

**وەڵام:** (مؤمِنْ) به کەسێک دەڵێن کەوا لە دڵەوە ئاین و بەرنامەی بەڕاست بزانێ و بە زمانیش دانی پیابهێنێ و بەکردەوەش بیسەلمێنێ.

بەڵام (مُسْلِمْ) بەکەسێک دەڵێن، کەخۆی دابێتە دەست بەرنامەی الله و مل کەچی شەریعەتی ئیسلام بووبێ، هەروەک الله دەفەرمووێ: **(قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا وَلَٰكِن قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ)**الحجرات١٤، واتە: کۆمەڵێ لە دەشتەکیەکان هاتنە لات و دەیانگوت ئێمە ئیمانمان هێناوە،تۆش لەوەڵامدا پێیان بڵێ، ئیمانی ڕاستەقینەتان نەهێناوە واتە ڕاست ناکەن بەڵام بڵێن بەناچاری خۆمان کردووە بە مسوڵمان و گەردن کەچیمان پیشان داوە چونکە هێشتا ئیمان نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوە. وە هەموو موئیمێنی واتە ئیماندار موسڵمانە بەلام هەموو موسڵمانێ ئیماندار نیە!..

**پرسیار:** ئایا باوەڕ کەم و زیاد دەبێ؟

وەڵام: بەڵێ، بەڵگەش ئەم دوو ئایەتەیە: **(لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ)**الفتح٤، واتە :بۆ ئەوەی باوەڕیان لەگەڵ باوەڕی پێشوویان زیاد دەبێ.

**(ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا...)** ال عمران١٧٣, واتە: ئەو کەسانەی کە خەڵکی پێیان گوت .وا خەڵکی دەورەیان لێداون لێیان بترسن ئەوانیش لەسەر ئەمە بڕوایان زیاتر بوو.

کەوابوو بەڵێ باوەڕ و ئیمان زیاد دەکا بەکردنی کردەوەی چاک و گوێرایەڵی الله، کەم دەکا بەتاوان و سەرپێچی..

**پرسیار:** بڕوادار بەچی باوەڕی زیاد دەبێ؟

**وەڵام:** گرنگترین هۆیەکانی زیاد بوونی باوەڕ بریتین لە:

١- زانیاری (العلم) هەروەک جندب بن عبدا الله و ابن عمر دەڵێن: **(تَعَلُمْنَا الأيمانَ، تَعَلُمُنَا القرن فَزِدْنا اِيماناً)** واتە: باوەڕمان وەرگرت و فێری قورئان بوین و ئیمانمان زیاتر بوو.

ئادەمیزاد هەرچەند لە ڕێگەی زانیاری بیر لە بوونەوەر بکاتەوە زیاتر گەورەیی الله ی بۆ ڕوون دەبێتەوە و باوەڕی پێ زیاتر دەبێ، هەروەک الله دەفەرمووێ: **(إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ )** فاطر٢٨، واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە زانان لەیەکخواناسین لە الله دەترسن.

٢- کردار(العمل) ئادەمیزاد هەرچەند چاکە بکات و خێر و خێرات و نوێژ و ڕۆژوو بگرێت زیاتر باوەڕی لە دڵدا دادەمەزرێت، هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِى ٱلصَّٰلِحِينَ)** العنكبوت٩. واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کاری چاک ئەنجام دەدەن دەیان خەینە ڕیزی پیاو چاکان.

٣- یادکردن و بیرکردنەوە: (الذکر والفکر) بە یادکردنەوەی الله باوەڕ زیاتر دەچەسپێ  هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا)** الانفال٢ واتە: بڕواداری ڕاستەقینە  ئەوانەن کاتێ یادی الله دەکەن دڵیان ڕادەچڵەکێ کاتێ ئایەتی الله یان بەسەردا دەخوێنرێتەوە باوەڕیان زیاد دەکات.

هەروەها چەند بیر لە دروست کراوەکانی الله بکەیتەوە  گەورەیی خوات زیاتر بۆ دەردەکەوێ و باوەڕت لە دڵا دەچەسپێ، هەروەک الله دەفەرمووێ: **(وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ)** ال عمران١٩١

واتە: ئەوانەی خاوەن ئەقڵن و بیر دەکەنەوە لە داڕشتنی ئاسمانەکان و زەوی دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئەم دروست کراوەت بە بێ هۆ دروست نەکردووە و پاکی بۆ تۆ ئەی خوایە،کەواتە بمانپارێزە لە سزای ئاگر.

**پرسیار:** دژەکانی باوەڕ(نواقض الایمان) چین؟ موسڵمان بەچی کافر دەبێت؟

وەڵام: زۆر شت هەن باوەڕی مرۆڤ هەڵدەوەشێنێتەوە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن

١- نکوڵی کردن لە پەروەردگارێتی الله.

٢- نکوڵی کردن لە خوایەتی الله.

٣ - نکوڵی کردن لە ناو و سیفەتەکانی الله.

٤- دژایەتی کردنی قورئان و پێغەمبەرﷺ

**پرسیار:** دژایەتی کردنی قورئان و پێغەمبەر ﷺ چۆن دەبێت؟

**وەڵام:**

١- ڕەخنەگرتن و توانج هاویشتن لە پێغەمبەر ﷺ ڕەخنەگرتن و تیر و توانج هاویشتنیش تەنها ئەوە نییە کە بەرامبەر خودی پێغەمبەر ﷺ بکرێ بەڵکو ڕەخنە گرتن و تیر و توانج هاویشتن بەرامبەر هەر ڕەفتارێک یان هەر گوفتارێکی پێغەمبەر ﷺ بکرێت ئەوە بەرامبەر خودی پێغەمبەر ﷺ کراوە بۆ نموونە گەر گاڵتە بە سیواکێک یان ڕیشی موسڵمانێک بکرێ ئەوە گاڵتە بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کراوە، هەروەها خوای گەورە باسیان دەکات و دەفەرمووێ: **(وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا...)**، محمد١٦

واتە: لە کافرەکان هی وا هەن لەلای تۆ بەڕواڵەت زۆر باش گوێ دەگرێ لە تۆ، کاتێ کە لای تۆ دەرچوون ئەیانگوت بەوانەی کە زانست و زانیاریان پێ دراوە کە موسوڵمانەکانن بە گاڵتە پێ کردنەوە، ئەوە چی بوو ئێستا گوتی؟

٢- نکوڵی کردن لەهەندێک لەو هەواڵانەی کە پێی ڕاگەیاندوین، هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا قَالُوا۟ قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَآ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ،وَإِذْ قَالُوا۟ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ)**الانفال٣١_٣٢، واتە کاتێ ئایەتەکانی ئێمە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بەسەریانا دەخوێندرێتەوە ئەڵێن:بیستمان و ئەگەر ئێمە بمانەوێ وێنەی ئەم خوێندراوە ئەڵێین بەڕاستی ئەمە هیچ نییە جگە لەوە قسەی پووچە نوسراوەکانی گەلە کۆن و ڕابردووەکانە وە دەیان گوت ئەی خوایە ئەگەر ئەم قورئانە هەر ئەو هەق و ڕاستە کە لەلایەن تۆوە هاتووە وەک محمد دەڵێ دەی ببارێنە بەسەرماندا بەردێک کە لە ئاسمان و لای سەروومانەوە هاتبێ یان سزایەکی تری سەختی ئێش و ئازاردەرمان بۆ بێنە تاکو باوەڕی پێ بهێنین.!!

**پرسیار:** بۆچی الله دروستی کردووین؟

**وەڵام:** بۆ (عیبادەت) واتە: بۆ ئەوەی بیپەرستین؟

هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **( ومَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)**الذاریات٥٦، واتە: من جنۆکە و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ بەندایەتی من نەبێ..

**پرسیار:** عیبادەت (العبادة)چییە؟

**وەڵام:** عیبادەت بە مانای ملکەچی و زەلیلی و ژێر دەستەیی دێت کە لەم مانا سەرەکییانەی خوارەوە وەردەگیرێ:

١- **(العَبْدُ)** واتە بەندە.

٢- **(العِبَادَةُ)** واتە گوێڕایەڵی و ملکەچی.

هەروەک خوای گەورە بە هەردوو ماناوە دەفەرموویێ: **(فَقَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ)** المؤمن٤٧، واتە: بێبڕواکان دەیانگوت: چۆن ئێمە بڕوا بە دوو ئادەمیزاد کە(موسى) و(هارون)ن بێنین،کە تیرەی ئەم دوو پیاوە بەندەی ئێمە و گوێڕایەڵ و ملکەچی ئێمەن؟

هەروەها مانای دووەم دەفەرمووێ: **(أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ)** يس.٦٠، واتە: ئایا ئێمە بەڵێنمان لێوەرنەگرتن کە چیتر بە گوێی شەیتان نەکەن، چونکە شەیتان دوژمنی ئاشکرایی ئێوەیە؟

**پرسیار:** جۆرەکانی عیبادەت چین؟

**وەڵام:** سێ جۆر عیبادەت هەن کەوا بریتین لە :عیبادەتی دڵ و ڕەفتار و گوفتار.

**پرسیار:** عیبادەتی دڵ و جۆرەکانی ئەو عیبادەتانەن کە لە ڕێگەی دڵەوە ئەنجام دەدرێن، جۆرەکانی بریتین لە:

**وەڵام:**

١- باوەڕ (الايمان) هەروەک شێخی حسن البصري (رەحمەتی الله تعالى لێبێت) دەفەرمووێ: **(الايمانُ مَا وقرَ في القَلْبِ)** واتە: باوەڕ ئەوەیە کەلە دڵدا جێگیر دەبێت.

٢- خۆشەویستی (المحبة) هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ)** البقرة١٦٥، واتە: ئەوانەی بڕوادارن زیاتر خوایان خۆش دەوێ.

٣- گەڕانەوە لای خوا (الآنابة) هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(وَ أَنِيبُوا إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ)** الزمر٥٤، واتە: بگەڕێنەوە لای خوا و خۆتانی بەدەستەوە بدەن.

٤- پشتی خۆ پێ بەستن (التوكل) هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ)** المائدة٢٣، واتە: پشتی خۆتان بەخوا ببەستن ئەگەر بڕوادارن

٥- ترسان لە خوا (الخشية) هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(فَلَا تَخْشَوُا النَّاسَ وَاخْشَوْنِ)** المائدة٤٤، واتە: لە خەڵکی مەترسن و لە من بترسن.

٦- تەما پێ بوون(الرجاء) هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا) الكهف١١٠**، واتە: هەرکەس بە ئومێدی گەیشتنە بە پەروەردگاری با کردەوەی چاک ئەنجام بدا و هیچ هاوبەشی بۆ بڕیار نەدات.

٧- خواستن (الرغبة) هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَارْغَبْ)** الاشرح٨، واتە: هەر لە پەروەردگارت بخوازە.

**پرسیار:** نیشانەکانی خۆشویستنی خوای گەورە چین؟

**وەڵام:** شتێک کە خوای گەورە پێی خۆش بێ یان خۆشی بوێ تۆش خۆشت بوێ.

یان ڕق لەوە بێ کە خوای گەورە ڕقی لێیەتی و دوورکەوتنەوە لەوانەی کە خوای گەورە نەهی لە کردوون.

دۆستایەتی دۆستانی خوا بکا و دوژمنایەتی دوژمنەکانی بکات و شوێنکەوتەی پێغەمبەری ئازیز ﷺ بێت.

هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِيٌ)** ال عمران٣١، واتە: بڵێ ئەگەر ئێوە خۆتان خۆش دەوێ بەدوای من بکەون.

**پرسیار:** خۆشەویستی (المحبة) دەکرێتە چەند بەش؟

**وەڵام:** خۆشەویستی دەکرێتە چوار بەش کە بریتین لە:

١- ئەو خۆشەویستیەی کە شیرکە، هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ)** البقرة١٦٥، واتە: خەڵکە واهەن کە هاوبەشی زۆر بۆ الله پەیدا دەکەن خۆشیان دەوێن وەک خۆشەویستی الله.

٢- خۆشەویستی ناهەق و ڕق بوونەوەی ناهەق: ئەوەیان ڕەوشتی دووڕووەکانە.

٣- خۆشەویستیەکی زگماکی: ئەوەش بریتیە لە خۆشەویستی ماڵ و سامان و منداڵ، (بەمەرجێ سەرقاڵت نەکات لە خوا پەرستی ئەو دەمە دروستە)

٤- خۆشەویستی خوای گەورە پاشان خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ و پاشان موسڵمانان..

**پرسیار:** عیبادەتی گوفتار(زمان) و جۆرەکانی چین؟

**وەڵام:** ئەو عیبادەتانەی کە لە ڕێگەی گوفتارەوە ئەنجام دەدرێن بریتین لەم جۆرانەی خوارەوە:

١- پاڕانەوە (الدعاء) هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(الدُعَاْء هُوَ العبَاْدَة)**الترمذي واتە: پاڕانەوە خواپەرستییە.

٢- سوێند خواردن(الحلف) هەروەک پێغەمبەری ئازیز ﷺ **(مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ الله فَقَدْ آشْرَكَ)**الترمذي. واتە: هەر کەسێک سوێند بە غەیری الله تعالی بخوات ئەوا هاوبەشی بۆ الله تعالی داناوە.

٣- داوای کۆمەک و یارمەتی کردن (الاستعاثة والاستعانة) هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(وَ اِناَ اِسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِا للّه)**الترمذي واتە: ئەگەر داوای یارمەتیت کرد لە الله تعالی داوا بکە.

**پرسیار:** عیبادەتی ڕەفتار(کردار) و جۆرەکانی چین؟

**وەڵام:** ئەو عیبادەتەیە کە لە ڕێگەی ڕەفتارەوە ئەنجام دەدرێ، بریتیە لەم جۆرانەی خوارەوە:

١- نوێژ) الصلاة:(هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(يَاأَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا)** الحج٧٧، واتە: ئەی بڕوادارینە کڕنوش و سوژدە بۆ الله بەن (واتە:نوێژ بکەن)

٢- بەڕۆژوو بوون (الصوم) هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ)** البقرة١٨٣، واتە: ڕۆژووم لەسەر فەرز کردوون.

٣- سوڕانەوە (الطواف) هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ )**الحج٢٩،واتە: با بە دەوری ڕووگە (كعبة) بسوڕێنەوە.

٤- قوربانیدان: هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(لَعَنَ الله منْ ذبَحَ لِغَيْر اللّهِ )**رواه المسلم.

واتە: نەفرەت و دووربێ لە ڕەحمی الله ئەوەی قوربانی بۆ غەیری الله دەکات.

٥- جیهاد و خەباتی چەکدارانە: هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ)** الحج٧٨، واتە: جیهاد بکەن لە پێناو الله تعالی و هەقی خۆی پێ بدەن.

٦- ماچ کردنی بەردە ڕەشەکە(الحجر الأسود) واتە: دروست نییە هیچ شتێک ماچ بکرێ و ناوی بە گەورە دانا (تعظیم) غەیری بەردە ڕەشەکە.

٧- لە خۆگرتن(نذر) هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(وَ مَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ نَفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُمْ مِنْ نَذْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُهُ) البقره ٢٧٠** واتە: هەرشتێک ببەخشن یان لە خۆتانی بگرن ئەوا خوای گەورە پێی ئاگادارە.کەواتە بۆ غەیری الله دروست نییە هیچ شتێک لە خۆت بگریت.

**پرسیار:** لەخۆ گرتن(نذر) چییە؟

**وەڵام:** وەکو ئەوەی بڵێی ئەگەر ئەم کارەم بۆ سەر بگرێ من بەرانێک لە بن پێی فلا کەس سەر دەبڕم، ئەمەیان دروست نییە، بەڵام ئەگەر بڵێی گەر ئەم شتەم بۆ چاک بێ ئەوا هەموو ساڵ بەرانێک دەکەمە خێر، ئەوە ئەم لەخۆگرتنە دروستە، بەمەرجێ کارەکەی بۆ الله تعالى بێت.

**پرسیار:** ئایا الله بۆ چیتری دروست کردووین؟

وەڵام: بۆ ئەوەی ببین بە جێنشینی (خليفة)ی خوا، هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاء الْأَرْضِ)** النمل٦٢،واتە :ئێوەمان کردۆتە جێنشین لەسەر زەوی.

**پرسیار:** ئایا هەموو کەس بە جێنشین دەشێت؟چۆن دەتوانین بە کاری جێ نشینی هەڵبستین؟

**وەڵام:** نەخێر.. هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ)**البقرة١٢٤،واتە: زۆرداران بەر پەیمانی جێنشینی ناکەون، وە بە خواپەرستی دەتوانین بەکاری جێنشینی هەڵبستین واتە بۆ ئەوەی بسەلمێنین کە جێنشینین ئەوا دەبێ بسەلمێنین کە خوا پەرستین.

**پرسیار:** چۆن دەسەلمێنین کە خواپەرستین؟

**وەڵام:** ئەگەر الله لە کارەکانمان ڕازی بێت.

**پرسیار:** چۆن الله لە کارەکانمان ڕازی دەبێت؟

وەڵام: ئەگەر کارەکانمان لەسەر سێ بنچینە ئەنجام بدرێ کە ئەمانەی خوارەوەن:

١- نیەت و ئیمان :واتە کارەکانمان لەسەر بنچینەی نیەت و باوەڕ (النية والأيمان) ئەنجام بدرێ هەر کارێک بکەی ئەگەر چاکیش بێت، ئەگەر بە نیەتێکی پاک و لەسەر بنچینەی باوەڕەوە ئەنجام نەدرێ، ئەوا پۆلێکی قەڵپ ناهێنێ هەروەک پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: **(انمَا الأعْمَالُ بِألْنيات)**مسلم، واتە: هەموو کردەوەیەک بە نیەت ئەنجام دەدرێ.

٢- خۆ یەکلاکردنەوە بۆ الله (الاخلاص) هەر کار و کردەوەیەک کە ئەنجام دەدرێ دەبێ ئەو کارە بۆ الله بەرێ بکرێ ..هەروەک الله دەفەرمووێ: **(فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ)**الزمر٢، واتە: الله ی خۆت بپەرستە بەشێوەیەک ملکەچیت هەر بۆ ئەو بێت.

٣- کارەکە لەسەر ڕێو شوێنی پێغەمبەر ﷺ ئەنجام بدرێ (الصواب) پێغەمبەری پێشەوا ﷺ بۆ ئێمە پێشەوا و سەرقافڵەیە بۆیە پێویستە لە کاری ڕۆژانەماندا شوێن پێی ئەو بکەوین، هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(مَنْ عَمَلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيهً أمْرُنَا فَهُوَ رَدُ) مسلم،** واتە: هەرکەسێک کارێک بکات ئەگەر لەسەر ڕێی و شوێنی ئێمە نەبێت ئەوا لێی وەرناگیرێت.

**پرسیار:** چۆن الله تعالى بپەرستین؟

**وەڵام:** بەم شێوەیەی کە پێغەمبەر ﷺ فێری کردووین بە گوێڕایەڵ بوونی الله تعالى پاشان پێغەمبەر ﷺ هەروەک وا فەرمانمان پێدەکات، الله تعالى دەفەرمووێ: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ)** محمد٣٣، واتە: ئەی بڕوادارینە، گوێڕایەڵی الله پاشان پێغەمبەر ﷺ بن و کارەکانتان(بە شتی خراپ) پووچ مەکەنەوە.

**پرسیار:** چاکە (الاحسان) لە خواپەرستی(عبادة)دا چییە؟:

**وەڵام:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **( الإحْسَانُ أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأنَكَ تَراهُ، فَإنْ لَمْ تَكُنْ تَراهُ فَإنَّهُ يَراْكَ)** مسلم،واتە: ئیحسان ئەوەیە کە خوای خۆت وا بپەرستی وەکو ئەوەی کە ببینی، ئەگەر تۆش ئەو نەبینی ئەوا ئەو تۆ دەبینێ.

واتە هەمووکات هەست بەچاودێری الله بکەی بەسەر خۆتەوە، ئەگەر هەستیش نەکەی ئەوا الله خۆی بینەرە بەهەموو شتێک..

**پرسیار:** چۆن لە (لا اله الا الله) دەگەیت؟

**وەڵام:** زۆربەی زانایان لەسەر ئەوە ڕێک کەوتون کەوا (لا اله الا الله) واتە: لا معبود بحق الا (الله) واتە: هیچ پەرستراوێک نییە تەنها خوا نەبێ.

هیچ کەس دەسەڵاتی بەسەر کەسی دیکەدا نییە،چونکە دەسەڵات گشتی لای خوایە.

**پرسیار:** پایە (ركن)ەكانی (لا اله الا الله)چین؟

**وەڵام:** (لا اله الا الله)دوو پایەی گرنگی هەیە:

**یەكەم:** لادان (نفي)واتە ڕەتكردنەوەی واتە دەبێ هەموو ئەو خوا باتل و پوچانە ڕەتبكەیتەوە و كافربی پێیان وەكو:

أ- هەموو ئەو كەسانەی كە حوكم بە قورئان ناكەن (ألِهَ).

ب- هەموو ئەو كەسانەی كە خۆیان بە پەروەردگار(رَبَ) دەزانن.

ج- هەموو ئەو كەسانەی كە بەقەد الله خۆش دەویسترێن و كراون بە هاوبەش(نِدْ) بۆ خوای گەورە.

د- هەموو ئەو كەسانەی كەلە سنووری خۆیان دەردەچن و تاغوتن.

**دووەم:** دواتر باوەڕ هێنان و دانان (أثبات) واتە دانانی خوای گەورە لە جێگەی هەموو خوا باتلەكان و ئەوانەی سەرەوە.

**پرسیار:** گرنگی (لا اله الا الله) چییە؟

**وەڵام:**

١- ڕزگار كردنی خەڵكی لە بەندایەتی خەڵكی بۆ بەندایەتی الله تعالى.

٢- پیس و پاكی پێ جیا دەبێتەوە.

٣ - دڵ و دەروونی پێ ئاسوودە دەبێ.

٤- ئادەمیزاد دەزانێ بەرنامەی خۆی لە كێ وەردەگرێ.

**پرسیار:** مەرجەكانی قبووڵ بوونی ( لا اله الا الله)چیین؟

**وەڵام:**

١- زانین بە مانای (لا اله الا الله) هەروەك الله تعالى دەفەرمووێ: **(فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ)** محمد ١٩، واتە: بزانە كە غەیری الله كەس شایەنی پەرستن نییە .

٢- دڵنیایی (الیقین) واتە: دڵنیا بیت لە تاك و تەنیایی الله، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(أشهَدُ أَنْ لاَ الَهَ الله وَ أنِي رَسولُ الله لا يَلْقي اللهُ بِهمَا عَبْدٌ غيرُ شاكٌ فيهِماَ الاَ دَخَل الجَنَة)**رواه مسلم، واتە: شایەدی دەدەم كە الله تەنیایە و هیچ هاوبەشی نییە و منیش ڕەوانە كراوی الله م هەركەسێ باوەڕی پێیان هەبێ و بێ گومان بێت ئەوە دەچێتە بەهەشت.

٣- خۆیەکلاکردنەوە بۆ الله (الأخلاص) پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(قال رسول الله ﷺ أسعدُ النّاسِ بِشَفاعَتِي يَومَ القِيامَةِ مَن قال :لا إله إلاّ اللّهُ خالِصاً مُخلِصاً من قَلبِهِ آو نَفْسِهِ)**البخاري، واتە: بەختەوەرترین کەس لە ڕۆژی دوایی بە تکاکردنی من کەسێکە کە بە پاک و خاوێنی دڵ و خۆیەکلایی کردنەوەی نەفسی بڵێت: (لا الا الا الله).

٤- خۆشویستن (المحبة) واتە: ئەو الله تعالی لە هەموو کەس خۆشتر بوێ، بۆیە کاتێك کە الله باسی بڕواداران دەکات دەفەرمووێ: **(وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ)** البقرة١٦٥، واتە: بڕواداران الله یان لە هەموو شت خۆشتر دەوێ.

٥- ڕاست کردن(الصدق) دوور بێ کە درۆکردن و سڵ کردن لە دووڕوویی، هەروەک پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(مَا مِنْ أحَدٍ يَشْهَدُ أنْ لاَ اله الا الله وَأنَّ محمَداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ صِدْقاً مِنْ قَلْبِهِ الاَّ حَرمَهُ اللهُ عَلىَ النَّار)** البخاري،واتە :هیچ کەسێک نییە بەڕاستی بڵێ (لا الا الا الله محمد رسول الله) ئەوە الله ئاگری دۆزەخی لێ قەدەغە دەکات.

٦- ملکەچی کردن (الأنقیاد) بۆ فەرمانەکانی الله تعالی، هەروەک الله تعالی دەفەرمووێ: **(وَ أَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَه)**الزمر٥٤، واتە: بگەڕێنەوە لای الله و خۆتانی بەدەستەوە بدەن.

٧- وەرگرتنی(القبول)(لا اله الا الله) وەکو بەرنامەی ژیان، هەروەوک الله تعالی لە پێناس کردنی بێ بڕواکان دەفەرمووێ: **(إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ)**الصافات٣٥ واتە: کاتێ کە پێیان دەگوترێ ( لە غەیری الله کەس شیاوی پەرستن نییە) وەری ناگرن و خۆیان بە زل و گەورە دەزانن...

**پرسیار:** دژەکانی (لا اله الا الله)(نواقض لا اله الا الله) چین؟ یان بەچی(لا اله الا الله) هەڵدەوەشێتەوە؟

**وەڵام:** بە چوار شت:

١- کوفر

٢- شرک

٣- نیفاق

٤- تاغوت

**پرسیار:** کوفری گەورە و جۆرەکانی چین؟

**وەڵام:** کوفری گەورە ئەو کوفرەیە کە بەئەنجامدانی لە ئاینی ئیسلام پێی دەردەچیت، جۆرەکانیشی بریتین لە:

١- کوفری بە درۆخستن (كفر التكذيب) واته بە درۆخستنەوەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری ئازیز ﷺ هەروەک الله تعالی دەفەرمووێ: **(وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ)** العنكبوت٦٨، واتە: کێ لەو کەسە زۆردارترە کە بە درۆ بوختانن بە خوا هەڵبەستێ و دینی خوا بەدرۆ بخاتەوە دوای ئەوەی کە بۆیان هات؟

٢- کوفری خۆ بەگەورە زانین (الاناء والأستكبار) وەک ئەو کوفرەی کە ئیبلیسی نەگریس (شیطان) کردی هەروەک قورئان دەفەرمووێ: **(وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ)** البقرة٣٤، واتە: بە فریشتەکانمان وت کە سوژدە بۆ ئادەم ببەن، ئەوانیش سوژدەیان برد، تەنها ئیبلیش نەبێ خۆی بە گەورە زانی و کافر بوو.

٣- کوفری گومان بردن بە ڕۆژی دوایی( كفر الشك يوم القيامة) هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(يَسْأَلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَٰمَةِ)** القيامة٦، واتە: بێ بڕواکان بەگاڵتەوە دەیان گوت:کەی ڕۆژی دوایی دادێ گەر ڕاست دەکەن واتە گومانیان لە هاتنی ڕۆژی دوایی هەبوو.

٤- کوفری پشت گوێخستن(كفر الأعراض) لە وەرگرتنی ئیسلام، هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ)** الأحقاف٣.واتە :کافر و بێ بڕواکان کەڵلەڕەقن بەو ترسەی کەلە قورئان دەیاندرێتێ.

٥- کوفری دووڕوویی(كفر النفاق) نیفاق واتە بە زمان خۆت بە موسڵمان دابنێیت و لە دڵەوە دژی ئاینی ئیسلام بیت، هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ)** المنافقون٣، واتە:لەبەر ئەوەی ئەوان باوەڕیان هێنا و پاشان کافر بوون ئینجا ئێمەش مۆری خۆمان بە دڵیانا وەنا بێ ئەوەی کە هەست بکەن.

٦- کوفری دڵڕەقی (كفر الجحود) ئەمە ئەو کوفرەیە کە دان نەنێیت بە ڕوکنەکانی ئیسلام و ئیمان، هەروەک خوای گەورە دەفەرمووێ: **(وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الْكَافِرُونَ)** العنكبوت٤٧، واتە: هیچ کەس بە ئایەتەکانی ئێمە دڵڕەق نییە تەنها کافرەکان نەبێ.

**پرسیار:** کوفری بچووک و جۆرەکانی چین؟

**وەڵام:** کوفری بچووک ئەو کوفرەیە کە بە ئەنجامدانی پێی لە ئیسلام دەرناچیت، جۆرەکانی بریتین لە:

١- کوفر بە نیعمەتەکانی الله (كفر النعمة) بچوکترین نیعمەت شوکری لەسەر پێویستە، هەروەک الله تعالی دەفەرمووێ: **(وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ)** ابراهيم٧، واتە: پەروردگاری ئێوە بانگی ڕاهێشتووو کە ئەگەر شوکری نیعمەتەکانی الله بکەن ئەوا الله نیعمەتەکانتان بۆ زیاد دەکات، بەڵام ئەگەر کوفری لەسەر بکەن ئەو دەمە سزای الله زۆر توند و تیژە بۆ ئەو کەسە .

٢- کوفری ڕەفتار(كفر العملي): بریتیە لە هەموو کارێک کە پێی یاخی بیت، وەکو جوێن دان یان شەڕکردن لەگەڵ بڕواداران یان زیناکردن یان ئارەق خواردنەوە...هتد، ئەم جۆرە کوفرە پێی لە ئیسلام دەرناچیت، چونکە کوفری بیرو باوەڕ(أعتقاد)نییە، هەروەک پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(سَبابُ السُلْم فُسُق وقتالُهُ كُفره)** رواه مسلم. واتە: جوێن دان بە موسڵمان لە ئاین دەرچوونە و شەڕکردنیش لەگەڵیان کافر بوونە. یان دەفەرمووێ: **(لا يَزْني الزْ اني جينَ يَزْني وهُوَ مؤمِنْ...)** واتە: زیناکەر لە کاتی زیناکەیدا بڕوادار نییە.

**پرسیار:** دووڕوویی(النفاق)و جۆرەکانی چین؟

**وەڵام:** زاراوەی(النفاق) لە بنچینەوەلە (نَفَقْ) هاتووە واتە کاری ژێر زەمینی، بەو کەسانە دەوترێ (منافق)کە لەسەرەوە خۆیان بە موسڵمان دادەنێن و لەژێرەوەش بێبڕوان، ئەمەیان دوو جۆری هەیە کە بریتین لە دووڕووی هەرە گەورە (النفاق الأكبر) و دووڕوویی هەرە بچووک (النفاق الأصغر).

**پرسیار:** دووڕوویی هەرە گەورە(النفاق الاكبر)یان(النفاق الاعتقادي)و جۆرەکانی چین؟

**وەڵام:** ئەو جۆرەیە کە ئادەمیزاد پێی لە ئیسلام دەردەچێت، چونکە بە دڵ کافر و بە ڕواڵەت موسڵمانە. جۆرەکانیشی بریتین لە:

١) بەدرۆخستنی پێغەمبەر ﷺ و ئەو هەواڵانەی کە باسی کردوون.

٢) بوغزاندنی پێغەمبەر ﷺ ئەو شتانەی کە باسی کردوون.

٣) دڵخۆش بوون بە شکستی ئیسلام و موسڵمانان و ڕق هەڵسانبە سەرکەوتنی ئیسلام و موسڵمانان.

**پرسیار:** دووڕوویی هەرە بچووک(النفاق الأصغر) یان(النفاق العملي)و جۆرەکانی چین؟

**وەڵام:** ئەو جۆرەیە کە بەئەنجام دانی لە ئیسلام دەرناچیت، چونکە بە دڵ موسڵمانە و بەڵام کرداری مونافیقی هەیە، جۆرەکانیشی بریتین لە:

١)درۆکردن.

٢)بەڵێن شکاندن.

٣)خیانەت کردن لە ڕاسپاردە.

٤)پەیمان شکاندن.

٥)کێشە گەورە کردن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(أيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ)** متفق عليه. واتە: نیشانەی دووڕووان سێ شتن:درۆ دەکات لە کاتی قسەکردنا،وەکاتێ کە بەڵێن دەدات نایگەیەنێتە جێ، وەکاتێ کە ڕاسپاردەی لادادەنێ دەست کاری دەکات...

هەروەها دەفەرمووێ: **(أَرْبَعٌ مَن كُنَّ فيه كانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، وَمَن كَانَتْ فيه خَلَّةٌ منهنَّ كَانَتْ فيه خَلَّةٌ مِن نِفَاقٍ حتَّى يَدَعَهَا: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وإِذَا عَاهَدَ غدَرَ، وإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ)**متفق عليه.

واتە: چوار شت هەن کەلە هەرکەسێکدا بن ئەوا دەبێتە دووڕوو، هەرکەسێک یەک لەم خەسڵەتانەی تێدا بێ ئەوا خەسڵەتێکی دووڕووی تیا هاتۆتە دی،تائەودەمەی کە ئەو خەسڵەتەی لە خۆی دادەماڵێ.

(ئەویش) ئەوەیە کاتێ کە قسە دەکات درۆ دەکات.کاتێ کەبەڵێن دەدات دەیشکێنێ و کاتێ کە پەیمان دەدات بەجێی ناگەیەنێ وە کاتێ کە دووچاری کێشەیەک دەبێ پەنا بۆ قسەی ناشرین دەبات.

**پرسیار:** ئایا لە حوکمی ئیسلامدا کافر خراپترن یان دووڕوو؟

**وەڵام:** دووڕوو خراپترن هەروەک الله تعالی دەفەرمووێ: **(إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِوَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا)** النساء١٤٥. واتە: بێگومان دووڕووەکان شوێنی هەرە بنەوەی ئاگری دۆزەخیان بەردەکەوێ.

کافرەکان بە ئاشکرا کافرن بەڵام دووڕوەکان وانین لە دڵەوە شاردوویانەتەوە..

**پرسیار:** تاغوت کێیە و کێ بە تاغوت دەزانی؟

**وەڵام:** تاغوت(الطاغوت) لە بنچینەوە لە(طَغَىَ)هاتووە کە بەمانای (لەحەددی خۆ دەرچوون)دێت، هەروەک الله دەفەرمووێ: **(إِنَّا لَمَّا طَغَى الْمَاءُ حَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ)** الحاقة١١، واتە: کاتێ کە ئاوەکە لە حەددی خۆی زیاتر بوو، ئێوەمان لە کەشتیەکە بەرز کردەوە.

هەروەها زۆر جۆرە تاغوت هەن کەسەرەکیترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١)شەیتان: هەروەک الله دەفەرمووێ: (إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا) فاطر٦، واته: بێگومان شەیتان دوژمنی ئێوەیە دەئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن.

٢)ئەو فەرمانڕەوایەی کە حوکمی الله دەگۆڕێ، هەروەک ئەوانەی دەستووری دژ بە ئیسلام دادەنێن، بۆیە الله دەفەرمووێ: (أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ)الشورى٢١، واته: ئایا ئەوان شەریکێکیان هەیە لەگەڵ الله تاکو شەریعەت و بەرنامەیان بۆ دابنێ،کە خوای گەورە ڕێی پێ نەدابێ.

٣)ئەو فەرمانڕەوایەی کە حوکم بە قورئان ناکات، هەروەک الله دەفەرمووێ: (وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ)المائدة٤٤، واته: ئەو کەسەی کە حوکم بە قورئان نەکات ئەوانە کافر و بێ بڕوان.

٤)ئەو کەسەی کە خۆی بە خوا دادەنێت، هەروەک الله دەفەرمووێ: (وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ...)الأنبياء٢٩،واته: هەرکەسێک لەوان بڵێت من خوام جگە لە الله ی ڕاستەقینە ئەوا ئێمە پاداشتی بە ئاگری دۆزەخ دەدەینەوە.

٥)ئەو کەسەی دەڵێ من غەیب دەزانم: هەروەک الله دەفەرمووێ: (قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ)النمل٦٥،واته: هەرچی کەس کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەن شارەزای غەیب نین تەنها الله نەبێ.

**پرسیار:** شرک و جۆرەکان چین؟

**وەڵام:** (شرک)واته:هاوبەش بڕیاردان بۆ الله، ئینجا داوای لێ بکەیت و بیپەرستیت.

دوو جۆریشی هەن کە بریتین لە شرکی هەرە گەورە(شرک الاكبر)و شرکی هەرە بچووک(شرک الاصغر).

**پرسیار:** شیرکی هەرە گەورە و جۆرەکانی ئەو شیرکەیە کە بەئەنجامدانی لە ئیسلام دەچیتە دەر، کەبریتین لە:

**وەڵام:**

١)شیرکی پاڕانەوە( شرك الدعاء):واته پاڕانەوە لە پێغەمبەران و پیاو چاکان بۆ وەرگرتنی ڕۆزی و شەفاعەت و چابوونەوە لە نەخۆشی، هەروەک الله فەرمانمان پێ دەکات و دەفەرمووێ: (وَلَا تَدْعُ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنْفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِنْ فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِنَ الظَّالِمِينَ)يونس١٠٦، واته: لەغەیری الله مەپاڕێرەوە کە هیچ سوود و زیانیان بەدەست نییە بۆ تۆ، ئەگەر وات کرد ئەوە بەڕاستی تۆ هاوبەشت بۆ الله بڕیار داوە چونکە(ظلم)لێرە بەمانای (شرک) دێت.

٢)شیرک لە سیفەتەکانی الله: واتە: بڕوات وابێ کە پێغەمبەران و پیاو چاکان (علمي غيب )یان هەیە، بۆیە الله دەفەرمووێ: **(وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ)** الانعام٥٩، واتە: زانینی غەیب تەنها لەلای الله یە، غەیری ئەو هیچ کەسی تر نازانێ.

شایەنی باسە کارە موعجیزەکانی پێغەمبەران و کەرامەتی دۆستانی الله ش غەیب زانین نییە.

بەڵکو تێگەیاندنی الله یە لەڕێگەی وەحی یان خستنە ناو دڵەوە بۆ پێغەمبەران و خستنە ناو دڵی دۆستانەوە.

واتە ئەوانیش بەدەست خۆیان نییە، ئەو زانینە ئەوە نەبێ هەرکات ئارەزوو بکەن بۆیان بکرێت.

داستانی وونبوونی وشترەکەی پێغەمبەر ﷺ ڕاستی ئەو قسەیە دەسەلمێنێ.

ئەوەتە پێغەمبەر (یعقوب) لە نزیک خۆی نەیزانی چی لەگەڵ یوسف کراوە بەڵام پاش دەیان ساڵ لە میسرەوە بۆ کەنعان دەیفەرموو:**( إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلَا أَن تُفَنِّدُونِ)** یوسف٩٤، واتە: من بۆنی (یوسف)دەکەم، وادەزانم فێڵ و فڕیان هەڵوەشایەوە(مەبەست لە کوڕەکانیەتی).

٣)شیرکی خۆشەویستی(شرك المحبة): واتە: خۆشەویستی یەکێک یان پیاو چاکێک بەقەد الله هەروەک الله تعالی دەفەرمووێ: **(وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ)** البقرة١٦٥، واتە: خەڵکی واهەن غەیری الله دەپەرستن و بەقەد الله خۆشیان دەوێن، بەڵام بڕواداران الله یان لەهەموو کەس زیاتر خۆش دەوێ.

٤)شیرکی گوێڕایەڵی (شرك الطاعة): واتە: گوێڕایەڵی کردنی زانایان و پیاو چاکان لەکاتی یاخی بوونیان، ئەمەش دروست نییە بۆ هیچ کەسێک کە بەگوێی کەسێک بکات کەوا ئەم کەسە لە الله پاسان پێغەمبەرەکەی یاخی بووبێت بۆیە پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(لا طَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الْخَالِقِ)**رواه الأمام أحمد.

واتە: گوێڕایەڵی هیچ کەسێک ناکرێ کە ئەو کەسە لە الله یاخی بوبێت بەڵکو **(إنَمَا الطاعَةُ في المَعرُوفِ)** واتە: گوێڕایەڵی لە شتی چاکەدا دەکرێ.

٥)شیرکی الله خستنە ناو قاوغی دروستکراوەکانی(شرک الخلول ووحدة الوجود) واتە: وابزانی الله خۆی دەخاتە بچمی دروستکراوەکانی خۆی.

ئەمەش بریتیە لە بیروباوەڕی(ابن عربي الصوفي) کە لە (دمشق) لەگۆڕایە کە دەڵێ: **(الربُ عَبدٌ،والعَبدُ رَبٌ، يَالَيتَ شِعري مَنْ المكَلَف)** واتە: پەروەردگار بەندەیە، بەندەش پەروەردگارە، ئایا ئەو کاتە کێ تەکلیف بارە؟ یان سۆفیەکی تر دەڵێ: **(وَمَا الكَلْبُ وَالخِنزيرُ الّا الهُنا،وَمَا اللهُ الا راهِبٌ في كَنيسةِ)** ،واتە: سەگ و بەراز خوای ئێمەن، بەڵام هەرچی خوایە لەناو کڵێسا گۆشەگیر بووە.(نعوذ باللّه).

٦)شیرکی ڕەفتار(التصرف):

ئەم شیرکە بریتیە لە باوەڕ بوون بەوەی هەندێک لەپیاو چاکان دەستیان هەیە لە هەڵسوڕاندنی کاروباری گەردوون(الکون). بەڵام الله دەفەرمووێ:**( وَمَن يُدَبِّرُ الْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ)**یونس٣١، واتە: کێ کاروبار هەڵدەسوڕێنێ؟ دەڵێن: الله.

٧)شیرکی ترسان(الخوف):ئەمەشیان بریتیە لە باوەڕبوون بەوەی کە هەندێک لە پیاو چاکە مردووەکان هۆکارن بۆ ترساندنی خەڵکی.

بۆیە قورئان ئاگادارمان دەکاتەوە و دەفەرمووێ: **(أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِينَ مِن دُونِهِ)**الزمر٣٦

واتە: ئایا خوا بەس نییە بۆ بەندەکانی خۆی، ئایا تۆ دەترسێنن بەغەیری الله؟

٨)شیرکی فەرمانڕەوایی(الحاکمیة): ئەمەیان بریتیە لەو کەسەی کە دەستوور و بەرنامە یاسا دادەنێت وەکو عەلمانی و دیموکراسی دژ بەیاساکانی ئیسلام....

هەرکەسێکیش بەگوێیان بکات ئەمیش دووچاری شرک دەبێت پەنا بە الله تعالی.

**پرسیار:** زیانەکانی شیرکی هەرە گەورە چین؟

**وەڵام:** دەبێتە هۆی ڕووخاندنی کردەوەی چاک:

هەروەک اللّە دەفەرمووێ: **(لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ)**الزمر٦٥،واتە: ئەگەر تۆ شیرکت بڕیار دا ئەوا کردارەکانت پووچ دەبێتەوە.

اللّە لە شیرکی گەورە خۆش نابێت، تەنها بە تۆبەکردن نەبێ، هەروەک اللّە دەفەرمووێ: **(إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا)**النساء١١٦،واتە: الله لەو کەسانە خۆش نابێ کە هاوبەشیان بۆ بڕیار دابێ، بەڵام جگە لەوە خۆش دەبێ، هەرکەس هاوبەش بۆ الله بڕیار بدات ئەوا لەناو گومڕاییدا ڕۆچووە.

**پرسیار:** شیرکی هەره بچووک و جۆرەکانی چین؟

**وەڵام:** ئەم جۆره شیرکەیە کە ئادەمیزاد پێی لە ئیسلام دەرناچێت، بەڵام بەگوناهی گەوره (الكبائر)دادەنرێ کە بریتین لە:

١)ڕووپامایی(الرياء): واته ئەنجامدانی کارێکە بۆئەوەی خەڵک بەهۆیەوە بیناسێ، واته ئەگەر کارەکەت بۆ الله تعالی نەبێ ئەو دەمە پێی دەگوترێ ڕووپامایی(الرياء)لەکارەکانی دا کردووە، هەروەک پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(إنْ أخوفَ مَا أخافُ عَليكمْ الشِركُ الأصغَر:الرياءُ،يقولُ الله يَومَ القيامَةِ انَا جَزيَ الناسُ بأعْمالهم:أذْهَبوُا الى الذينَ كُنتُم تُراُونَ في الدُنيا فَانْظروا عَنْ تَجدونَ عندَهُمْ جَزاءَ)**صحيح رواه الامام أحمد.واته: گەورەترین شت کەبەهۆیەوە لێیان بترسم شیرکی بچووک(الرياء)ە بۆیە ڕۆژی دوایی اللّه لەکاتی پاداشت دانەوەی خەڵکیدا دەفەرمووێ: بڕۆنە لای ئەو کەسانەی کەکارەکانتان بۆ ئەوان دەکرد،دیقەت بدەن ئایا پاداشتان پێ دەدەن؟

٢)سوێند خواردن به غەیری الله پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(مَنْ حَلَفَ بِغَيرِ اللهِ فَقَدْ كَفَرَ أو أشْرَكَ)**صحيح رواه أحمد، واته: هەرکەسێک سوێند بەغەیری خوا بخوات ئەوا هاوبەشی بۆ خوا بڕیار داوه، بەڵام هەندێ جار سوێندەکەی لێدەبێتە شیرکی گەوره گەر وابزانێ کە ئەم کەسەی سوێندی پێ دەخوات بەدرۆ بێت، توشی ناخۆشی و دەردە سەری دەبێت.

٣)شیرکی شاراوه(شرك المخفي): شیرکی شاراوه دەربڕینی وشەیەکە کە زۆر شاراوه و پەنهانە کەچی بەشیرک بۆت حسێب دەکرێ...

بۆ نموونە: ئەگەر بڵێی: ئەگەر لەبەر خوا و فلانە کەس نەبوایە، بەکارهێنانی پیتی(و)ەکە بۆت دەبێتە شیرک... هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(لا تَقولو ماشَاءَ الله وشاءَ فُلانَ,ولكنْ قوُلُوا مَاشاء الله ثُمَ شاءَ فُلانْ)** صحيح رواه الأمام أحمد، واته: مەڵێ الله و فلانە کەس دەیانویست، بەڵکو بڵێ الله پاشان فلان کەس دەیویست چونکە بەبەکارهێنانی پیتی(و)لەم شوێنەدا بەوە حسێب دەکرێ کە تۆ فلان کەست وەکو الله حسێب کردووه.

**پرسیار:** ئەو شیرکە ڕوواڵەتیانە چین کە لە نێو کۆمەڵگەدا بڵاون؟

**وەڵام:** ئەمڕۆ لە جیهاندا زۆر جۆر شیرک هەن کە هەندێکیان لەوانە بریتین لە:

١)پاڕانەوە لەغەیری الله (لەپێشدا باسمان کردووە).

٢)گۆڕی پیاو چاکان بکرێت بە پەرستگا:لە زۆربەی وڵاتان پیاو چاکان لە مزگەوت بە خاک دەسپێرێن، ئەمەشیان بە (شیرک)حسێب دەکرێت،بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(لَعنةُ اللهِ على اليَهودُ والنَصارى اتّخَذوا قُبورَ أنبيائِهم مَساجِدْ)** متفق عليه.واتە: نەفرەتی الله لە جولەکە و دیانەکان بوو بەوەی کە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردە پەرستگا،واتە: ئەگەر دروست نەبێ گۆڕی پێغەمبەران بکرێتە پەرستگا ئەی چۆن بۆ پیاو چاکان دروستە؟

٣)لەخۆگرتن بۆ پیاو چاکان(لەپێشدا باسمان کرد)

٤)قوربانی سەربڕین بۆ گۆڕی پێغەمبەران و پیاو چاکان، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **( لَعَنَ اللهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللهِ )** رواه مسلم، واتە: نەفرەتی الله لەوکەسە بێ کە قوربانی بۆ غەیری الله تعالی سەردەبڕێ.

٥)سوڕانەوە بەدەوری گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاکان لەبەر گەورەیی ئەوان: چونکە سوڕانەوە عیبادەتە ئەمەش دروست نییە بۆ غەیری(كعبة)ئەنجام بدرێ، بۆیە الله تعالی دەفەرمووێ: **(وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ)** الحج٢٩، واتە: بابەدەوری کەعبەدا بسوڕێنەوە.

٦) نوێژ کردن ڕووە و گۆڕ کەحەرامە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ:**( لَا تَجْلِسُوا عَلَى الْقُبُورِ، وَلَا تُصَلُّوا إِلَيْهَا)** رواه مسلم، واتە: لەسەر گۆڕ دامەنیشن و نوێژی بەرامبەر مەکەن.

٧)گەشت کردن بۆ شوێنێک بەناوی پیرۆزی: ئەمەش دروست نییە هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَّا إِلَى ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ: الْمَسْجِدِ الحَرَامِ، وَمَسْجِدِ الرَّسُولِ، وَمَسْجِدِ الأَقْصَى)** متفق عليه، واتە: سەردانی هیچ شوێنێک ناکرێ بەنیەتی پیرۆزی تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێ کەبریتین لە:(مسجد الحرام)لە مەککە و مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ و(بيت المقدس) لە قودس.

٨)حوکم کردن بە غەیری قورئان:(لەپێشدا باس کرد).

٩)گوێڕایەڵی فەرمانی خوانەناس:(لەپێشدا باس کراوە).

١٠)پەت کردنە دەست: ڕۆژێک پێغەمبەر ﷺ چاوی کەوت بەیەکێک کە پەتی لەدەستی خۆی ئاڵاندبوو لەبەر لاوازی، ئەویش پێی گوت: **(أما إنها لا تزيدك إلا وهناً، انبذها عنك، فإنك إن مت وهي عليك وُكِلتَ إليها)** رواه الاحمد. واتە: ئەم پەت لەدەستکردنەت لاوازیت زیاد دەکات، جا فڕێیدە چونکە ئەگەر بمریت و ئەمەت لەدەستا بێت بەهیچ جۆرێک ڕزگارت نابێت لە (ئاگر).

١١) هەڵواسینی مۆروو(التمائم)بۆ لابردنی دەرد و نەخۆشی: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(مَنْ تَعلق تَميمَةً فَقدْ أشْركَ)** الامام أحمد. واتە: هەرکەسێك مۆروو هەڵبواسێ ئەوە هاوبەشی بۆ الله بڕیارداوە.

١٢) نوشتەی ناشەرعی(الرقَى): بریتیە لە چەند ووشەیەک کە لەسەردەمی نەفامی دەیانووسی بەمەبەستی لابردنی دەرد و بەڵا و نەخۆشی، هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(انَ الرَقَى والتَمائِمْ والتَولَةَ شرْكٌ)** رواه احمد و ابو داود. واتە: بێگومان هەڵواسینی مۆروو و نوشتەی ڕەش و سپی هاوبەش دانانە بۆ الله.

بەڵام (سیو طي)دەربارەی نوشتەی شەرعی دەڵێ:هەندێک لەزانایان دەڵێن:نوشتە بە چوار مەرج شەرعیە یان حەڵاڵە:

أ)بە ئایەتەکانی قورئان یان ناوەکانی خوا یان سیفەتەکانی خوا بێت.

ب)بە زمانی عەرەبی بێت و مانا بدات.

ج) بڕواشت وابێت نوشتە هیچ سوودی نییە،بەڵکو هەموو شت لەژێر ویستی الله یە.

د)دەبێ ئەم نوشتەیە لە جێگایەکی پاکدا و کابرا لەش پیس نەبێ ئەو دەمە ئەو نوشتەیە بە حەڵاڵ دادەنرێت.

١٣) جادوو(السحر): جادوو بە هەموو جۆرەکانیەوە هەروەکو شیرکە چونکە پشت بەستنە بە جنۆکە و شەیتان و ئەستێرە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(مَنْ عَقَدعُقدَةً ثُمَ نَفثَ فيها فَقَدْ سَحَرَ وَمَنْ سَحَرَ فَقَدْ أشركٌ)** رواه احمد. واتە: هەرکەسێک گرێیەک لێ بدات و پاشان فووی پیا بکات ئەوە جادووی کردووە، هەر کەسێکیش سیحر بکات ئەوە تووشی کوفر بووە.

هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموون: سزای جادووکەر کوشتنە، هەروەک (بەجالەی کوڕی عەبدە) دەفەرمووێ: **(كَتَبَ ألينا عمر بن الخطاب(رضي الله عنه)أنْ أقتلوا كلوٌ ساحِر و ساحِرة،قالَ فقَتلنْا ثَلاثَ سَواحِر)** (رواه البخاري). واتە: پێشەوا عومەر کاغەزی بۆمان نووسی کە (پیاو یان ژنی) جادووکەر بکوژن، ئێمەش سێ جادووکەرمان کوشت.

١٤)نوشتەی ڕەش و سپی(التَولة): ئەمەشیان جۆرێکە لە نوشتە کە بەمەبەستی شیرین کردنی ئافرەت و پیاوە لای یەکتر، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(انَ الرَقىَ والتَمائمْ والتَولةَ شركٌ)** رواه احمد وابو داود.

١٥)فاڵچی(الكهانة والعرافة):فاڵچی ئەو کەسەیە کەلاڤی ئەوە لێدەدات کە گوایە غەیب دەزانێ،بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(مَنْ اتىَ عَر افاً فَسألهُ عَنْ شيءٍ فعدقهُ لَمْ تَقبَلْ صَلاةً أربَعينَ يَوماً)**رواه مسلم، واتە هەرکەسێک چووە لای فاڵچیەک و داوای شتێکی لێکرد و باوەڕی پێکرد،نوێژی چل ڕۆژی لێ وەرناگیرێ.

١٦)بەیدووم(الطيرة): ئەمەیان جۆرە داب و نەریتێکی نەفامییە کەوتۆتە نێو کۆمەڵگەوە زۆر جۆری هەیە وەکو:

أ) ئەگەر یەکێک بپژمێ بۆهیچ شوێنێک ناچن.

ب) ئەگەر کەڵەشێر لە ناوەخت بانگ بدات ئەوە باش نییە.

ج) ئەگەر کوندە پەپوو لەسەر ماڵێک بنیشێ کارێکی خراپ ڕوو دەدات، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(مَنْ رَدتهُ الطَيرةَ عَنْ حاجَتهِ فَقدْ أشركَ)** رواه احمد، واتە: ئەگەر یەکێک(بۆ شوێنێک چوو بەڵام) لەبەر شوومی دەنگێکەوە گەڕایەوە، ئەوە هاوبەشی بۆ الله بڕیار داوە.

**پرسیار:** ئەو شتانە چین کە نزیکن لە شیرک؟

**وەڵام:** زۆر کردەوە هەن کە لە کاری (شیرک)ەوە نزیکن بۆ نموونە:

١)بەجۆرێک پێغەمبەرت خۆش بوێت کە بیهێنیتە ڕیزی الله: پێغەمبەری پێشەوا ﷺ یاساغی کردووە کە لەسنووری خۆی زیاتر بەرز بکرێتەوە بۆیە دەفەرمووێ: **(لا تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتْ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ فَإِنَّمَا أَنَا عَبْدُهُ فَقُولُوا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ )**متفق عليه، واتە: بەرزم مەکەنەوە هەروەک دیانەکان (عیسای کوڕی مەریەم) یان بەرز کردەوە بەڵکو من بەندەی الله م بۆیە پێم بڵێن بەندەی الله و پێغەمبەری الله ﷺ

٢)ڕۆچوون لە خۆشەویستی پیاو چاکان: دیسان ئەگەر ئەم ڕۆجوونە بۆ پێغەمبەر ﷺ دروست نەبێ بۆ هیچ پیاو چاکێک دروست نییە؟!

٣)گەورە دانانی گۆڕ: لەم ڕووانەی خوارەوە:

أ)کردنی بە مزگەوت: هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(أَلَا وإِنَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ كَانُوا يَتَّخِذُونَ قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ وَصَالِحِيهِمْ مَسَاجِدَ، أَلَا فَلَا تَتَّخِذُوا الْقُبُورَ مَسَاجِدَ ، إِنِّي أَنْهَاكُمْ عَنْ ذَلِكَ)** واتە: لەپێش ئێوە گۆڕی

پێغەمبەرەکانی خۆیان دەکردە گۆڕ،بەڵام ئێوە گۆڕەکان مەکەن بە مزگەوت(چونکه )من ڕێی ئەوەتان پێ نادەم.

ب)ڕازاندنەوە و چرا داگیرساندن لەسەری.

ج)نوێژ کردن بەرامبەری کەئەوەش حەرامە: هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(لا تَجْلسُوا عَلَى القُبورولاَ تُصَلوا اليْهَا)**رواه مسلم، واتە: لەسەر گۆڕ دامەنیشن و نوێژی بەرامبەر مەکەن.

د)خانوو لەسەر دروست کردن و هەڵبەستنی: هەروەک (جابر) ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: **(نَهَى رسولُ الله ﷺ أن يُجَصَّصَ القَبْرُوأنْ يُقْعَدَ عَلَيْهِ وَأنْ يُبْنَى عَلَيهِ بناءً)** مسلم واتە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە کەوا گۆڕ هەڵبەسترێ یان لەسەری دانیشی و خانووی لەسەر دروست بکرێ.

ح) نووسین لەسەر گۆڕ: دیسان لە جابر دەگێڕێتەوە (رضي الله عنه) کە **(أنَهُ نَهَىَ أنْ يُجَصَصُ القَبرَ وأنْ يَكتُبْ عَلَيهَا)**رواه مسلم، واتە: پێغەمبەر ﷺ هەڵبەستن و نووسین لەسەر گۆڕی قەدەغە کردووە.

و)بەرزکردنەوەی گۆڕ: **له علي بنْ أبي طالب أنَّ النبيُ ﷺ (آمرهُ الأيدَع قَبراً مُشرفاً الأسَواهُ)**رواه مسلم، واتە: علی کوڕی أبو طالب دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ناردمی فەرمووی هەرچی گۆڕێکت بینی بەرز کرابۆوە تەختی بکە.

لە سونەتی ئەبی داودا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە جگە لە گڵ و بەردی گۆڕەکە زیاتر شتی تری تیا بکرێ.

ز)کردنی گۆڕ بە چەژنگا: هەروەک پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەفەرمووێ: **(لَا تَجْعَلُوا بيوتكم قبورا وَ لا تَجعَلوا قَبري غيداً،وَصَلوا عَلَيَ فَانْ صَلاتَكُمْ تَبلُغني حَيثُ كُنْتُمْ)**رواه ابو داود، واتە: ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕ،وە گۆڕی من مەکەن بە جەژنگا،بەڵکو(صەلەوات)م بۆ بنێرن، لەهەر کوێ بن دەمگاتێ.

کەواتە: ئەگەر دروست نەبێ گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بکرێت بەچەژنگا ئەی کەواتە چۆن دروستە بۆ گۆڕی کەسێکی تر بکرێت بەچەژنگا.

٤)کردنی دارو بەرد بە مووفەڕک: بەهیچ شێوەیەک دروست نییە دارو بەرد بکرێتە مووفەڕک چونکە ئەم کارە بریتیە لە زەوت کردنی مافی الله... چونکە مافی الله پەرستنیەتی، کردنی دارو بەردیش بە مووفەڕک بەپەرستن دادەنرێ، (بە نسبەت ماچ کردنی بەردە ڕەشەکەش شتێکی تایبەتە و ناکرێتە قیاسی گشتی).

**پرسیار:** زیانەکانی شیرک بەگشتی چین؟

**وەڵام:** هاوبەش(شرک)بڕیاردان زۆر زیانی هەیە کە گرنگترینیان بریتین لە:

١)هاوبەش بڕیاردان ئەتکی مرۆڤایەتی دەکات:

ئادەمیزاد ئازیزترین دروست کراوە لە دروست کراوەکانی اللّه هەر بۆیە اللّه کردویەتی بە جێنشین لەسەر زەوی و هەموو بونەوەریش بۆ خزمەتی ئەو دروست کراوە، بەڵام بۆ هاوبەش بڕیاردان بۆ اللّه لە هەموو کەس زەلیلتر دەبێ و وای لێ دێ ببێت بە بەندەی هەموو کەسێک...

بۆیە اللّه تعالی دەفەرموێت: **(وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ)**الحج٣١، واتە: هەرکەسێکی هاوبەش بۆ اللّه بڕیاد بدات، ئەوە وەک ئەوە وایە لەئاسمان بەربێتەوە و باڵندە بیرفێنێ، یان (با) بێت لەگەڵ خۆیی ڕاپێچی بدات بۆ شوێنێکی دوور لە ئاوایی.

٢)هاوبەش بڕیاردان چاوگی ئەفسانە و خوڕافیاتە:

بۆ نموونە ئەو کەسەی وابزانێ نوشتە و کشتەک و پەت بەستن لە قۆڵ و فنجان گرتنەوە و...هتد وەسیلەن بۆ چارەسەرکردنی ئادەمیزاد لە بەڵا و دەردەسەری، ئەوا ئەو کەسە ئامادەیە بۆ بڕوا کردنی هەموو جۆرە ئەفسانەیەک.

٣)هاوبەش بڕیاردان گەورەترین زوڵمە:

هاوبەش بڕیاردان زوڵمێکە لەخۆ دەکرێت، چونکە پیاوی هاوبەشدانەر ئامادەیە(تنازل)بکات و خۆی بکات بەبەندەی کەسێکی تری وەک خۆی، هەروەک لوقمانی حەکیم ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات و دەفەرمووێ: **(لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ)**لقمان١٣، واتە: هاوبەش بۆ اللّه دامەنێ چونکە بێگومان هاوبەش دانان گەورەترن زوڵمە.

٤)هاوبەش دانان هۆیەکە بۆ ترسنۆکی:

ئەو کەسەی ئەقڵی خۆی گیرۆدەی چەند شتێکی ئەفسانە دەکات، ئینسانێکی ترسنۆکی لێ دەردەچێ...

چونکە پشتی خۆی بەچەند خوایەکی دەستکرد دەبەستێ بۆیە اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ بِمَا أَشْرَكُوا بِاللَّهِ)** ال عمران١٥١، واتە: ئێمە ترس دەخەینە دڵی بێ بڕواکان بەوەی هاوبەش بۆ اللّه پەیدا دەکەن.

٥)هاوبەش بڕیاردان کردەوە چاکەکان پووچ دەکاتەوە:
هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ)**الانعام٨٨،واتە: ئەگەر هاوبەش بۆ اللّه بڕیار بدەن ئەوا ئەو کردەوانەی کە کردوویانە پووچ دەکەینەوە.

٦)هاوبەش بڕیاردان سەردەکێشێ بۆ چوونە ناو دۆزەخ بەهەتا هەتایی: اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ)** المائدة٧٢، واتە: هەرکەسێک هاوبەش بۆ اللّه بڕیار بدات ئەوا بەهەشتی لێ حەرام دەبێ و شوێنیشی ناو ئاگری دۆزەخ دەبێت.

٧)هاوبەش دانان کۆمەڵگە پارچە پارچە دەکات:
هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَ لا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ)**الروم٣١-٣٢،واتە: وەکو هاوبەش دانەران مەبن، ئەوانە ئاینەکەی خۆیانیان پارچە پارچە کرد.

**پرسیار:** (تَوَسُّل)و جۆرەکانی چین؟
**وەڵام:** (تَوَسُّل)واتە: بەکارهێنانی جۆرە شێوازێکە بۆ نزیک بوونەوە لە اللّه، دوو جۆر (توسل)یش هەیە کە یەکیان دروستە، ئەوی تر دروست نییە.

**پرسیار:** چ جۆرە(توسل)ێک دروستە؟

**وەڵام:**

١)(توسل)بە باوەڕ: هەروەک اللّە تعالی دەفەرمووێ: (**رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا**)ال عمران١٩٣، واتە: ئەی پەروەردگار ئێمە گوێمان لە بانگەوازێک بوو بۆ باوەڕ کە باوەڕ بێنن بە پەروەردگارتانەوە، ئێمەش باوەڕمان هێنا.

٢) (توسل)بەیەکخواپەرسی(التوحید): وەکو(توسل)ەکەی(یونس) پێغەمبەر (علیە الیلام) کاتێ لە ناو سکی نەهەنگ بوو فەرمووی: (**فَنَادَىٰ فِي الظُّلُمَاتِ أَن لَّا إِلَٰهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ،فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ ۚ وَكَذَٰلِكَ نُنجِي الْمُؤْمِنِينَ**)الانبیا ٨٧-٨٨، واتە: لە تاریکیەکان هاواری کرد بەوە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نییە تەنها بۆ تۆ نەبێت، پاکی و بێگەردی بۆ تۆ،بەڕاستی من ستەمم لە خۆ کردووە، ئێمەش وەڵاممان داوە و ڕزگارمان کرد لە ناخۆشی،بەوشێوەیە بڕوادارن ڕزگار دەکەین.

٣)(توسل)بەناو و سیفەتەکانی اللّە: هەروەک اللِّه تعالی دەفەرمووێ: (**وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا**) الأعراف١٨٠، واتە: اللّە تعالی خاوەنی ناوی تەواوە،ئێوەش بەو ناوانە داوای لێ بکەن.

٤)(توسل)بەسیفەتەکانی اللِە: هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (**یاحَيُ یا قَیُومْ برَحمَتكَ أستَغیثْ**) الترمذي، واتە: ئەی(حيُ) ئەی(قَیوم)کە(دوو سیفەتی اللّه)ن، واتە: ئەی اللّە ی زیندووی هەڵسوڕێنەری کارەکان، بەڕەحمەتی خۆت داوای کۆمەکیت لێ دەکەم.

٥)(توسل)بەکردەوەی چاک: وەکو نوێژ و زیکر و قورئان خوێندن و سەڵەوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ و جیهاد کردن و....هتد، هەروەک اللّە دەربارەی زیکری خۆی دەفەرمووێ: (**وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ**) الأنفال٤٥، واتە: زۆد یادی اللّە بکەن بۆ ئەوەی ڕزگار ببن.

**پرسیار:** چ(توسل)ێک دروست نییە؟

**وەڵام:**

١)(توسل)بە مردوو یان داوای یارمەتی لێکردنیان،اللّە تعالی دەفەرمووێ:(**وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ**)یونس١٠٦، واتە: داوا لە غەیری اللّە مەکە، کە هیچ سوود و زیانێکت پێ ناگەیەنن.

٢)(توسل)بە کەسێک بە ڕواڵەت وادیار بێ کە پیاو چاکە، بۆ نموونە: بڵێیت: یا اللّە لەبەر خاتری فلانە شێخ یان فلانە پیاو چاک یان فلانە سەید وام بۆ بکە.

**پرسیار:** وەرگەڕاو(مرتد)لە دین چییە و لە ئیسلامدا حوکمی چۆنە؟

**وەڵام:** (مرتد) واتە لە دین وەرگەڕاو،(ردة)واتە: وەرگەڕان و خۆپچڕاندنی لە ئیسلام بە گوفتار یان بە کردەوە، جابە ڕقەکاری بێ، یان بە گاڵتە جاری، یان تەنها بیرو باوەڕ بێ، بەو مەرجەی منداڵ یان شێت یان زۆرلێکراو نەبێ، لە ئیسلامیشدا(مرتد)زۆر حومکی هەیە هەریەکە و بەپێی بارودۆخ و شوێن جێگای دەگۆڕێ بۆ نموونە:

یەکەم: ئەگەر(مرتد)جەنگی لەگەڵ موسڵمانان نەدەکرد، پێویستە داوای موسڵمان بوونەوەە لێ بکرێ، جا ئەگەر شەهادەی نەهێنا و نەبووەوە موسڵمان، ئەوا دەبێ لەسەری بدرێ، جا پیاو بێ یان ژن، بەڵام ئەگەر بۆوە موسڵمان و شەهادەی هێنا ئەوا لێی دەبوردرێ و ڕێی پێ ناگیرێ، بەڵام زۆر لە زانایانی ئیسلام فەرموویانە ئەگەر ئەم(مرتد)ە جنێوی بە پێغەمبەر ﷺ دابێ، ئەوا پەشیمان بێتەوە یان پەشیمان نەبێتەوە هەر لە گەردنی دەدرێ و دەبێ بکوژرێ یان هەندێکی لە زانایان دەڵێن: ئەگەر (مرتد)یەکەی بۆ(الكفر الخفي) بوو واتە کوفری نادیار وەکو(کوفری سیاسی) ئەوەش موسوڵمان بوونەوەی لە دونیادا لێ وەرناگیرێ و دەبێ لەسەری بدرێ بەڵام دەبێ بزانین کەوا حوکمی کوشتنی (مرتد)ی بەشی یەکەم کە باس کرا دەبێ پێشەوای موسڵمانان بڕیاری لەسەر بدا، واتە هیچ کەس بۆی نییە لەسەری بدا بەبێ پرسی پێشەوای موسڵمانان.

دووەم: ئەگەر کۆمەڵە(مرتد)ێک جەنگیان لەگەڵ موسڵمانان کرد، ئەوا پێویست ناکات داوای موسڵمان بوونەوەیان لێ بکرێ و بۆ هەرکەسێک دروستە بیانکوژێ، بەهەر شێوەیەکی بگونجێ، جا ئەگەر ئەگەر ئەم کۆمەڵە(مرتد)ە. موسڵمانانیان کوشت ئینجا بوونەوە موسڵمان، ئەوا هەر دروستە لە تۆڵەی خوێنی موسڵمانان بیانکوژنەوە و تۆڵەی موڵک و سامانی موسڵمانانیشیان لێ بکرێتەوە.

سێیەم: دیلە(مرتد)ەکان کە موسڵمانانیان نەکوشتوون ئەوا داوای موسڵمان بوونەوەیان لێ دەکرێ و ئەگەر بوونە موسڵمان ئەوا لێیان دەبوردرێ، ئەگەر نا دەکوژرێن واتە ناکرێتە کۆیلە بەڵام مناڵەکانیان هەر بە موسڵمان دەژمێردرێن.

چوارەم: هەر جۆرە(مرتد)ێک هەبێ، ئەگەر موسڵمان نەبووەوە و مرد، یان کوژرا، دەبێ موڵک و سامانی بدرێتە (بيت المال)ی موسڵمانان، هەروەها نابێ بشۆرێن و نوێژیشیان لەسەر بکرێ و لە گۆڕستانی موسڵمانان بنێژرێن.

پێنجەم: گفت و گۆیێک هاتن لەگەڵ هیچ جۆرە(مرتد)ێک دروست نییە، هەرچەندە جزیەش بدەن، هەروەها هەر جۆرە(مرتد)ێک هەبێ لەدوای سێ(عدة) مارەبڕی ژنەکەی دەپچڕی و ژنەکەش دەتوانێ مێردێکی تر بکاتەوە، بەڵام ئەگەر موسڵمان بۆوە ئەوا دووبارە لێی مارە دەکرێتەوە ئەگەر ژنەکە ویستی وابوو شووی پێ بکاتەوە.

**پرسیار:** تاوان دەکرێتە چەند بەش؟

**وەڵام:** تاوان دەکرێتە دووبەش، کەبریتین لە تاوانە بچووکەکان کە پێیان دەڵێن:(السَّیْئَات) و تاوانە گەورەکان کە پێیان دەڵێن: (الکبائر).

**پرسیار:** تاوانە گەورەکان(الکبائر)چین؟

**وەڵام:** هەر تاوانێک کەلە دونیا حەددی بۆ دانرابێ پێی دەڵێن:(الکبائر)وەک: (زینا، دزی و بوختان، ئارەق خواردنەوە...هتد

**پرسیار:** چۆن گوناهەکان دەسڕێتەوە؟

وەلام: بەوازهێنان لە گوناه وئەنجامدانی کاری چاک گوناهەکان دەسڕێتەوە،هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(إِن تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا)**النساء٣١،واتە:ئەگەر وازبهێنن لە تاوانە گەورەکان و ئەوانەی نەهیان لێ کراوە، ئەو دەمە ئێمە گوناهەکانتان بۆ دەسڕینەوە،دەتانخەینە شوێنێکی چاک لەبەهەشت، یان دەفەرمووێ: **(إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ)هود١١٤**، واتە: کارە چاکەکان تاوانەکان لادەبات.

**پرسیار:** چۆن دەتوانین کاری چاک ئەنجام بدەین، تاوەکو گوناهەکانمان پێ بسڕینەوە؟

**وەڵام:** تاوانەکان گشتیان بە تەوبەیەکی تەواو (التوبة النصوح) دەسڕێتەوە، هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ)**اتحریم٨، واتە: ئەی بڕواداربنە بگەڕێنەوە لای الله، بەگەڕانەوەیەکی تەواو، چونکە الله لەڕێگەی ئەمەوە لە گوناهەکانتان خۆش دەبێ و دەتانخاتە بەهەشت کە ڕوبارێکی زۆری بەژێر دەڕوات.

یان دەفەرمووێ: **(إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ)**الفرقان٧٠،واتە: تەنها ئەوانە نەبێ کە پەشیمان دەبنەوە و بڕوا دێنن و کردەوەی چاک ئەنجام دەدەن، ئەوانە اللَّه تعالی گوناهەکانیان بە چاکە بۆ دەگۆڕێتەوە.

**پرسیار:** ئەو شتانەی کە دەبنە هۆی تۆبە کردن و پەشیمان بوونەوە لە گوناهـ چین؟یان چ شتێک دەبێتە هۆی پەشیمان بوونەوە لە گوناه؟

**وەڵام:** بەئەنجامدانی شەش خاڵ دەبێتە هۆی پەشیمان بوونەوە کە ئەمانەی خوارەوەن:

١)بیرکردنەوە لە مردن و لەحاڵی گیان کێشان: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(أكثِروا ذِكرَ هاذِمِ الَّذاتِ)** الترمذي واتە: زۆر بیر لە ڕوخێنەری ئارەزوو و شەهوەتەکان بکەنەوە کە مردنە، یان اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُم)**الجمعة٨، واتە: بڵێ:(ئەی موحەمەد) ئەو مردنەی کە ئێوە لەبەری ڕائەکەن پێتان دەگات.

٢)بیرکردنەوە لە قارو غەزەبی الله: چونکە گەر اللَّه غەزەبی گرت لەبەندەکانی دارو بەرد دەکەونە لەرزین و لەترسان خۆیان پێ ناگیرێ (اللَّه پەنامان بدات) هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ)** البروج١٢، واتە:بەڕاستی تۆڵە سەندنەوەی اللَّه زۆر توندە.

یان دەفەرمووێ: **(وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَىٰ وَهِيَ ظَالِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ)**هود١٠٢،واتە: ئەوە تۆڵە سەندنەوەی اللَّه یە کاتێ بیەوێ لە شوێنێک کە زوڵمی تیا زۆر بە توندی لێی دەسێنێ.

٣) بیرکردنەوە لە نیعمەتەکانی الله: هەروەک اللّٰه تعالى دەفەرمووێ: **(فَاذْكُرُوا آلَاءَ اللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ)** الأعراف٧٤، واتە: یادی نیعمەتەکانی اللَّه بکەن و فەسادی کەسەر زەوی مەنێنەوە.

یان دەفەرمووێ: **(أَلَمْ نَجْعَل لَّهُ عَيْنَ وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ وَهَدَيْنَهُ ٱلنَّجْدَيْنِ)**البلد٨-١٠، واتە: ئایا دوو چاوو و زمانێک و دوو لێومان پێ نەداون چاکە و خراپەمان بۆ دەرنەخستوون؟

٤)گوێ گرتن لە هەواڵی تۆبەکاران: بۆ نموونە: ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕۆژێکیان پیاوێک زۆر بەخەمباری و پەشۆکاویەوە لەخزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتووە، ئەویش لێی پرسی ئەوە چیتە بۆ وا غەمباری؟ ئەویش گوتی ئەی پێغەمبەر ﷺ من لە جاهیلی تاوانێکی وام کردووە، ترسم وایە کە اللَّه لێم خۆش نەبێ. ئەگەر چی ئێستا زۆر پەشیمانم لەو تاوانە و تۆبەم کردووە.

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەم تاوانە چی بوو؟ ئەویش گوتی: من لە کاتی خۆی یەک بووم لەوانەی کەئەگەر کچم ببوایە یەکسەر زیندە بەچاڵم دەکرد، هەتا ڕۆژێکیان کچێکم بوو...

خێزانەکەم واتە(دایکی کچەکە) زۆر لێم پاڕایەوە کەوا لێی گەڕێم و ئەم کچەم بۆ بمێنێ...

منیش دڵم نەشکاندو لێی گەڕام،تاوەکو کچەکەم گەورە بوو ئاوای لێهات لە هەموو کچێکی ئەم ناوچەیە جوانتر بوو،

بەڵ نەمهێشت یەک کەس بزانێ ئەم کچەمان هەیە، منیش دڵم بەڕاستی نەدەنا و هەر خۆم بەسەرشۆڕی دەهاتە بەرچاو ئەگەرچی کەسیش نەیدەزانی کەوا ئێمە کچێکمان بووە و زیندە بوچاڵمان نەکردووە.

هەتا ڕۆژێک بەخێزانەکەی خۆمم گوت: ئافرەت من بەنیازم سەر بدەم لەخزمانم حەزدەکەم کچەکەشم بەگەڵ بدەیت بۆ پێویستی.

خێزانەکەشم بەجوانترین بەرگ و شێوە کچەکەمی ڕازاندەوە بەڵام پەیمانی لێوەرگرتم هیچ شتێکی لێنەکەم منیش بەڵێنم پێدا، ڕۆشتم و بەرەو لای پیرێک هەنگاوم هاویشت و لەکچەکەم گەیاند کەدەمەوێ هەندێک ئاو بخۆمەوە،بەڵام کاتێ گەیشتە لای بیرەکە و سەیری قووڵی بیرەکەم کرد،یەکسەر پێی کچەکەم گرت تاوەکو فرێی دەمە ناوی،کچەکەم کەئەمەی زانی خۆی بەمنەوە توند گرت و پێی گوتم:ئای باوکە گیان دەتەوێ چیم لێ بکەیت توخوا بەزەیت پێمدا بێتەوە ئەمانەتی دایکم بپارێزە، بەڵام شەیتان سواری ملم بوو هەر دەیویست فرێی دەمە ناوی بەڵام توند خۆی پێنەوە نووساندبوو بەری نەدەدام!

تا بەزۆر لە خۆمم کردەوە و یەکسەر تێم فرێدایە ناو بیرەکە گوێم لێ بوو کەوا لەناو بیرەکە دەیگوت ئاخ خ خ باوکە گیان چۆن منت کوشت!

بەردەوام ئەم قسەی دووپات دەکردەوە.

منیش ماوەیەک لەسەر بیرەکە وەستام تادەنگی بەرە بەرە نزم دەبۆوە،تا کاتێک هات دەنگەکە نەما زانیم گیانی دەرچووە و مردووە.

کاتێ کە ئەم پیاوە سەرگوزشتەی خۆی دەگێڕایەوە یەکسەر پێغەمبەر ﷺ و هاوڕێکانی دەستیان کرد بەگریان، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر فەرمانم پێ بکرابایە کە تۆڵە لەخەڵکی بسێنم لەجاهیلی ئەم جۆرە تاوانەیان کردووە سوێند بە اللَّە تۆڵەم لێ دەسەند.

ئەمە و چەندین سەرگوزشتەی تر وا لە ئینسان دەکەن کەپەشیمان ببنەوە لە گوناهەکان.

٥)ناسینی ڕەحمەتی اللَّە کەزۆر فراوانە: هەروەک اللَّە تعالی دەفەرمووێ: **(وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ)**الأعراف١٥٦،

واتە: ڕەحمەت و بەزەیی من هەموو شتێک دەگرێتەوە.

هەروەک ڕۆژێکیان پیاوێک لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد کاتێک کە پیاوەکە تەحیاتی خوێند و لەدوای تەحیاتەکە دوعایەکی خوێند و گوتی: **(اللّهُمَ أرْحَمني انَا مُحَمَداً،ولاَتَرْحَمْ مَعَنْا أحَداً،فَلَمّا سَلَّمَ عَلَيهِ الصَلاة والسَلام قالَ:مَنْ القائلُ كَذا وكَذا؟قالَ:أنْا يا رَسولَ اللّه وما أردتُ الا الخَيْر،قالَ لَقَد ضَيَقْتَ واسِعاً انْ رَحْمَتهَ اللّه وَسِعَتْ كُلُ شَئٍ)** واتە: یا اللَّە ڕەحم بە من و بە محمد بکە و لەگەڵ ئێمە ڕەحم بەکەس مەکە،کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ سەلامی دایەوە فەرمووی:کێ ئەم دوعایەی کرد؟ کابرا گوتی: من ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نیەتیشم پێی خێر و چاکە بووە، ئەویش فەرمووی تۆ فراوانی ڕەحمەتی اللَّە ت وێک هێناوەتەوە، ڕەحمەتی اللَّە لەهەموو شتێک فراوانترە...

٦)هەست کردن بەتەنیایی و بێ هیوایی لە دونیا: هەروەک لەفەرموودەیەکی(صحيح)دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر کێوی(صفا)خزمەکانی خۆی بانگ کردوو پێی فەرموون: ئەی بەنی (عبد مناف)ئەی بەنی (هاشم) ئەی (عباس) ئەی (مامی پێغەمبەر) ئەی(فاطمة)ی کچی پێغەمبەر،خۆتان لە ئاگر دەرباز بکەن چونکە هیچ شتێکم بۆ ئێوە نییە لەڕۆژی دوایدا.

هەروەها اللَّه تعالى لەفەرموودەیەکی (قودسی)دا دەفەرمووێ: **(يا عبادى إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ و أنا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِر لكم)**مسلم، واتە: ئەی بەندەکانی من ئێوە بەشە و ڕۆژ تاوان دەکەن و منیش لەهەموو گوناهێک خۆش دەبم، داوای لێخۆش بوونم لێ بکەن، من لێتان خۆش دەبم..

**پرسیار:** فاسق چییە؟

**وەڵام:** (فاسق) لەبنچینەدا لە(فسق)ەوە هاتووە لەبنەڕەتدا ئەگەر دەنکی خورما لەتوێکڵی خۆی دەرچوو پێی دەڵێن(فسق)، کەواتە بەو کەسە دەڵێن (فاسق) کە لەفەرمانی اللَّه دەرچووبێت زانایانیش زۆر تەفسیریان هەیە لەسەر ووشەی(فسق) بۆ نموونە: (القرطبي) دەڵێ: (فسق)واتە: دەرچوون لە گوێڕایەڵی (طاعة)ی اللَّه تعالى، (البيضاوي)دەڵێ:(الفاسق) واتە: دەرچوو لەفەرمانی اللَّه، (الراغب الأصفهاني) دەڵێ: (فسوق) بریتیە لە (ئەنجام دانی گوناهـ چ کەم بێ چ زۆر).

**پرسیار:** (فسق)دەکرێتە چەند بەش؟

**وەڵام:** (فسق) دەکرێتە دوو بەش کە بریتین لەو (فسقەی کەپێی لە ئیسلام دەردەچێت) و (ئەو فسقەی کە پێی لە ئیسلام دەرناچێت).

(أبن عباس) رصي اللَّه عنه دەفەرمووێت: هەرناوێک کە اللَّه بۆ غەیری موسڵمانی بەکاربهێنێ وەکو(خاسر، مسرف، ظالم، فاسق) گشتیان بەمانای (کفر)دێن واتە: بە(کافر) لەقەڵەم دەدرێن، بەڵام ئەوانەی کە اللَّه تعالى بۆ موسڵمانی بەکاربهێنێ ئەوا بەمانای(فاسق)دێن و بەگوناهبار لەقەڵەم دەدرێن.

فسقی بێبڕوایان دەکرێت بە دووبەش:

١)(فسق)ی بیروباوەڕی: وەکو(فسق)ی دووڕووەکان هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ)** التوبة٦٧، واتە: بەڕاستی دووڕووەکان لە ئاین دەرچوون.

٢)(فسق)ی ڕەفتاری: وەکو(فسق)ی(ئیبلیس)نەفرەتی اللَّه تعالى ی لێبێ هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ)** الكهف٥٠، واتە: ئێمە بە

فریشتەکانمان گوت: کەوا سوژدە بۆ ئادەم بەرن هەموویان سوژدەیان برد، تەنها (ئیبلیس) شەیتان نەبێ کەلە ڕەگەزی جنۆکەکانە لەفەرمانی اللّٰه دەرچوو(سوژدەی بۆ ئادەم نەبرد).

لە قورئاندا لەزۆربەی ئایەتەکاندا ووشەی(فسق)بۆ کافر و بێبڕوایان بەکارهێنراوە بۆ نموونە: **(وَلَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلَّا)** بێگومان ئێمە ئایەت و نیشانەی ڕوونی خۆمان بەسەر تۆدا ناردۆتە خوارەوە،بەڵام هیچ کەسێک پێی ناڕازی نەبوو تەنها فاسقەکان نەبێ...

**(إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ)**التوبة٦٧، واتە: بێگومان دووڕووەکان هەرخۆیان(فاسق)ن.

پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(فَالمؤمنُونَ الَّذين أمنُوا بِي، وصَدَقُوا بِي، والفاسقُونَ الَّذين كَذَبوا بِي وجَحدوا بِي)** أبن عاصم،طبراني، واتە: بڕواداران ئەو کەسانەن بڕوایان کە باوەڕیان پێ هێناوم، بەڕاستم دەزانن، بەڵام (فاسق)ەکان ئەوانەن کە بەدرۆم دەزانن و دڵ ڕەقن بەرامبەر بەمن، بەڵام ئەو جۆرە (فاسق)انەی کە پێی لەئیسلام دەرنەچوون بریتین لە دوو بەش:

یەکەم: (فسق)ی بیروباوەڕی: هەروەک (ابن القیم) ڕەحمەتی اللّٰه ی لێبێ دەڵێ: ئەم جۆرە کەسانە ئەوانەن کە خاوەن (بدعة)ن ئەگەرچی بڕوایان بە اللّٰه تعالی پاشان پێغەمبەر ﷺ هێناوە و حەرام بە حەرام دەزانن و حەڵاڵ بە حەڵاڵ دەزانن...

بەڵام بەنەفامی بەدوای ئیسلام کەوتوون یان بەکوێری بەدوای هەڵەی زانایان کەوتوون، وەکو (خەوارج و ڕافیزی و قەدەری و مەعتەزیلی و جەهمی...) یەکان هەروەها (فسق)گشتی ترە لە(بیدعة)هەروەک (ابن صلاح) دەڵێ: **(كُلُ مُبتَدع فاسقٌ، ولَيْستْ كُلُ فاسقِ مُبتَدعا)** فتاوي ابن صلاح لاپەڕە ٢٨،واتە: هەموو خاوەن بیدعەیەک (فاسق)ە بەڵام هەموو فاسقێک خاوەن بیدعە نییە.

دووەم: (فیسقی ڕەفتار):ئیمامی(نووي) ڕەحمەتی اللّٰه تعالی لێ بێ دەفەرمووێ: **(وأمَا الفِسقُ فيحْصلُ بأرْتكابِ الكَبيرَة أو الأصْرار على الصَغيرَةِ)** واتە: (فسق)بریتیە لەئەنجامدانی گوناهی گەورە و سووربوون لەسەر گوناهی بچووک.تاوي النووي،ئەم جۆرە(فسق)ەش چەند بەشێک دەگرێتە خۆ.

بۆ نموونە:

١)درۆکردن: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ )** الحجرات٦، واتە: ئەی بڕوادارینە، ئەگەر پیاوێکی فاسق و خراپ هەواڵێکی بۆهێنان ڕوونی بکەنەوە چونکە ناخۆشە لەسەر قسە و هەواڵی ئەو پیاوە خراپە کۆمەڵێ دووچاری سزا و نارەحەتی بکەن (لە پاشان کەهەواڵەکە درۆ دەرچوو بەداخ و مەراقەوە) پەشیمان ئەبنەوە، لێرە فاسق: هەروەک پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(سَبابُ المُسلِمِ فُسُقُ)**رواه البخاري، واتە: جوێن دان بەموسڵمان لە ئایین دەرچوونە.

٣)بوختان: هەروەک اللّٰه تعالی دەفەرمووێ: **(وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ)** النور٤، واتە: ئەوانەی بوختان بەژنی پەرژین

کراو (داوێن پاک)و پاشان چوار شایەدیان نەهێنا ئەوا هەشتا داریان لێ بدەن بەشایەتیان وەرمەگرن، چونکە بەڕاستی ئەوانە فاسقن.

٤)ناوو ناتۆرە لەیەکترنان:هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ)** الحجرات١١، واتە: بانگی یەکتر مەکەن بەناوی ناشرین و خراپ، چونکە لەدوای باوەڕ زۆر ناشرین و خراپە ناوبانگی گوناهو تاوان بکەوێتە شوێنی.

٥)زۆری تریش هەن کەوا بە(فسق)ی ڕەفتار دادەنرێن، وەکو: (دزی، دووڕوویی بچووک، کوفری نیعمەت).

**پرسیار:** هەڵوێستی ئەهلی سوننە و دژەکانیان چییە دەربارەی(فاسق).

**وەڵام:**

١) ئەهلی سوننە و جەماعەت کە ئێمەین دەڵێین: ئێمە خاوەن ڕووگە (قیبلە)یە بە کافر نازانین و ئەگەرچی گوناهی گەورە (الکبائر) ئەنجام بدەین، جگە لەو گوناهانەی کەدەبنە هۆی دەرچوون لەئاین بۆ نموونە اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا)** الحجرات٩، واتە: ئەگەر دوو تاقمی بڕوادار شەڕیان لەگەڵ یەکدا کرد ئێوە نێوانیان چاک بکەنەوە. کەواتە: دەگونجێ بڕواداران شەڕ لەگەڵ یەکدا بکەن بێ ئەوەی لەئیمانیش دەربچن. یان پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(لايَزْني الزاني حينَ يَزْني وهُوَ مُؤمِنٌ،ولاَ يَسْرقُ السَارقُ حيْنَ يَسْرقُ وهُوَ مؤمِنٌ، ولايَشربُ الخَمْرُ حيْنَ يَشْربها وهُوَ مؤمِنٌ) البخاري،** واتە: زیناکەر لەحاڵەتی زیناکردندا بڕوادار نییە، وە دز لەحاڵەتی دزییەکەی بڕوادار نییە، مەی(ئارەق)خۆر لەحاڵەتی خواردنەوەی مەیەکەدا بڕوادار نییە. واتە: لەوحاڵەتانەی باس کران بڕوادار نین، ئەگەر نا هەر بڕوادارن. کەواتە: هەندێ جار کاری (شەڕ لەگەڵ یەکتر کردن و دزی و مەی خواردنەوە و زیناکردن و ...هتد) لە بڕواداران دەپشکوێتەوە، بەڵام لەم حاڵەتانە ووشەی (فاسق)یان بۆ بەکاردەهێنرێ.

٢)موعتەزیلەکان: ئەم جۆرەیان پیاوی(فاسق)لەلای ئەوان بەهیچ جۆرێک بەبڕوادار دانانێن، هەروەک بە کافریشیان لەقەڵەم نادەن بەڵکو دەیانخەنە نێوان دوو شوێنان واتە: (منزلة بين منزلتين) نەبڕوادارن و نەکافریشن.

٣)خەواریجەکان: ڕای ئەمانیش بەجۆرێکە هەرکە گوناهێکت کرد چ بچووک چ گەورە ئەوا بە کافر دادەنرێیت و لەئیسلام دەشۆرێیت.

٤)(مرجئة)ەکان: ئەمانەش دەڵێن: هەرچەند تاوان بکەیت لەم جۆرە تاوانانەی کەباس کران ئەوا هەر بە بڕوادار دەمێنیتەوە و ناچیتە قاوغی هیچ ناوێکی تر.

کەواتە: ئەوەی ڕاست بێ: تەنها ڕای ئەهلی سوننە و جەماعەیە، بەڵام ڕای ئەوانی تر جێگای باوەڕ نین و دژایەتی سەدان ئایەت و فەرموودەکانی پێغەمبەرن ﷺ.

**پرسیار:** ئایا نوێژ لەدوای هەموو ئیمامێک دروستە؟

وەڵام: ئەگەر ئەو ئیمامە کوفرێکی ئاشکرایی لێ بینرا ئەوا نوێژ لەدوای ئەو ئیمامە دروست نییە، بەڵام ئەگەر ئیمام خاوەن بیدعە یان فاجر بوو ئەوا بەپێی چەند فەرموودەیەک و چەند ڕووداوێکی مێژوویی نوێژکردن لەدوای ئەو ئیمامەوە دروستە...

بۆ نموونە پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(يُصَلونَ لَكُمْ فَانْ أصَابوا فَلَكُمْ ولَهُمْ وانْ أخطْاؤا فَلكُمْ وعَلَيهمْ)** صحيح رواه أحمد.واتە: ئەو ئیمامانەی نوێژتان بۆدەکەن ئەگەر نوێژەکانیان بەڕاستی بۆکردن ئەوا خێرەکە بۆ هەردوو لایە، بەڵام ئەگەر هەڵەیان تیا کرد ئەوا بەتەنها خێرەکە بۆ ئێوەیە و بۆ ئەوان نییە.

هەروەها کاتی خۆی(عبداللَّه ی کوڕی عمر)و(ئەنەسی کوڕی مالک)ڕەزای اللَّه تعالى یان لێبێت نوێژیان لەدوای (حجاج)ی کوڕی(یوسفی الثقفي)کردووە هەرچەندە کە (حجاج) پیاوێکی فاسق و زۆردار بووە.

هەروەها (عبداللَّه ی کوڕی مسعود)کاتی خۆی نوێژی لەدوای (وەلیدی کوڕی عتبة کوڕی ابن محیط) دەکرد کەچی ئەو پیاوە ئارەق خۆریش بووە، هەتا(عثمان کوڕی عفان) جارێکیان جەڵدەی لێدا و لە ویلایەتی (کوفە)شی دەر کرد.

یان هەر ئەم پیاوە جارێکیان لە نوێژێکی بەیانی(٤)ڕکات نوێژی بۆ خەڵکی کرد و پاشان پێی گوتن کەمن نوێژتان بۆ زیاتر دەکەم تاخێری زیاتر بێ!!

بەڵام لەم کاتەی ئەگەر ئیمامی فاجر یان فاسق یان خاوەن بیدعە بوو، ئەوا پێویستە ئاگادار بکرێتەوە تاوەکو پەشیمان بێتەوە ئەگەر لەهەمان کات ئیمامێکی تر هەبوو بەڕواڵەت دیار بوو کەسێکی خواناسە ئەوا دەبێ دوور بکەویتەوە لەئمامە فاجرەکە تائەو دەمەی پەشیمان دەبێتەوە.

بەڵام ئەگەر زانرا ئیمامی تر نییە ئەوا دەبێ نوێژەکەی هەر لەدوا بکرێ، چونکە جومعە و جەماعەت دەبێ هەر بکرێ، بۆیە دەبێ نوێژ لەدوای ئەم ئیمامە بکرێ تاوەکو جومعە و جەماعەت نەچێ، یان دەبێ نوێژی لەدوا نەکرێ کەئەویش دەبێتە هۆی چواندنی جومعە و جەماعەت.

کەواتە: نوێژکردن لەدوای ئیمامێکی فاجر یان خاوەن بیدعە یان فاسق دروستە و دەکرێت.

**پرسیار:** بیدعه چییه؟

**وەڵام:** بنچینەی ووشەی بیدعه لە(بدَعْ)هاتووه، لەشتی زیادکراو و دروست کراو نویّ هەروەک اللّه تعالى دەفەرمووێ: **(بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ)**البقرة١١٧،واته: الله دروستکەری ئاسمانەکان و زەوییه.

بیدعەش دوو جۆره:

١) بیدعه لە ئاداب و نەریت: وەک دروستکردنی شتێک کە لەپێش دا نە بووبێ، بەمەش دەگوترێت (ابتداع).

٢) بیدعه لەئایین: ئەمەیان دروست نییه، لەبەرئەوەی لە بنچینەدا ئایین شتێکی(توقيف)یە واته: نابێ نەلێی زیاد بکرێ نەلێی کەم بکرێ، هەروەک پێغەمبەر ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(مَنْ أَحْدَثَ في أَمْرِنا هذا ما لَيْسَ مِنهُ فَهوَ رَد)** (البخاري و مسلم). واته: هەر کەسێک لەم ئاینەی ئێمەدا شتێک داهێنێ و بەڵگەی لە کتێب و سوننەت (ئیجماع و قیاس)نەبێ ئەوە لێی وەرناگیرێ.

**پرسیار:** حوکمی بیدعه لەئیسلامدا چییه؟

**وەلام:** ئەوەی کەبیدعه دروست دەکات لەئیسلامدا پاشەڕۆژی ئاگری سەختی دۆزەخ دەبێ، هەروەک پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(إياكُمْ ومُحدَثاتِ الأمُورِ؛ فَإنْ كُلُ مُحْدثَةٍ بِدْعةٌ ، وكُلَ بِدعةٍ ضَلالةٌ،وكُلُ ضَلالةٍ في النَّارِ)**رواه أبو داود والترمذي واته: نەکەن شت داهێنن (لەکاره ئاينيەکان) چونکه هەموو داهێنراوێک بیدعەیه، هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییه، هەموو گومڕاییەکیش دەچێته ناو ئاگر، بەڵام بیدعه تا بیدعه حوکمی توووند و سوکی هەیه، بۆ نموونه:

١) هەندێک بیدعه دەچێته چوغزی(کوفری ئاشکرا)وەکو تەواف کردن بەدەوری گۆڕدا، یان قوربانی سەربڕین و لەخۆگرتن بۆغەیری الله، یان داوای کۆمەک کردن لەغەیری الله، یان دووپات کردنەوه و دان هێنان بەچەند قسەیەکی دوور لەواقع وەکو قسەی (جهمي) یان (معتزلة)کان.

٢) هەندێک بیدعه به(شیرک یان حەرام)دادەنرێ، وەکو دروستکردنی خانوو لەسەر گۆڕ نوێژکردن لەنێو گۆڕستان و...هتد.

٣) هەندێک بیدعه هەیه به(فسق)دادەنرێ، وەکو بیدعەی (خوارج) و(قدري)و (مرجئة)و...هتد کەئەویش زیاتر لەقسەکانیانەوه بەدەر دەکەوێ.

٤) هەندێک بیدعه یاخی بوون(معصیةن)، وەکو ئەو بیدعەیەی کەدەربارەی نیوەی مانگی شەعبان باسمان کرد.

**پرسیار:** ئایا بیدعەی(حسنة)یان(سيئة)هەیە؟

**وەڵام:** ئەم زاراوانە بۆ بیدعە زۆر هەڵەن کە بەکاردەهێنرێن، چونکە پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەرن ﷺ کە دەفەرمووێ: **(كُلُ بِدعَةٍ ضَلالةً)**رواه أبو داود والترمذي، واتە: هەموو زیادکراوێک گومڕاییە، لێرەدا پێغەمبەر ﷺ هیچی تیا نەهێشتۆتەوە، کەواتە بۆمان نییە قسەیەکی تر لەئاستی قسەی پێغەمبەر ﷺ بکەین، چونکە ئەم فەرموودە هاوتایە لەگەڵ فەرموودەی: **(مَنْ أَحْدَثَ في أَمْرِنا هذا ما لَيْسَ مِنهُ فَهوَ رَد)**رواه مسلم والبخاري، لەپێشدا کراوەتە کوردی.

ئەوانەی کەدەشڵێن بیدعەی(حسنة)یان(سيئة)ئەوا لەو گوتەیەی ئیمامی عمر وەریان گرتوە کەدەربارەی نوێژی (تەراویح) دەفەرمووێ: (نِعمَةُ البدعَةُ هذِهِ) واتە: چاکترین بیدعە ئەم نوێژەیە.

لێرەدا ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب مەبەستی بیدعەی زمانەوانییە نەک بیدعەی شەرعی، چونکە نوێژی (تەراویح) بیدعەی شەرعی نییە لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەم نوێژەی کردووە، یان دەڵێن قورئان نوسینەوە و کۆکردنەوەی بیدعەی (حسنة) یە، ئەمەشیان هەروا نییە، چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتی خۆی فەرمانی کۆکردنەوەی ئایەتەکانی قورئانی کردووە، بۆیە لەدوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ لەیەک کتێبا کۆکرایەوە.

هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(مَنْ سَنَ في الإسْلام سُنَةَ حَسَنةَ فَلَهُ أجْرُها مَنْ عَمِلَ بِها بَعدهُ مِنْ غَيرِ أنْ يَنقُصُ مِنْ أجُورهمْ شيئٌ،وَمَنْ سَنَ في الإسْلاَم سُنَةَ سَيئَةَ كانَ عَليهِ وِزرُها ووِزرُ مَنْ عَمَلَ بِها مِنْ بَعده،مِنْ غَيْر أنْ يَنقُصُ مِنْ أوزارِهِمْ شَيئً،)**رواه مسلم، واتە: هەرکەسێک ڕەوشت و یاسایەکی جوان دابهێنێ ئەوا پاساشتی بۆخۆی و بۆ ئەو کەسانەش هەیە کەکاری پێ دەکەن لەدوای ئەوە بێ ئەوەی هیچ لەخێری ئەوان کەم بکاتەوە.

وە هەرکەسێک لە ئیسلاما یاسایەکی ناشرین دابهێنێ و خەڵک چاوی لێ بکەن و ڕەفتاری پێ بکەن ئەوا بەقەد گوناهی ئەوانەی کەکاری پێ دەکەن گوناهیش بۆ ئەو کەسە دەنوسرێ بەبێ ئەوەی کەهیچ لە گوناهی ئەوان کەم بکاتەوە.

**پرسیار:** هۆکارەکانی دروست بوونی بیدعه چین؟
**وەڵام:** زۆر هۆ هەن بۆ دروست کردنی بیدعه لەوانه:

١)شارەزا نەبوون لەئەحکامه ئاینیەکان: هەروەک پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(مَنْ يَعِيشَ مِنْكُم فَسَيَرى اختلافاً كَثيراً)**رواه أبو داود والترمذي، واته: هەرکەسێک لەئێوه بژیت ،ئەوا بەم زوانه کێشەیەکی زۆر لەسەر زەوی دەبینێ هەروەک دەفەرمووێ: **(إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنَ العِباد، وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ، حَتَّى إِذَا لَمْ يَبْقِ عَالِمًا اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا، فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا)**رواه الشيخان، واته: اللّٰه تعالى زانست هەڵناگرێ بەکێشانەوەی لەبەندەکان، بەڵام زانست هەڵدەگرێ به بردنەوەی زانایان، جا هەر کاتێ زانا نەمان خەڵک سەرکردەی نەزان دادەنێن،کە پرسیاریان لێ دەکرێ فەتوا دەدەن بەبێ زانین بۆیه گومرا دەبن و خەڵکیش گومڕا دەبن.

٢)بەدوا ئارەزوو کەوتن: هەروەک اللّٰه تعالى دەفەرمووێ: **(وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ)** القصص.٥، واته: کێ لەوە گومڕاترە کەبەدوای ئارەزووی خۆی بکەوێت لەغەیری ڕێنمایی اللّٰه تعالى.

٣)دەمارگیری لەڕاو بۆچوون:هەروەک اللّٰه تعالى دەفەرمووێ: **(وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا)**البقرة.١٧٠،واته: ئەگەر پێیان بگوترێ دوای ئەم قورئانه بکەون کە اللّٰه ناردوویەتی (ئەوان لەوەڵاما) دەڵێن: بەڵکو ئێمه بەدوای باو باپیرانمان کەوتووین.

٤)خۆ چواندن بەبێبڕوایان: هەروەک کاتی خۆی جوولەکەکان بە(موسى)یان گوت: **(اجْعَل لَّنَا إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ ۚ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ)** الأعراف١٣٨، واته: ئەی (موسى) خوایەکمان بۆ بڕیار بدە(جگە لە خوا) هەروەک ئەوان خوای خۆیان هەیە!
(موسى)ش پێی گوتن: بەڕاستی ئێوە گەلێکی نەفامن.

**پرسیار:** ئایا چۆن ڕوو بە ڕووی بیدعە چییەکان ببینەوە، یان هەڵوێستمان چۆن بێ بەرامبەر بەو کەسانەی بیدعە چین؟

**وەڵام:** چوار خاڵی سەرەکی لە ئیسلامدا وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێ:

یەکەم: مەبەستەکانی ئیسلام لەخۆ دوورگرتن لەبیدعە چییەکان:

مەبەستەکانی ئیسلام لەخۆ دوورگرتن لە بیدعە چییەکان بۆ پارێزگاری سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ لە بیدعە و هەواو ئارەزووی هەوەس پەرستان، بەم خاڵانەی خوارەوەش دەتوانین ڕووبەڕووی بیدعە چییەکان ببینەوە:

١)تەریق کردنەوەی بیدعەچی بۆئەوەی وازبهێنێ لەئەنجامدانی بیدعەکانی.

٢)بێدار و ئاگادارکردنەوەی خەڵکی لەبیدعە جۆراو جۆرەکان.

٣)ڕێگرتن و سنوور دانان لەڕێگەی بڵاوبوونەوەی بیدعە.

٤)قەلاچۆکردن و لەبن هێنانی بیدعە چییەکان بەتەریق کردنەوە و شکاندنەوەیان لەنێو خەڵکی لەپێناو بێهێز و پێزکردنی بیدعەکانیان.

دووەم: جۆرەکانی خۆ دوورگرتن:

- خۆ دوورگرتن لەبەر ئەوەی حەقی اللَّه نەدراوە واتە:خۆتیان لێ دووربخەیتەوە چونکە:

حەقی اللَّه یان بەزایە داوە لەڕێگەی ئەنجامدانی گوناهـ و تاوانەکان و برادەرایەتی پیاوی خراپ تاوازیان لێ دەهێنێ.

هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ)** الأنعام٦٨، واتە: کاتێ ئایەتەکانی ئێمە دەبینی دەم درێژی ئەکەن بەئایەتەکانی ئێمە،(تۆ) ڕوویان لێ وەرگێڕە و پشتیان تێ بکە و هەستە لەلایان تا باسەکە دەگۆڕن و لە باسێکی تر دەدوێن.

- خۆ دوور لێگرتنیان لەبەرئەوەی کەهەقی یەکتر یان کەسانی تر دەفەوتێنن.

وەک فەوتاندنی هەقی باوکایەتی یان هەقی ژن و مێردایەتی یان هەقی خزمایەتی...هتد هەروەک پێغەمبەر ﷺ کاتی خۆی یەک مانگ خۆی لە خێزانەکانی گرت و قسەی لەگەڵ نەکردن.

- خۆ دوورگرتن وەک سزایەک بۆ تەمێ کردنی دەست درێژکاران.

سێیەم: مەرجەکانی خۆ دوورگرتن: بۆ ئەو کەسەی خۆی لە بیدعە چییەکان دەگرێ پێویستە:

١)خۆ دوورگرتنەکەی بۆ اللَّه بێ.

٢)خۆ دوورگرتنەکەی لەسەر ڕێ و شوێنی پێغەمبەر بێ ﷺ.

چوارەم: شێوازەکانی خۆ دوورگرتن:

خۆگرتن لەکەسێک بۆ کەسێک دەگۆڕێ بۆ هەرکەسێک حوکمی تایبەتی خۆی هەیە بە گشتیش شێوازەکان بریتین لە:

١-دانەنیشتن لەگەڵی

٢-دوورکەوتنەوە لێی

٣-ڕێز لێ نەگرتنی

٤-قسە لەگەڵ نەکردنی

٥-سەلام لێ نەکردنی

٦-ڕوو پێ نەدان و ڕوو خۆش نەبوون لەگەڵی

٧-گوێ شل نەکردن بۆ قسەکانی

٨-ڕاوێژ پێ نەکردنی

( فتح الباري،٤٩٧،١٠،١٢٤،٨)

**پرسیار:** ئایا سۆفیایەتی ڕاستە؟

**وەڵام:** ئەگەر سۆفیایەتی بریتی بێ لە خۆ پاک کردنەوە گوناھ و تاوان ئەوە شتێکی چاکە، بەڵام ئەو مەسەلەی زەرگ لەخۆدان و ئەو سەما و هەڵپەڕین و هەڵبەزینەی کە دەیکەن یان ئەو بەندایەتیەی کە بۆ شێخی دەکەن، گشتیان ئەفسانە و بیدعەن لە ئیسلامدا شتی وا نەکراوە، نەگوتراوە و نەبووە.

**پرسیار:** ئەی سۆفیەکان چۆن زەرگ لەخۆ دەدەن، یان ئاگر دەخۆن کەچی هیچیان لێنایەت؟

**وەڵام:** ئەو زەرگ لەخۆدانە یان ئاگر لەزار نانە هیچی ڕاست نییە بەڵکو فێڵێکە لەبەر چاوی ئێمە وا دەبینرێ....

هەروەک لەبنچینەدا (پەڕی پانکە) سێپەڕە بەڵام لەکاتی سوڕانیدا ژمارەیان زیاد دەبێ، تاوای لێدێت ناتوانین بیژمێرین (بەڵام لەهەقیقەت هەر سێپەڕە).

**پرسیار:** چی دەزانی دەربارەی فاڵچی (کاهن)یەکان؟

**وەڵام:** فاڵچی ئەو جۆرە کەسانەن کە بۆ چاو بەستەکی کڵاو لەسەری خەڵکی ئەنێن و لافی غەیب زانینی لێ ئەدەن، کە گوایە ئەو شتانەی پەنهانن ئەوان پەی پێ دەبەن ئەمەش ڕاست نییە چونکە ئەگەر یەکێک ئەم ڕاستیەیان لانەدرکێنێ ئەوان ناتوانن دانی پیابهێنن...

ئەوەی کە پێشیان دەڵێ (جنۆکە) کانن، چونکە ئینسانی بێبڕوا پەیوەندی پەیدا دەکات لەگەڵ (جنۆکە)کان هەندێک هەواڵ هەیە لە فریشتەکان دەدزن و دێن بەدۆستەکانی خۆیان ڕادەگەیەنن...

هەروەک الله تعالی دەفەرمووێ: **(إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ)**الأعراف٢٧، واتە: ئێمە جنۆکەکانمان کردۆتە دۆستی ئەو کەسانەی کە بێبڕوان.

بەڵام ئینسان لەڕێگەی خواناسیەوە پەیوەندی خۆی لەگەڵ فریشتەکان دەبەستێ، بۆیە بڕواداریش هەندێک قسە هەیە کەدەیکات ڕاست دەردەچێ، هەروەک الله تعالی دەفەرمووێ: **(إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا)**فصلت.٣٠، واتە:ئەوانەی کەدەڵێن الله پەروەردگارمانە و ئینجا جێگیر دەبن لەسەر باوەڕەکەیان ئەو دەمە فریشتەکان دێنە لایان و پێیان دەڵێن: مەترسێن و مەشڵەژێن.

کەواتە: پیاوی بێبڕوا ڕاستیەکان لە جنۆکەکان وەردەگرن پیاوی بڕواداریش ڕاستیەکان لە فریشتەکان وەردەگرن.

لە عائشە (ڕەزای خوای لێبێ ) دەگێڕنەوە دەفەرمووێ: **(سَألَ رَسولُ اللَّه ﷺ النَّاسُ مَنْ أنْهان،فَقالَ لَيسَ بشَئٍ،فقالوا يارسولُ اللَّه أنْسَهُم يَخشونَ بالشئ يَكونُ حَقاً،فَقالَ النَبي ﷺ تِلكَ مِنَ الحَق يَحْفظُها الجَنيَ فيرقُرها في أنِنِ وليهُ كَقرقرة الدَجاجِ فَيخلُطُ حَقُها أكثَر مِن مِأتةِ كَذِبَة...)** رواه البخاري ومسلم، واتە: پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فاڵچی ئەویش فەرمووی: هیچ شتێک نین، ئەوانیش گوتیان ئاخر ئەوانە باسی هەندێک شت دەکەن دوایی بەڕاست دەردەچێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەو قسەیەی کەدەیکەن هەرئەوەندەی ڕاستە کە جنۆکەکان لە(فریشتەکان)ی دەدزن وەک قیرەی مریشک دەیچرپێننە گوێی شوێن کەوتووەکانیان ئەوانیش سەد درۆ تێکەڵ بەڕاستیەکە دەکەن.

**پرسیار:** ئایا مەولودنامەی کوردی چۆن هەڵدەسەنگێنی؟

**وەڵام:** ئەگەر گەشتێک بەنێو باغی لالەزاری پەڵەداری نالەباری پڕ ئەفسانەی کتێبی(مەولودنامە)دا بکەین، کەناوی پڕ بەپێست و ڕاستەقینەی کتێبی(پڵاوان)ە، دەبینین کە نەک مەولودنامە نییە بەڵکو فرێکی بەژیانی پێغەمبەر ﷺ نییە، بۆ ڕاستی قسەکانیش ئێمە لەحەوت خاڵان کتێبی ناوبراو لەبێژینگ دەدەین:

خاڵی یەکەم: چەند ڕیوایەتێکی بێ بنچینە و درۆ:(مەولودنامەی ناوبراو) لە سەرەتاوە چەند قسەیەکی هەڵبەسترا و درۆ پاڵ دەداتە لای چەند زاتێکی گەورە لەیارانی پێغەمبەر ﷺ و زانا و ناودارانە ئیسلام، بۆ وێنە چوار جێنشینەکەی پێغەمبەر ﷺ و (شێخ مەعروفی کەرخی)و(فخر الدین الرازي)کە گوایە فەرموویانە:

هەرکەسێک تەنیا درهەمێک خەرج بکات بۆ ئاهەنگی لەدایک بوونی پێغەمبەر ﷺ ئەوا بەڕەی خۆی لەئاوێ دەرێناوە و بۆخۆی بەپێلاوەوە حەوت پشتیشی لەگەڵ دەچنە بەهەشتێ، کەواتە نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و جەنگ و جیهاد و لەسەر چەوساوان کردنەوە و بەگژ زۆرداران داچوون و...هتد چش و سفری دوای فاریزەن!!

خاڵی دووەم: چەند بەسەرهاتێکی ئەفسانەیی دژ بەئیسلام: دەگێڕنەوە لەشاری(بصرة) کابرایەک هەبوو هەتا بڵێی چەتوون و نەگبەت و بێخێر و نوێژ نەکەر، خوانەناس، لامەزەب!! هێندە بەدفەڕ و نەگریس و پیس بوو کەمرد خەڵکی لەگۆڕستانی موسوڵمانان نەیان شاردەوە و فڕێیان دایە سەر زبڵدان، شەوێ، خەڵکی لەخەوێدا دیتیان ئەوە لەنێو باغ و کۆشک و تەلاری بەهەشتێ دایە و دەستەملانی حۆریانە، لێیان پرسی: کابرا ئەوە بەچی ڕزگارت بوو چۆن بەو پلە و پایە بەرزە گەشتی؟!

لەوەڵامدا گووتی: من هەموو ساڵێ بەبۆنەی یادی لەدایک بوونی پێغەمبەر ﷺ مەولودێکم دەکرد!!

کەواتە بەکورتی و بەکوردی ئەم بەسەرهاتە پێمان دەڵێ (مەولود) خوێندنەوە پاساپۆرتێکە هەرکەسێک پێی بێ ئەگەر خراپترین و بێدینترین کەسیش بێ، هیچ کەس ناتوانێ ڕێی چوونە بەهەشتی لێبگرێ.

خاڵی مەولودی پێغەمبەر ﷺ کراوەتە قەڵغان و بەلا گێڕەوەی سەری زۆرداران:

لەم کتێبەدا دەڵێ: کاربەدەستێکی زۆر ستەمکار و چەوسێنەرو غەددار هەبووە ڕۆژێکی ئامۆزایەکی خۆی بەخەنجەرەوە لەسەر سەری ڕادەوەستێ و پێی دەڵێ کێ ڕزگارت دەکات لەدەستم؟!

ئێستا سەرت دەبڕم بە خنجەر!

ئەویش خواو ڕاسان بەزاری دادێ و دەڵێ:(قوتارم دەکات مەولودی پێغەمبەر ﷺ ؟!

ئیدی دەست بەجێ ئەو قسەیە دەبێتە قەڵغانێک و جادووی ئامۆزاکەی پێ هەڵدەوەشێنێتەوە و خشتێک لەدیوار دەردەپەڕێ و بەر دڵی ئامۆزاکەی دەکەوێ جێبەجێ فەراقی ڕەشی لێ دەبڕێ!!

جا ئەو جار لە ئاسمانەوە بانگی کابرای ستەمکار و زۆردار و غەددار دەکرێ: بۆخاتری مەولودی پێغەمبەر ﷺ ڕزگارمان کردی!!

جاوەرە چاک سەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەە و بۆحاڵی موسڵمانان مەگریە!

پێغەمبەرێک ﷺ لە هەموو ژیانیدا دانووی لەگەڵ زۆردارێک نەکوڵابێ، ئێستا خوێندنەوەی مەولودێک ببێتە بەلاگێڕەوەی سەری زۆرداران!!!"

خاڵی چوارەم: ترەکەڵەکی گاوماسییان: کتێبی ناوبراو کاتێ باسی حاڵ و باڵی دونیا و چۆنیەتی ڕاوەستانی خرۆکەی زەوی دەکات، دەڵێ: ئەرز لەسەر بەردیە بەرد لەسەر گایە، گا لەسەر ماسییە ،ماسی لەسەر ئاوییە، ئاو لەسەر بایە، با لەسەر هەواییە، هەوا لەسەر تاریکی ڕۆن درایە، لەژێر تاریکی کەس نازانێ چ باسە و چ هەرایە....)!؟"

دە جارە وەرە کەسێک شارەزای ئیسلام نەبێ ئاگای لە سورەتی(یس) نەبێ، ئەم قسانەش بە شتێک لەئیسلامی بزانێ و پێی وابێ لە قورئان و سونەت وەرگیراون، جابا هەتا پێی پێوەن، لەئیسلامی واو قورئان و سونەتی ئەو تۆ ڕائەکات، کە(ترە کەڵەکەکە)هێندە عەجایب سازدەکات.

خاڵی پێنجەم: دەیان دەریا و پەردە و هەرا و هۆریایی خەیاڵکرد: کتێبی ناوبراو دەستی خستۆتە ناو کاروباری غەیبەوە، بۆ وێنە کاتێ دێتە سەر پەیدا بوونی گیان(روح)ی پێغەمبەر ﷺ بەڕاشکاوی وەک کتێب گرەوە و فاڵچیەکان کارامە دەڵێ: گیانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە هەزار ساڵە لە فلان دەریادا و لەپشت فلان پەردە و فیسار جۆرو....هتد.

هەڵبەت ئەمە درۆیەکی گەورەیە بەدەم ئەم ئاینەوە هەڵبەستراوە پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: **(مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّار)** رواه الترمذي، واتە: هەرکەسێک بەئەنقەست درۆ بەزمانمەوە هەڵبەستێ، با جێی خۆی لە ئاگری(دۆزەخدا)هەڵگرێ.

خاڵی شەشەم: درۆ هەڵبەستن نەک هەر بەزمانی پێغەمبەرەوە ﷺ بەڵکو بە فەرموودەی خواشەوە: هەر لە کتێبی ناوبراودا دەڵێ: دخالت يا رسولی كلی عالەم لەبۆتۆ خەلق كرا حوا و أدم بەحەق ئايەتی (لولاک لوكاک) لەبۆتۆ دانراوە جملة أفلاك وەک دەبینین (لولاک لولاک ماخلقت أفلاك)کە هەندێک کەسی نەزان و بێ ئاگا بە فەرموودەیەکی(قدسي) پێغەمبەر ﷺ لەقەڵەم دەدەن ئەمەش سەربارى ئەوەی کە(حديث)نییە و لەهیچ سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو نییە.لەگەڵ عەقڵ و شەرعیشدا ناگونجێ چونکە الله تعالى دەفەرمووێ: **(وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)**الذاريات٥٦، واتە:جنۆکە و مرۆڤم بۆ هیچ دروست نەکردووە تەنها بۆ پەرستن نەبێت.

جا ئەگەر(جنۆکە و مرۆڤ)ی بۆ هیچ دروست نەکردبن حەتمەن بونەوەریشی بۆ هیچ کەس دروست نەکردوون.

خاڵی حەوتەم: دەردی لەهەموو دەردان گرانتر: لە کتێبی ناوبراودا ئەوەیە کە بەناو بۆ ئەوە نوسراوە کە لە یادی لەدایک بوونی پێغەمبەر ﷺ بخوێندرێتەوە، بەڵام لەگەڵ مەلا گوتی پێغەمبەر ﷺ لەدایک بووا!

هەڵدەستنە پێ و لەدوای مەلایەوە بەرەو قیبلە ڕیز دەبن و دەست بەرەو سەرێ بەرز دەکەنەوە و هەندێک دوعایان دەکەن ئیدی ئاهەنگی مەولود کۆتایی پێدێ و دەست دەکرێ بەتەقە و ڕەقە و خرینگە و زرینگەی پەرداخ و پیاڵەو قاپ و کەوچک و دەبێتە هاشە و لووشی خواردن و خواردنەوە ئاوێ بێنە و دەستان بشۆ!!

جا تەماشاکەن و ڕابمێنن و وورد بینەوە!!

ژیانی هەموو ئینسانێک لەو ڕۆژەوە دەست پێدەکات کەتێیدا لەدایک دەبێ پێغەمبەریش ﷺ ئینسانە وەک هەموو ئینسانێک و پاش ژیانێکی(٦٣)ساڵەیی لە دونیا دەرچووە.

کەواتە کەسێک بیەوێ یادی پێغەمبەر ﷺ بکاتەوە و بزانێ کێ بووە و چۆن بووە و چی کردووە و چۆن ژیاوە...هتد دەبێ لەماوەی ئەو (٦٣)ساڵەدا بکەوێتە گەڕان و پشکنین و تێوەروان و سەرنجدان!!

**پرسیار:** ئایا مەولودی پێغەمبەر ﷺ کەی داهێنرا؟

**وەڵام:** بەکۆڕا(اجماع)ی زانایان گێڕانی(مەولود) کارێکی داهێنراوە بیدعەیە، چونکە نە لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ نە لەسەردەمی یارەکانی و نە لەسەردەمی تابعینەکان نەبووە.

هەروەک (السخاوي) دەڵێ: **(أن عمل المولد حدث بعد القرون الثلاثة)** واتە: مەولود گێڕان لەدوای سێ سەدەکە داهێنراوە.

وە یەکەم کەس کە مەولودی داهێنا پیاوێک لە (قاهیرە)کە ناسراو بوو بە(المعز الدين اللَّه الفاطمي) لەساڵی(٣٦٢)ی کۆچی بوو.

پاشان ئاهەنگ گێڕان درێژەی تا ئەو کاتەی سەرکردەی سوپاکانی (بدر الجمالي)لە ساڵی(٤٨٨)ی کۆچی لەسەردەمی (المستعلي باللّه) بڕیاری ڕاگیرانی دا، بەڵام لەساڵی(٤٩٥)ی کۆچی کاتێ کە خەلافەت کەوتە دەست پیاوێک کەناسراو بوو بە(الأمر بأحكام اللَّه بن المستعلي)دووبارە ئاهەنگی مەولودی زیندوو کردەوە.

وە لە عێراقیش یەکەم کەس کە ئەم یادەی داهێنا(سلطان مظفر أبو سعيد) لە شاری هەولێر لە سەدەی شەشەم یان حەوتەم بوو.

ئینجا لە ساڵی(٦٤٤)ی کۆچی کتێبێک لەلایەن(الحافظ ابو الخطاب عمر بن الحسن) ناسراو بە(أبن دحية الكلبي)دانرا بەناوی(التنوير البشير النذير)کە تیایدا ئاهەنگی مەولودی بەچاک زانیوە و چەند بەڵگەیەکی لەسەر کردۆتەوە.

بەم جۆرە ئاهەنگی مەولود سەری هەڵدا و شێوازەکانی گۆڕانکاری و پێشکەوتنی بەسەرداهات تا گەیشتە ئەم قۆناغەی ئێستا.

**پرسیار:** (الولاء والبراء)ماناى چییە؟

**وەڵام:** (الولاء) بەچەند مانایەک دێت، لەوانە:

نزیک بوونەوە یان دۆستایەتی یان سەرخستن یان وەرگرتن یان شوێنکەوتن، ئەمانەی کە باسیش کران بۆ غەیری الله پاشان پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان دروست نییە ئەنجام بدرێ...

هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(لَّا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ...)**أل عمران٢٨، واتە: با بڕواداران کافران بەغەیری بڕواداران نەکەن بەدۆستی خۆیان.

(البراء) واتە: خۆ دوورگرتن یان خۆبەری کردن یان ڕق لێهەڵسان ی دوژمنایەتی...هتد دێت.

ئەمانەشى کەباسکران دەبێ تەنها بۆ الله نەناس و بێباوەڕان دەربڕێ.

هەندێک جاریش ئەگەر موسڵمانێک گوناهێکی کرد دەبێ بەقەد تاوانەکەی خۆتی لێ دووربگری.

هەروەک کاتی خۆی ئیبراهیم پێغەمبەر(علیە والصلاة والسلام) خۆی بەری کرد لە باوک و ئەم کردەوە ناپەسەندانەی کەس باوکی و گەلەکەی دەیانکرد، هەروەک دەفەرمووێ: **(إِنِّي أَرَاكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ)** الأنعام٧٤، واتە:بەڕاستی ئەی باوک من تۆش و گەلەکەت بە گومڕاییەکی ئاشکرا دەبینم.

یان دەیگوت: **(قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ)** الأنعام٧٨، واتە: (ئیبراهیم)گوتی: ئەی گەلی خۆم من بەریم لەو هاوبەشیەی کە بڕیارتان داوە بۆ الله تعالى.

**پرسیار:** پلە و گرنگی(الولاء والبراء)لە شەریعەتدا چییە؟

**وەڵام:** (الولاء والبراء)لە شەریعەتی ئیسلامدا گرنگیەکی زۆری پێدراوە بەم جۆرەی خوارەوە:

١)(الولاء والبراء)بەشێکی گرنگە لە شایەدمانی(لا اله الا اللّٰه) چونکە (لا اله) خۆ بەری کردنە لە هەموو ئەو کەسانەی خۆی بە خوا حسێب دەکەن.

یان ئەوانەی کەمافی خوایان زەوت کردووە (الا اللّٰه)ش داهێنانە بەخوایەتی ئەو خوایە.

٢)(الولاء والبراء) پتەوترین پەتی ئیمانە: پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ دەفەرمووێ: **(أَوْثَقُ عُرَى الْإِيمَانِ الموالاة في الله، والمعادة في الله، والْحُبُّ فِي اللَّهِ وَالْبُغْضُ فِي اللَّهِ)**رواه الطبراني وأحمد و أبن أبي شبيه وهو حسن، واتە: پتەوترین پەتی باوەڕ بریتیە لە دۆستایەتی بۆ اللّٰه و دوژمنایەتی بۆ اللّٰه (هەروەها خۆشەویستی بۆ اللّٰه و ڕق لێبوونەوە بۆ اللّٰه) واتە:هەرکەسێک خۆشەویستی و ڕق لێبوونەوەی بۆ اللّٰه بێت ئەوە پتەوترین ئیمانی هەیە.

٣)لەڕێگەی(الولاء والبراء)تامی ئیمان دەچێژرێ، هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حلاَوَةَ الإِيمَانِ:أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ لِلَّهِ، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ ألى الْكُفْرِ بعد اذ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ أنقذهُ اللَّهُ فِي النَّارِ)**متفق عليه. واتە: سێ شت هەن لەهەرکەسێکدا هەبێ ئەوا تامی باوەڕ دەچێژێ:

*اللّٰه پاشان پێغەمبەری ﷺ لە هەموو کەس خۆشتر بوێ...

*لە پێناو اللّٰه یەکێکت خۆش بوێ...

*پێی ناخۆش بێ لەدوای باوەڕهێنان کافر ببێتەوە، وەکو ئەوەی کە پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوە.

٤) (الولاء والبراء) باوەڕی تەواوی پێ دادەمەزرێ، هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ وَ أَبْغَضَ لِلَّهِ وَأَعْطَى لِلَّهِ وَمَنَعَ لِلَّهِ ، فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ)**متفق عليه. واتە: هەرکەسێک خۆشەویستی و ڕق بوونەوەی بۆ اللّٰه بێ، بەخشین و نەبەخشینی بۆ اللّٰه بێ ئەوا باوەڕەکەی تەواو دەبێ.

٥)هەرکەسێک غەیری اللّٰه و ئاینەکەی خۆش بوێ و غەیری اللّٰه ی مەبەست بێ ئەوا کافر دەبێت:هەروەک اللّٰه تعالی دەفەرمووێت:**(وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ)** المائدة٥١، واتە: هەرکەسێک دۆستایەتیان لەگەڵ بکات ئەوا لەوانە.

**پرسیار:** له (الولاء والبراء)خەڵكی دەكرێته چەند بەش؟

**وەڵام:** خەڵكی دەكرێن به سێ بەش كەبریتین له:

١) ئەو كەسەی كه شیاوی( ولاء)ێكی تەواوه: كەبریتین له بڕواداران و خواناسان، هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(لَّا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ)**أل عمران٢٨، واته: نابێ بڕواداران بێبڕوایان بكەن بەدۆستی خۆیان له جێی بڕواداران.

٢)ئەو كەسەی لەنێوان دوو لایەن دایه: واته لەگەڵ ( ولاء) هەندێک جاران(براء)یشت بۆی هەبێ ئەوانەش بڕوادارانی گوناهبارن، هەروەک لەكاتی خۆی عبدالله كوڕی خُمار بەسەر خۆشی هاتەوه خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لەو كاتەدا یەكێک له هاوەڵەكان نەفرەتی لێكرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **(تلعنه نَّهُ يُحِبُ اللَّهُ ورسُولهُ)**رواه البخاري، واته: نەفرەتی لێ مەكه چونكه الله پاشان پێغەمبەری ﷺ خۆش دەوێ.

٣)ئەو كەسەی دەبێ بەتەواوی لێی بەری بیت: ئەویش ئەوانەن كه بێبڕوا و تاغوت و الله نەناسن، هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَىٰ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ)** الممتحنة٩، واته: الله تعالى قەدەغەی كردووه كه دۆستایەتی لەگەڵ ئەوانەدا بكەن كەوا شەڕتان لەسەر دین لەگەڵ دەكەن و دەرتان دەكەن لەسەر ماڵ و حاڵتان، ئەوانەیش كه یارمەتی ئەوان دەدات لەسەر دەركردنتان، هەركەسێک دۆستایەتیان لەگەڵ بكات ئەوا ئەو كەسه زاڵم و زۆرداره.

**پرسیار:** چۆن دۆستایەتی (ولاء) بۆ ئیسلام و موسڵمانان دەربڕین؟

**وەڵام:** بەم خاڵانەی خوارەوە:

١)کۆچ کردن لەشاری خوانەناسان بۆ شاری موسوڵمانان: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(إني بَرِئٌ مِنْ مُسْلِمٍ يُقيمُ بَيْنَ أظهُرِ المُشركينَ)**رواه أبو داود، واتە: من بەریم لەو موسڵمانانەی لەنێو موشریکاندا بمێننەوە.

٢)سەرخستنی موسوڵمانان و یارمەتی دانیان بە گیان و بە ماڵ و بە زمان: هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَإِنِ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ)** الأنفال٧٢، واتە: ئەگەر لەسەر ئاینەکەیان داوای کۆمەک و سەرکەوتنیان لێکردن لەبەردەم دوژمنان ئێوە لەسەرتانە کەیارمەتیان بدەن و سەریان بخەن.

٣)بەشدار بوون لەخۆشی و ناخۆشی بڕواداران: هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى)**رواه مسلم، واتە: نموونەی بڕواداران لە خۆشەویستیان و نەرم و نیانیان لەگەڵ یەک و ئاوڕدانەوەیان لەیەکتر وەکو یەک لەش وان، چۆن ئەندامێکی بێتە ئێش ئەوا هەموو ئەندامەکانی تری دێتە ئێش و تووشی بێ خەوی و تا ئەبێ!

٤)ئامۆژگاری کردن و خۆشویستن و فێڵ نەکردن لە بڕواداران هەروەها چۆنی بۆخۆی پێخۆشە واشی بۆ براکەی پێخۆش بێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ)**مسلم، واتە: باوەڕی نییە هیچ کەس لە ئێوە ئەگەر چۆنی بۆخۆی پێخۆشە بۆ براکەی خۆی پێخۆش نەبێ.

٥)گاڵتە نەکردن و عەیب نەگرتن لە بڕواداران: اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰ أَن يَكُونُوا خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِّن نِّسَاءٍ عَسَىٰ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ ۖ وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ ۖ بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ)** الحجرات١١، واتە: ئەی بڕواداران با هیچ کۆمەڵە پیاوێک گاڵتە و لاقرتێ نەکا بەهیچ کۆمەڵە پیاوێ تر،،چونکە لەوانەیە لای اللَّه چاتر بن لە گاڵتەکەرەکان، وە با هیچ کۆمەڵە ئافرەتێ گاڵتە نەکات بە هیچ کۆمەڵە ئافرەتی تر،چونکە لەوانەیە ئەوان چاتر بن لای اللَّه لەوانەی گاڵتە ئەکەن.

هەروەها عەیب لەخۆتان مەگرن (چونکە عەیب گرتن لە موسڵمانێک عەیب لە خۆت) ئینجا بانگی یەکتر مەکەن بەناو و لەقەبی ناشیرین و خراپ، هەروەها خراپترین شت ئەوەیە کە ئادەمیزاد ناوبانگی گوناه بکەوێتە شوێنی دوای ئەوەی کە باوەڕی هێنا هەر کەسێک نەگەڕێتەوە ئەوا بەزۆرداری دەمێنێتەوە، ئینجا ئەی بڕوادارینە واز بهێنن لە زۆربەی گومانەکان، چونکە هەندێک گومان تاوانە، هەروەها بە نهێنی داوای

عەیبی یەکتر مەکەن، هەندێکیشتان پاش ملە باسی یەکتر مەکەن ئایا هیچ کەس لەئێوە پێی خۆشە گۆشتی براکەی خۆی بخوات بە مردوویی؟ کە ئەمانەتان پێناخۆشە کەواتە لە الله بترسن چونکە ئەو تۆبەکانتان وەردەگرێت و بەزەیی پێتاندا دێتەوە.

٦)لە کاتی خۆشی و ناخۆشی لەگەڵ بڕواداران دابیت: ئەمەش پێچەوانەی حاڵی دوو ڕووەکانە هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ اللَّهِ قَالُوا أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوا أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ)** النساء١٤١، واتە: ئەوانەی لێتان دانووساون ئەگەر اللَّه تعالى ئێوەی سەرخست، دەڵێن: ئەی ئێمە لەگەڵ ئێوە نەبووین؟ بەڵام ئەگەر کافرەکان سەربکەون دەڵێن: ئەی ئێمە ئێوەمان دوور نەدەخستەوە لەئیسلام و ڕێمان لێ نەگرتن لەوەی تێکەڵ بە بڕواداران نەبن؟

٧)سەردان کردن و کۆبوونەوە لەگەڵ بڕواداران: هەروەک اللَّه تعالى لە فەرموودەیەکی قودسی دا دەفەرمووێ: **(وَجَبَتْ مَحَبَتِي لِلمتَزَاوِرِينَ فِيَّ)** الترمذي واتە: ئەو کەسانەم خۆش دەوێ کەلە پێناو من سەردانی یەکتر دەکەن.

٨)ڕێزی یەکتر گرتن و حەقی یەکتر دان: هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(ألا لايَبيعُ الرُّجل عَلىَ بَيعِ أخيهِ وَلا يَخطُبْ عَلىَ خِطبَتِهِ)** البخاري، واتە: با هیچ کەس لەسەر براکەی تر گران نەکات هیچ کەسێکیش داخوازی ئافرەتێک لەسەر داخوازی براکەی نەکات.

٩) نەرم و نیانی و بەزەیی بە لاوازان: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **(لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرحَم صَغيرَنَا وَيُوَقِّرَ كَبيرَنَا)** (رواه أبو داود بسند صحيح) واتە: لە ئێمە نییە ئەو کەسەی کەبەزەیی بە بچووکەکان نەیەتەوە و ڕێز لە بە ساڵاچووەکانمان نەگرێ.

١٠)پاڕانەوە و داوای لێخۆش بوون بۆ یەکتری: هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ)** محمد١٩، واتە:داوای لێخۆش بوون بۆ گوناهی خۆت و پیاو و ژنە بڕوادارەکان بکە.

**پرسیار:** پله و حاڵەتەکانی دۆستایەتی کردنی کافران چۆنە؟

**وەڵام:** دەتوانین ئەو پله و حاڵەتانه بۆ چوار پله و جۆر دابەش بکەین:

یەکەم: ئەو پله و حاڵەتانەی که موسوڵمان پێی دووچاری کوفر و هەڵگەڕانەوە دەبێ وەک:

١)دۆستایەتی کردنی موتلەق و هەمەلایەنه(التولي المطلق)

٢)خۆشویستنیان لەبەر ئاینەکەیان(دوای گۆڕان و دەستکار کردنیان)

٣)فەرمانبەری کردنیان بەدڵ و قەناعەتەوە لەمەسەلەی یاسادانان(التشريع)دا.

٤)بەخۆزگە خواستنی سەرکەوتنیان بەسەر موسڵماناندا.

٥)قەناعەت بوون بەوەی که وەک موسڵمانانن و یەکسانن و موسڵمانان هیچ ئیمتیازێکیان بەسەریاندا.

٦)خۆ لێبردنه پێشیان و ماستاو بۆ گرتنەوەیان بۆ ڕازی کردنیان لەڕووی خۆشەویستیەوە.

٧)متمانه پێکردنیان و بەئەمیندار دانانیان لەجیاتی موسڵمانان.

٨)هاوکاری و پشتیوانی کردنیان بۆ سەرخستنیان بەسەر موسڵماناندا(به به فشا و ناچاری).

٩)چاولێکردن و لاساکردنەوە و خۆ وێچواندنیان(التشبه بهم) به موتلەقی لەمەسەلەکانی عەقیدە و عیبادەت دا بەتایبەت بەبێ فشار و زۆر ناچارکردن.

دووەم: ئەو پله و حاڵەتانەی به گوناهی گەورە لەقەڵەم دەدرێن بەمەرجێک ئەو شتانه بەحەلاڵ نەزانێ، وەک:

١)نەرمی بۆ نواندن و گەردن بۆ کەچ کردنیان(المداهنة والتذلل لهم)

٢)کردنیان بەجێگای ڕاز و نیاز(أتخاذهم بطانة).

٣)زیادە ڕۆیی کردن لەگەورە گرتن و پایه بەرزکردنەوەیاندا.

٤)چوونه ژێر ڕکێف و دەسەڵات و حوکمڕانیانەوە بەبێ پێویستی و بەرژەوەندیەکی شەرعی.

٥)بەشداری کردنیان لەکاروباری ئاینی و موناسەباتیاندا لەرووی( مجاملة)وە نەک قەناعەت و بڕوا، وە داوای لێبووردن کردن بۆ مردووەکانیان.

٦)لاساکردنەوە و خۆ وێچواندن(التشبه بهم)له هەڵسوکەوت و دروشمەکانیان دا وەک جەژن و مناسەباتی مردن و لەدایک بوون.

٧) نیشتەجێ بوون لەنێوانیاندا بۆ کەسێک کەنەتوانێ دینداری خۆی ئاشکرا بکات و توانای کۆچکردن (هجرة)شی هەبێت.

٨) پیرۆزبایی لێکردنیان بەبۆنەی ئەو دروشمانەیانەوە کەتایبەتن پێیانەوە و دروشم و نیشانەی کوفریشن.

سێیەم: ئەو پلە و حاڵەتانەی کە گوناهی گچکە یان ناپەسەند(مکروه)ن وەک:

١)مەدح کردن و ستایش کردنیان بەبێ پاساودەر(مبرر)ێکی شەرعی،بەڵام نەک لەبەر ئاینەکەیان.

٢)هاوەڵایەتی کردن و لەگەڵ ژیانیان (بەبێ بەرژەوەندیەکی شەرعی).

٣)موتمانەی موتلەق پێکردنیان.

٤)کار لەلاکردنیان لەگەڵ بەسووک سەیرکردن و بێڕیزیدا.

٥)خۆ وێچواندیان لەبەرگ و پۆشاک و نەریتیان(کەتایبەتن بەکوفرەوە).

٦)دوعا بۆکردنیان بەتەندروستی و سەلامەتی و تەمەن درێژی و بەرقەراری.

٧)پیرۆزبایی لێکردنیان لە موناسەباتی ئاسایی دا وەک ژن و ژن خوازی و ڕزگار بوون لەبەڵایەک.

چوارەم: ئەو پلە و حاڵەتانەی کەبەدۆستایەتی(الموالات)دانانرێ و لەخانەی موباح بەولاوە نییە،وەک:

١)چاکە و داوەری لەگەڵ کردنیان و خۆش ڕەفتاری لەگەڵیان،کە ئەمە سەرەڕای موباح بوون خێر و چاکەشە و الله ش فەرمانی پێکردووە.

٢)خێرکردن بەنەدارەکانیان و یارمەتی دانیان.

٣)سەرخۆشی لێ کردنیان بەشێوەیەکی شەرعی.

٤)دیاری بۆ ناردن و دیاری لێ قبوڵ کردن.

٥)وەڵام دانەوەی سەلامیان ئەگەر بەشێوەیەکی دروست نەک موخەنەتی سەلام بکەن.

٦)مامەڵە و بازرگانی لەگەڵ کردنیان لەشتی موباح دا.

٧)خانوو پێدانیان بەکرێ.بەمەرجێک بۆ خراپەی موسوڵمانان بەکاری نەهێنێ وەک بنکەی جاسوسی.

٨)کار پێ سپاردنیان بۆ مەبەستی موباح و شەرعی،لەگەڵ هەبوونی توانای دەرخستنی مسوڵمانێتی دا.

٩)لەنێوانیاندا مانەوە و نیشتەجێ بوون بۆ مەبەستی شەرعی،لەگەڵ توانای دیداری کردن دا بە ئاشکرا.

١٠)سەردان و هامشۆیان بۆ مەبەستی شەرعی

١١)کەڵک لێ وەرگرتنیان لەبواری پیشەسازی و کاروباری دونیایی و ئەوەی ئەوان تێیدا شارەزاترن.

١٢)خواردنی خواردەمەنی یان ژن لێهێنانیان، ئەگەر ئەهلی کتێب بن(لە جوولەکە و دیانەکان)لەکاتی پێویستدا.

**پرسیار:** ئایا ئەگەر زۆری لە موسڵمانێک بکەن کەواز لە ئیسلام بهێنێ یان بەزۆر ملی پێکەچ بکەن، ئایا ئەمە لەشەریعەتی ئیسلامدا حوکمی چییە؟

**وەڵام:** بۆ موسڵمان لە سێ حاڵەت بەدەر نییە:

١)لە ناوەڕۆک و روخسار(الظاهر والباطن)بە کوفر ڕازی بێ: ئەمەش خاڵێکە لەهەرکەسێک دا هەبێ ئەوا کافر دەبێ و لە ئیسلام دەردەچێ.

٢)لە ناوەڕۆک و دڵەوە ڕازی بێ بە کوفر بەڵام بە ڕوخسار پێی ڕازی نەبێت: ئەمەش وەک خاڵی یەکەم هەر لە ئیسلام دەردەچێت و بە دووڕوو(منافق)ناو دەبرێ.

٣)تەنها بە ڕوخسار بە کوفر ڕازی بێت بەڵام لە دڵ و ناخەوە بێزت لێ بێ و بیبوغزێنی ئەم خاڵەش دەکرێت بە دوو بەش:

یەکەم: ئەگەر کەسێک بەزۆرە ملێ بە کوفر ڕازی بێ یان نزیک بێ بیکوژن یان ئازاری بدەن وەک هەڕەشە، ئەوا لەم حاڵەتە ئەم ئینسانە بەکافر دانانرێ بەمەرجێک دڵی هەر پڕ بێت لە ئیمان، بەڵگەش ئەمەیە کەکاتی خۆی عەمماری کوڕی یاسر (اللَّه لێی ڕازی بێت) ئازارێکی زۆریان دا و زۆریان لێکرد کە بە چاکە ناوی بتەکانی قوڕەیشە کافرەکان بهێنێ، بەڵام کەهاتە لای پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە ئەویش پێی فەرموو: **(فَانْ عَادُوا فَعُدْ...)** واتە: ئەگەر کافرەکان دووبارە ئازاریان دای ئەوا تۆش بەقسە ڕازیان بکە، بەڵام واچاکترە موسوڵمانان لەم کاتەدا دان بەخۆدا بگرن ئەو دەمە خێری زیاتر بۆ دەنوسرێ، هەروەک کاتی خۆی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دانیان بەخۆدا گرت...

لە کاتێکدا کەئازار دەدران، ئازاردانی بیلالی حەبەشی (اللَّه لێی ڕازی بێت) بەڵگەی ئەم ڕاستیەیە....

دووەم: بەڕووخسار ڕازی بێت بە بێبڕوایان بەپێچەوانەی دڵەکانیان، ئەویش لەبەر چەند هۆکارێکی دونیایی یان خۆشویستنی گەورایەتی....هتد

بۆ ئەم خاڵە زانایان دوو ڕایان هەیە:

هەندێک دەڵێن: ئەم خاڵە لەهەرکەسدا بێتە دی کافر دەبێ و لەئیسلام دەردەچێ بەپێی ئەم ئایەتە: **(ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الْآخِرَةِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ)**النحل١٠٧،واتە: بەم جۆرە ئەوان لەبەر ئەوەی ژیانی دونیایان بەسەر دوارۆژدا ویست بەڕاستی اللە ڕێنمایی بێبڕوایان ناکات.

هەندێک دەڵێن: کافر نابێت بە کوفرێکی گەورە (الکفر الکبیر) بەڵام کوفرێکی بچووک (الکفرالأصغر) ی تیا دێتە دی کەئەویش بریتیە لە گوناهە گەورەکان(الکبائر)کوفری بچوکیش ئینسان پێی لە ئیسلام ناشۆرێ.

**پرسیار:** اللَّه تعالى پاشان پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و مێژووی ئیسلام چ دەفەرموون دەربارەی خۆشەویستی (الموالاة) دەربڕین بۆ کافران؟

**وەڵام:** یەکەم: اللَّه تعالى دەفەرمووێ:

أ) **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تُطِيعُوا الَّذِينَ كَفَرُوا يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ فَتَنقَلِبُوا خَاسِرِينَ)**ال عمران١٤٩،واتە: ئەی بڕواداران ئەگەر ئێوە بەگوێی بێبڕواکان بکەن، ئەوا پاشگەز دەبنەوە لەو پەیمانەی کەلەگەڵ خواتان بەستووە (واتە: لەئیسلام دەشۆڕێن) دووچاری خەسارەتێکی زۆر دەبن.

ب) **(وَلَا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ)**هود١١٣، واتە: بە ئاستەمیش مەیل مەکەن بەلای ئەوانەی زوڵمیان کردووە ئەگەر نا دووچاری ئاگری دۆزەخ دەبن.

ج) **(مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَن يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَىٰ)**التوبة١١٣،واتە:بۆ پێغەمبەری الله ﷺ و بڕواداران نەهاتووە کە داوای لێبووردن بۆ هاوتا پەرستان بکەن ئەگەر چی خزم و تیرەشیان بن.

د) **(لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ)**المجادلة٢٢،واتە: تۆ بڕوادارێکت چنگ ناکەوێ کە بڕوایان بە اللَّه و ڕۆژی دوایی هەبێ دۆستایەتی بکەن لەگەڵ ئەوانەی کەدوژمنایەتی الله پاشان پێغەمبەریان کردووە ئەگەرچی باوکەکانیان یان کوڕەکانیان یان عەشیرەتەکەیان بن.

هـ) **(إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ ۚ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا ۚ فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا)** النساء٩٧، واتە: بێگومان ئەوانەی کە فریشتەکان گیانیان کێشان و لەحاڵێکدا کە ستەمیان لەخۆیان کردبوو، بەهۆی کۆچ نەکردنەوە پێیان گوتن: لە چی وەزعێکدا بوون؟گوتیان چەوسێنراوە بووین لەزەویدا و توانای ڕاکردنمان نەبوو.

فریشتەکان گوتیان: ئەدی زەوی اللَّه فراوان نەبوو کەکۆچتان تێدا کردبا؟جائەوانە شوێنیان دۆزەخە و خراپترین سەرەنجامیش ئەوێیە.

و) **(وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ)** البقرة١٢٠، واتە: جولەکە و دیانەکان لێت ڕازی نابن تاوەکو دوای بەرنامەی ئەوان نەکەویت.

ز) **(وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ)** التوبة٢٣، واتە: هەرکەسێک لەئێوە دۆستایەتیان لەگەڵدا بکات ئەوا دەکەونە ریزی زۆردارانەوە.

دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ:

أ) **(مَنْ تَشَبَّهَ بِقَومٍ فَهوَ مِنْهُمْ)**رواه أحمد وأبو داود. واتە: هەر کەسێک بچێتە سەر شێوەی کۆمەڵێک ئەوا لەوانە.

ب) **(مَنْ كَثَّرَ سَوادَ قَومٍ فَهوَ مِنْهُمْ)** واتە: هەرکەسێک ژمارەی کۆمەڵێک زۆر بکات ئەوە لەوانە.

ج) **(سَيَكونُ آمراءُ فَسقَةٌ جَورةٌ فَمَنْ صَدَقَهُمْ بِكَذِبِهِمْ وَأعانَ عَلَى ظُلمِهِمْ فَلَيسَ مِني وَلَستُ مِنهُ وَلاَ يَردُ عَلَى الحَوضْ)** النسائي والترمذي. واتە: لە داهاتوودا چەند کاربەدەستێکی تاوانبار و ستەمکار دێنە سەر کار جاهەر کەسێک شایەدی بۆ درۆکانیان بدا و ئۆباڵیان بۆ بکێشی، لەسەر ستەم و زۆریان یاریدەیان بدات،نە لە منە و نە من لەوێم نەدەشچێتە سەر ئاوی کەوسەر!!

سێیەم: زانایان دەڵێن:

أ)( أبن الحجر الهيدمي) بەرەحمەت بێ فەرموویەتی: کابرایەکی بەرگدروو چوو بۆ لای(سفيان الثوري) اللَّه تعالى لێی خۆش بێ، پێی گوت: قوربان من جل و بەرگی سوڵتان دەدورم، ئایا لەرِیزی یارمەتی دەرانی زاڵمان (أعوان الظلمة) دەژمێرێم؟!!

سفیان فەرمووی: بەڵکو تۆ خۆت لە ستەمکارانی،بەڵام یارمەتی دەرانی ستەمکاران(أعوان الظلمة) ئەوانەن کە دەرزی و دەزووەکەت پێ دەفرۆشن؟!

ب) دیسان پرسیار لە (سفیان) کرا دەربارەی زۆردارێک کەلە چۆڵاییەکدا خەریکی مردنە، ئایا قومە ئاوێکی دەدرێتێ؟فەرمووی نەخێر،پێی گوترا ئەی بمرێ؟فەرمووی لێی گەرِێ بابمرێ.

ج) (ابن تيمية) بەرەحمەت بێ دەربارەی لەشکری تەتار دەفەرمووێ: ئەگەر منتان بینی لەگەڵ لەشکری تەتاردام و قورئانێکم لەبان سەرم داناوە،ئەگەر منتان گرت یەکسەر بمکوژن، چونکە من ژمارەی لەشکرەکەم زیاد کردووە، (بۆ ئاگاداریش لەشکری تەتار زۆربەیان نوێژکەر و قورئان خوێن و رِیشدار و بەرسمێڵ کەر بوون) بەڵام چونکە یارمەتی (جەنگیز خان) یان دەدا کە پیاوێکی زاڵم و ستەمکار بوو بۆیە دروست نەبوو سەربازیان بۆ بکردبایە.

**پرسیار:** بۆچی نابێ(ولاء)مان بۆ کافران هەبێ؟

**وەڵام:** لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١) **(وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ)**ال عمران١١٨، واتە: بێبڕواکان پێیان خۆشە کە تووشی ناخۆشی و چەرمە سەری ببن.

٢) **(قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ)**ال عمران١١٩، واتە: ڕق و کینەیان بەرامبەر ئێوە ئاشکرا بووە، ئەوەش کەلەدڵیانە ڕقێکی زۆر گەورەتر بەرامبەر بە ئێوە.

٣) **(هَا أَنتُمْ أُولَاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ)**ال عمران١١٨، واتە: ئێوە کۆمەڵێکن ئەوانتان خۆش دەوێ، بەڵام ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێ.

٤) **(وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا عَضُّوا عَلَيْكُمُ الْأَنَامِلَ مِنَ الْغَيْظِ)**ال عمران١١٩، واتە کاتێ دەگەنە لای ئێوە (بەدرۆ) دەڵێن ئێمە باوەرمان هێناوە، بەڵام کاتێ لەلای ئێوە دەڕۆن لەڕقان پەنجەتان لێ دەکرۆژن.

٥) **(إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا بِهَا)** ال عمران ١٢٠، واتە: ئەگەر شتێکی چاکتان پێگەیشت لەداخا نێوچاوانیان ڕەش هەڵدەگەڕێ، بەڵام ئەگەر دووچاری شتێکی ناخۆش بوون دڵیان پێ خۆش دەبێ.

٦) **(وَلَا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ)** البقرة٢١٧، واتە:بەردەوام شەڕتان لەگەڵ دەکەن، تا هەڵتان گەڕێننەوە لەئاینەکەتان.

٧) **(لَا يَرْقُبُوا فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً)**التوبة٨، واتە: هیچ تێبینیەک ناکەن لەو پەیمان و بەڵێنەی کە لەگەڵ ئێوەیاندا بەستووە.

**پرسیار:** دوا ڕۆژە ئەو کەسانە چییە کە دۆستایەتی (الولاء) بۆ کافران دەردەبڕن؟

**وەڵام:**

یەکەم: اللَّه تعالی دەفەرمووێ:

١) **(يَا وَيْلَتَى لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا،لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنسَانِ خَذُولًا)** الفرقان ٢٨-٢٩، واتە: ئەی قوڕ بەسەر خۆم بریا فلان کەسم نەکردبا بە هاوڕێی خۆم، بەڕاستی منی گومڕا کرد لەیادی الله دوای ئەوەی کەفەرمانم پێکرا بوو کەیادی الله بکەم.

٢)**(الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ)** الزخرف٦٧، واتە: لەڕۆژی دوایی هاوڕێیان هەندێک دوژمنی هەندێکیانن، تەنها پارێزگاران نەبێت لە گوناه.

٣) **(هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْۖ لَا مَرْحَبًا بِهِمْۚ إِنَّهُمْ صَالُو النَّارِ،قَالُوا رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِي النَّارِ)** ص٥٩-٦١، واتە: پۆل پۆل دەهێنرێتە ناو ئاگر..(هەواڵی هێنانی پۆلی دووەم دەدرێتە پۆلی یەکەم، جا ئایەتەکە دەڵێ): ئەمەش دەستەیەکە لەگەڵ ئێوە دێنم(بۆ باو دۆزەخ، واتە:بەزاڵ و سەرۆکەکان دەوترێ ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە و دەڵێن):هەی بەخێر بێن ئێوە ئێمەتان تووشی ئەم سزایە کردووە کە قەرارگەیەکی ناهەموارە(ئینجا هەموو پێکەوە دەڵێن:)خوایە هەرچی ئەو سزایە بۆ ئێمە پێشخست (بووە هۆی ئەوەی ئێمە تووشی ببین)دوو چەند دانە سزایەکی بۆ زیاد بکە لەم ئاگرە.

دووەم: پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ:

١)**(المَرءُ مَعَ مَنْ أحَبَ)**رواه مسلم، واتە: ئادەمیزاد لە دونیا لەگەڵ کێ دابێ کێی خۆش بووێ دوارۆژ لەگەڵ ئەو حەشر دەکرێ.

٢)**( الرَجُلُ عَلَى دينِ خَليلهِ)**رواه أبو داود، واتە: پیاو لەسەر ئاینی هاوڕێکەیەتی.

**پرسیار:** دوا ڕۆژی ئەو کەسانە چییە کە دۆستایەتیان بۆ اللَّە دەربڕیوە؟

**وەڵام:** اللَّە تعالى دەفەرمووێ: **(أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ، الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ)** يونس ٦٢-٦٣، واتە: بەڕاستی دۆستەکانی اللَّە ئەوانەن کەنەترسیان لەسەرە و نە خەمباریشن،ئەوانیش ئەو کەسانەن کەبڕوایان هێناوە و بەتەنها لە اللَّە دەترسن و پارێزگار دەبن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللهِ لأُنَاسًا مَا هُمْ بِأَنْبِيَاءَ وَلاَ شُهَدَاءَ يَغْبِطُهُمُ الأَنْبِيَاءُ وَالشُّهَدَاءُ يَوْمَ الْقِيَامَة، قَالُوا يَا رَسُولَ اللهِ تُخْبِرُنَا مَنْ هُمْ. قَالَ:هُمْ قَوْمٌ تَحَابُّوا بِرُوحِ اللهِ...)** رواه الترمذي، واتە: بەندەکانی اللَّە چەند کەسێکن کە نەپێغەمبەرانن و نەشەهیدانن، بەڵکو لەم ڕۆژەدا پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگەیان پێ دەخوازن، ئەوانیش گوتیان: ئەوان کێن ئەی پێغەمبەری ئازیز؟

ئەویش فەرمووی: ئەوانە کەسانێکن کە لەنەرخاتری اللَّە یەکتریان خۆش دەوێت.

هەروەها دەفەرمووێ اللَّە تعالى لەڕۆژی دوایی دەفەرمووێ: **(المتحابُّونَ في جلالي لَهُم مَنابرُ مِن نورٍ يغبطُهُمُ النَّبيُّونَ والشُّهداءُ)** رواه الترمذي، واتە: ئەوانەی لەپێناو من یەکتریان خۆش دەوێ بۆیان هەیە لەچەند مافورێکی درەوشاوە و پرشنگدار کە پێغەمبەران و شەهیدان دەرویان لێ ئەدەن.

**پرسیار:** شێوازەکانی ڕازی بوون بە کوفر چین؟

**وەڵام:**

١) بەکافر لەقەڵەم نەدانی کافرەکان: چ بێباوەڕ(ملحد)چ پاشگەز بوو (مرتد)و چ هاوبەش پەیداکەر (مشرک) بێت، یان گومانی لە کوفری کافرێک هەبێت ئەمەش دەقێکی شەرعیە کەدەڵێ: **(مَنْ شَكَ في كُفرِ كافرٍ فَهوَ كافِر)** واتە: هەرکەسێک گومانی لە کوفری کافرێک هەبێ کافرە) یان ئەگەر یەکێک بەبەڵگە دیار بوو کەکافرە ئەوا دروست نییە تۆ بەکافری نەزانیت.

٢)دۆستایەتی کردنی کافران و ڕازی بوون بە ڕێبازەکانیان:(هەرکەسێک کافران بکات بە دۆست و هاوڕێی خۆی و ڕێبازەکانی پێ بەکەڵک بێ، ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بە کوفر.

**پرسیار:** شێوازەکانی ڕازی نەبوون بە ئیسلام چین؟

**وەڵام:** شێوازەکانی بریتین لە:

١) گاڵتەکردن بە شتێکی زانرا و لەئیسلام: وەک گاڵتەکردن بە الله پاشان بە پێغەمبەران و بە کتێبە پیرۆزەکان و بە بڕواداران...یان بەچەند دروشمێکی ئیسلامی، وەک ڕیشی موسڵمانان یان سیواکێک یان لەچکی ئافرەتێک..هتد.

هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَ آيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ،لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ)**التوبة٦٥-٦٦، واتە: ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت دەڵێن ئێمە گەمە و گاڵتە دەکەین، تۆش پێیان بڵێ: چۆن ئێوە گاڵتە بە اللَّه و ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی دەکەن، هیچ بیانویەک مەهێننەوە، چونکە (تازە) کافر بوونەوە لەدوای ئەوەی باوەڕتان هێنا بوو.

٢) ڕق هەڵسان و تووڕە بوون لەکاتێ کەباسی ئیسلام و الله پەرستی دەکرێ یان کەباسی پێغەمبەر ﷺ دەکرێ: هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الْكَافِرُونَ)** العنكبوت٤٧، واتە: هیچ کەسێک دڵی ڕەق نابێ بە ئایەتەکانی اللَّه تەنها کافرەکان نەبێ، یان دەفەرمووێ: **(وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ الَّذِينَ كَفَرُوا الْمُنكَرَ)** الحج٧٢، واتە: کاتێک کە ئایەتە ڕوونەکانی الله یان بۆ دەخوێنیتەوە یەکسەر نێوچاوانی کافرەکان لە تاوانباریان بەدیار دەکەوێ.

**پرسیار:** دوژمن و ناحەزان بەشیوەیەکی سەرەکی کێن؟

**وەڵام:** بەشێوەیەکی سەرەکی دوژمن و ناحەزانی الله و ڕێباز و کۆمەڵەکەی دوو پێڕن:

یەکەم: بێبڕوایان(الكافرون): کەبەخراپترین گیاندار و جانەوەر لەقەڵەم دەدرێن، هەروەها اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللَّهِ الَّذِينَ كَفَرُوا فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ)** الأنفال٥٥، واتە:خراپترین گیانەوەر لەلای الله ئەوانەن کە بێباوەڕن و بڕوا بە اللَّه ناهێنن.

ئینجا کافرانیش لەنێو خۆیاندا چەند جۆرێکن:

أ) خاوەن کتێبەکان (اهل الكتاب): کە جوولەکە(يهود) و دیان (نصراني)کە اللَّه تعالى لەبارەیانەوە فەرموویەتی: **(وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ وَقَالَتِ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّهِ ۖ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ ۖ يُضَاهِئُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَبْلُ ۚ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ ۚ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ)**التوبة٣٠، واتە: هەندێک لە جوولەکەکان دەیانگوت (عوزەیر) کوڕی خوایە و دیانەکانیش دەیانگوت (عیسی)کوڕی خوایە، ئەمە قسەیەکە لەنێو خۆیاندا باوە،ئەم گوتەیەش هەمان گوتەی گاور و جوولەکەکانی پێشووە، اللَّه بیان کوژێ چۆن دوور دەخرێنەوە لە ڕێگەی ڕاست.

ب) هاوبەش پەیداکەران (المشركون) وەک دەفەرمووێ: **(إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ أُولَٰئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ)** البينة٦، واتە: ئەوانەی کە بێبڕوان لە خاوەن کتێب و بت پەرستەکان لە ئاگری دۆزەخا تیا بە ئێجگاری ئەمانە خراپ ترینی هەموو دروستکراوێکن.

ج) ئاگر پەرست و ئەستێرە پەرستەکان (المجوس و والسائبون) هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئِينَ وَالنَّصَارَىٰ وَالْمَجُوسَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا إِنَّ اللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ)** الحج١٧، واتە:ئەوانەی کەبڕوادارن و ئەوانە کە جوولەکە و ئەستێرە پەرست و گاور و ئاگر پەرستن ئەوانەیش کە هاوبەشیان بۆ اللّٰە داناوە، لەرۆژی دوایی الله تعالى حوکمیان لەنێوان دا دەکا و جیاوازیان لەنێوان دا دەکات بەسەرخستنی ئەوانەی لەسەر هەق و ڕێگای ڕاستیان گرتووە بەسەر ئەوانەی کە ڕێگەی چەوتیان داوەتە بەر.

د) خوا نەناسەکان(الملاحدة، الزنادقة): ئەمانەش ئەوانەن کە هەر ئەسڵەن بڕوایان بەهیچ شتێک نییە و الله نەناسن و بێ دینن کەفیرعەون و نەمروود لەم جۆرە بوون، هەروەک اللّٰە تعالى لەبارەیان فەرمووی: **(أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ،وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ)** الجاثية٢٣-٢٤، واتە: ئایا ئەی محمد ﷺ بینیت حاڵی ئەو کەسانەی کەوازی هێنا لە پەرستنی الله و ئارەزووی خۆی کردۆتە خوا لە ئەنجامدا اللّٰە گومڕای کرد لەسەر زانستی ئەو کەسە (واتە:ئەو ئینسانەی کەلە ئیسلام شارەزا بوو بەڵام دوای ئیسلام نەکەوتوو ئارەزووی خۆی کردبووە خوای خۆی).وە اللّٰە مۆری خۆی نا بە گوێ و دڵیەوە و پەردەی خستە سەر چاویەوە تا هیچ ئامۆژگاریەک کاری تێنەکات، ئایا کێ هەیە کە ڕێنمایی بکات دوای ئەوەی کە اللّٰە گومڕایی کرد،ئایا (پەند)تا وەرگرت وە ئەمانە دەیانگوت: هیچ ژیانێک نییە غەیری ژیانی دونیا،هەندێکمان دەمرین و هەندێکمان دەژین،بەتەنها ڕۆژگار ئێمە بەهیلاک ئەدات (ئەگەر نا هیچ دەستێکی اللّٰە ی تیا نییە)بەڕاستی ئەمانە هیچ زانیاریەکیان دەربارەی (مردن و ژیان نییە) بەڵکو ئەوەی کەدەیڵێن گشتی خەیاڵ و گومانە.

ه) هەڵگەڕاوەکان (المرتدون): ئەمانەش کەسانێکن کە سەردەمێک موسوڵمان بوون،یان خۆیان وا پیشان داوە کە موسوڵمانن بەڵام دوایی پاش گەز بوونەوە و بەهۆی گوتە و دەربڕینێک یان کردەوە و ڕەفتارێکی کافرانەوە لەئایین دەرچوون هەروەک اللّٰە تعالى لەبارەیانی فەرمووە: **(إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى ۙ الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ،ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ ۖ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ)** محمد٢٥-٢٦، واتە: ئەو کەسانەی کە پاشە و پاش بەرەو بێبڕوایی دەگەڕێنەوە

دوای ئەوەی کە ڕێگایی ڕاستیان بۆ روون بۆوە، ئەوانە شەیتان سەری لێشێواندوون و کارە خراپەکانی بۆ ئاسان کردووە، بەم جۆرە لەسەر ئەوەی دەیانگوت بەو کەسانەی رقیان لە قورئانی پیرۆزە ئێمە لەهەندێک کاردا بەگوێیان دەکەین،بەڕاستی الله شارەزایە بە نهێنیەکانیان.

دووەم: دوورووەکان(المنافقون):منافیقەکان پیسترین جۆری دوژمن و ناحەزانی اللَّه ن،هەروەک اللَّه تعالی فەرموویەتی: **(إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا)** النساء١٤٥، واتە: بێگومان مونافیقەکان لەپلەی بنەوەی ئاگری دۆزەخن وهیچ یارمەتی دەریشیان بۆ شک نابەی.

کەواتە: دەتوانین بڵێین دوژمن و ناحەزانی ئیسلام و موسڵمانان بەگشتی ئەمانەن:

أ)مونافیقەکان

ب)جوولەکەکان

ج)دیانەکان

د)هاوبەش پەیداکەرەکان

هـ)زەندیق و بێ دین و خوانەناس و ماددە پەرستەکان

و)مەجووسییەکان

ز)سائیبەکان

ح)هەڵگەڕاوەکان: کەلە وولاتی ئێمە و سەرتاسەری جیهانی ئیسلامیش هەرکام لە کۆمۆنیستەکان و مارکسیەکان و ناسۆنالیستەکان و دیموکراسیەکان، کە بە زاراوەی ئەمڕۆ سەرجەم (لاتیک) و(سیکۆلاریست) یان (عەلمانی) یان پێ دەگوترێ، کەم و زۆر دەچنە خانەی هەڵگەڕاوەکان (المرتدون) چونکە خاڵی هاوبەش (القاسم المشترک)ی هەموو ئەو پێڕ و تاقمانە بریتیە لە ڕازی نەبوونیان بەوە کە ئسلام بەرنامەی هەمە لایەنی ژینی تاک و کۆمەڵ بێ، بەڵام بەمەرجێک ناکەونە حوکمی هەڵگەڕاوەکان ئەگەر بەنەفامی یان بێ ئاگای یان بەناچاری و ترس ئەم لایەنەیان گرتبێ..

**پرسیار:** کۆمەڵی اللّٰه(حزب اللّٰه)و کۆمەڵی شەیتان (حزب الشیطان) کێن؟

**وەڵام:** سەرەتا ووشەی(حیزب)بە کۆمەڵە کەسێک دەگوترێ کە دڵ و کردەوەکانیان وێک بچن.

اللّٰه تعالی ش لە قورئاندا ووشەی (حزب اللّٰه)ی سێ جار هێناوە، جارێکیان لە سورەتی(المائدة)و دوو جاریش لە سورەتی (المجادلة) بەم شێوەیەی خوارەوە: (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ،إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ،وَمَن يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ**)المائدة٥٤-٥٦. واتە: ئەی بڕوادارینە هەرکامێکتان لەئاینەکەی هەڵگەڕێتەوە، ئەوا اللّٰه تعالی کۆمەڵێک دەرەخسێنێ (بۆ بوژاندنەوە و بەڕێوەبردنی بەرنامەکەی) کە خۆشی دەوێن و خۆشیان دەوێ لەڕاست بڕواداران نەرم و گەردن کەچن، لەسەر کافران ڕەق و بەدەمارن.

لەڕێی اللّٰه تعالی تێدەکۆشن لەسەر کۆنەی هیچ سەرکۆنەکەرێک باکیان نییە،ئەوە بەخششی اللّٰه یە دەیدات بەهەرکەسێک کە ،وە اللّٰه فراوانە (لە دەسەڵات و بەزەیی و هەر سیفەتێکی پەسەندا) و زانایە، بێگومان پشتیوانتان بەس اللّٰه پاشان پێغەمبەرەکەی و ئەوانەن کە بڕوایان هێناوە، ئەوانەش نوێژی بەرپا دەکەن و زەکات دەدەن و زۆر کڕنووش دەبەن،وە هەرکەسێک دۆستایەتی اللّٰه پاشان پێغەمبەرەکەی و ئەوانە بکات کەبڕوایان هێناوە ئەوا کۆمەڵی اللّٰه (حزب اللّٰه)یە و بێگومان بەس کۆمەڵی اللّٰه ش زاڵ و سەرکەوتوون.

هەروەها دەفەرمووێ: (**لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ۚ أُولَٰئِكَ حِزْبُ اللَّهِ ۚ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ**)المجادلة٢٢،واتە: هیچ کۆمەڵێ دەست ناکەوێ کەبەڕاستی بڕوایان بە اللّٰه و ڕۆژی دوایی هێنابێ و دۆستایەتی کەسانێک بکەن کە دوژمنایەتی اللّٰه پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەن، با ئەو کەسانە باوکیان یان ڕۆڵەیان یان برایان یان تیرە و نەتەوەیان بن، ئەوانە(اللّٰه تعالی) بڕوای لەدڵدا چەسپاندوون و بە ڕۆحێک لەلایەن خۆیەوە پشتگیری کردوون و دڵی بەهێز کردوون و دەیان باتە چەند باغێکەوە کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن تیایدا دەمێننەوە،اللّٰه لێیان ڕازییە و ئەوان لێی ڕازین، بەڕاستی(هەر)ئەوانەن کۆمەڵی اللّٰه، بێگومان (هەر) کۆمەڵی اللّٰه سەرفرازن.

**کەو اتە:**

سەرجەم دروشم و نیشانە و خەسڵەتە سەرەکیەکانی کۆمەڵی اللّٰه تعالی بریتین لە مانەی خوارەوە:

١) بڕوا بوون بە اللَّه و بە ڕۆژی دوایی.
٢) اللَّه خۆشی دەوێن و اللَّه یان خۆش دەوێ.
٣) نەرم و نیانی بەرامبەر بڕواداران.
٤) ڕەق و توند و تیژی لە ئاقار کافراندا.
٥) تێکۆشان و ڕەنجان لەڕێی اللَّه دا.
٦) بێباکی لە تانە و تەشەری سەرکۆنەکەران.
٧) پشت بەستن بە اللَّه پاشان پێغەمبەر ﷺ و بڕواداران.
٨) نوێژ کردن و زەکاتدان.
٩) سەرکەوتن و سەرفرازی.
١٠) گەیشتن بە بەهەشت و ڕەزامەندی اللَّه.

بەڵام کۆمەڵی شەیتان، ئەو کەسانەن کەوا اللَّه پاشان پێغەمبەری اللَّه ﷺ بەدرۆ دەزانن دوژمنایەتی ئاین و بەرنامەی اللَّه دەکەن و دۆستایەتی دوژمنانی اللَّه دەکەن و حوکم بە بەرنامەی مرۆڤ کرد دەکەن و شوێن کەوتەی هەوا و ئارەزوو نەفسن، هەرچی کوفر و دوو ڕوویی هەیە لە دڵەکانیان کەڵەکەی کردووە لەگەڵ ئەوەش خۆیان بەچاک نیشان دەدەن، بەڵام ڕاست ناکەن بەڵکو درۆ دەکەن.

هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى الْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ،أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًاۖ إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ،اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ، لَّن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًاۚ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ،يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْۖ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍۚ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ،اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِۚ أُولَٰئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِۚ أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ) المجادلة١٤-١٩** واتە: ئایا بۆ سەرنجێک نادەیت بەلای ئەوانەی کە دۆستایەتی ئەکەن لەگەڵ گەلێک اللَّه تعالی خەشمی لێگرتوون، ئەوانە نە لە ئێوەن نەلەئەوانن، وە سوێند ئەخۆن بەدرۆ لەکاتێکدا کە خۆیان ئەزانن(درۆ ئەکەن)، اللَّه سزای سەختی بۆ ئامادە کردوون، بەڕاستی ئەوەی ئەوان دەیانکرد کارێکی خراپ بوو سوێندەکانیان کرد بە قەڵغان و جڵەوگیری خەڵکیان کرد لەڕێی اللَّه دا، ئینجا بۆ ئەوان هەیە سزای ڕیسواکەر ماڵ و مناڵیان بەهیچ جۆرێک بەکەڵکیان نایەن لەسزای اللَّه، ئەوانە یار و هاودەمی ئاگرن تیا ئەمێننەوە بە ئێجگاری، لە ڕۆژێکا کە اللَّه هەموویان زیندوو ئەکاتەوە و سوێندی بۆ ئەخۆن هەروەک سوێند ئەخۆن بۆ ئێوە (لە جیهانا)وە وادەزانن کە شتێکیان دەست خستووە،با بزانن کە بەڕاستی هەر ئەوانن درۆزنی ڕاستەقینە، شەیتان زاڵ بووە بەسەریانا بەجۆرێک کەیادی اللَّه ی لەبیر بردووەتەوە بێ گومان ئەوانە کۆمەڵی شەیتان بابزانن کەبەڕاستی هەر کۆمەڵی شەیتان زیان بارە.

**پرسیار:** سروشتی دوژمنایەتی کۆمەڵی شەیتان لەگەڵ کۆمەڵی اللَّه چۆنە؟ یان بە پێچەوانەوە؟

**وەڵام:** کۆمەڵی شەیتان زۆر شێواز بەکاردەهێنن بۆ دەربڕینی دوژمنایەتی لەگەڵ کۆمەڵی اللَّه، بۆ نموونە: اللَّه تعالى دەفەرمووێ:

١) **(زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا ۘ وَالَّذِينَ اتَّقَوْا فَوْقَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)** البقرة٢١٢، واتە: ژیانی دونیا ڕازێنراوەتەوە بۆ بێبڕوایان، کە گاڵتە دەکەن بە بڕواداران (بەڵام پایەی)پارێزگاران لە گوناهـ گەلێ بەرزترە لەڕۆژی دوایدا.

٢) **(قَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَوْمِهِ إِنَّا لَنَرَاكَ فِي سَفَاهَةٍ وَ إِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ الْكَاذِبِينَ)** الأعراف٦٦،واتە: کۆمەڵێک لە دەسەڵاتدارانی گەلی (عاد) بە (هود)یان گوت: بەڕاستی زۆر بەبێ ئەقڵت تێ دەگەین، گومان دەبەین کە تۆ ڕاست ناکەیت و درۆ بکەیت.

٣) **(إِنَّ الَّذِينَ أَجْرَمُوا كَانُوا مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا يَضْحَكُونَ،وَإِذَا مَرُّوا بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ،وَإِذَا انْقَلَبُوا إِلَى أَهْلِهِمُ انْقَلَبُوا فَكِهِينَ، وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوا إِنَّ هَٰؤُلَاءِ لَضَالُّونَ)**المطففين٢٩-٣٢، واتە: بێگومان ئەوانەی بەدکار بوون پێدەکەنن بەوانەی کە بڕوایان هێنا بوو، وە کاتێک کەبەلایاندا ڕۆیشتبان چاویان لێ دائەگرتن،وە کاتێکیش کە ئەم بەدکارانە بگەڕابایەتەوە بۆ لای کەس و کاریان بەشادمانی دەگەڕانەوە،کاتێکیش کە چاویان پێ کەوتبان دەیانگوت: ئەمانە گومڕان..

**پرسیار:** ئەو هۆیانە چین کەوای لە کۆمەڵی شـەیتان کردووە تاوەکو دوژمنایەتی کۆمەڵی اللَّه بکەن؟
وەڵام: چوار خاڵ هەن کەوای لە کۆمەڵی شـەیتان کردووە کە دوژمنایەتی کۆمەڵی اللَّه بکەن، ئەوانیش بریتین لە:

١) خۆ بەگەورە زانین(الكِبْر): کۆمەڵی شـەیتان خۆیان بە گەورەتر دەزانن لە ئەهلی حەق، هەتا خۆیان لە پێغەمبەریش ﷺ بەزلتر دەزانن.
هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ آيَاتُنَا وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا كَأَنَّ فِي أُذُنَيْهِ وَقْرًا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ)**لقمان ٧، واتە: کاتێ ئایەتەکانی اللَّه ی بەسـەردا دەخوێندرێ، یەکسـەر زۆر بەفیز و گەورەییەوە پشتی خۆی لێ دەکا، وەکو ئەوەی کە هەر گوێی لێ نییە، قورسایی لە گوێیەکانی بەستراوە،کەواتە تۆش مژدەی پێ بدە بە سزایەکی ناخۆش(لە تۆڵەی ئەوە).

٢) خۆشـویستنی دونیا بەسـەر ئاخیرەت: هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الْآخِرَةِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ)**النحل١٠٧، واتە: بەم شـێوەیە ئەوان ژیانی دونیایان خۆشـتر دەوێ لە ژیانی ئاخیرەت اللَّه تعالی ش بەهیچ جۆرێک ڕێنمایی بێبڕوایان ناکات.

٣) ئێرەیی(الحَسَد): کۆمەڵی شـەیتان چەند بڵێی حەسـوودن و ڕقیان لە کۆمەڵی اللَّه هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ...)** البقرة١٠٩، واتە: زۆر لە خاوەن کتێبەکان حەزدەکەن کە بتانگەڕێننەوە سـەر بێ بڕوایی دوای بڕواهێنان، لەبەر حەسـەدێک لە سروشتیانەوە (ئەمەش)دوای ئەوەی کە ڕاستیەکانیان بۆ دەرکەوت.

٤) باڵا دەستی و خاوەن هێز و توانا: ئەمەشیان تایبەتە بە تاغوت و خوێنمژان کەلە ڕێگەی توانا و دەسـەڵاتیان زوڵم لە کۆمەڵی اللَّه دەکەن، بەتایبەت ئەو موسوڵمانانەی کە جێگای مەترسین بۆ ئەوان، هەروەک کاتی خۆی هاوەڵانی چاڵەکە (الأصحاب الأخدود)یان خستە نێو چاڵێکی ئاگر بەس چونکە بڕوایان بە اللَّه ی تاک و تەنیا هێنا بوو.
هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَن يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ)**البروج٨، واتە: تۆڵەیان لێسـەندن تەنها لەبەر ئەوە نەبێ بڕوایان هێنابوو بە اللَّه ی دەسـەڵاتدار و سوپاسکراو.

بەڵام دوژمنایەتی کۆمەڵی اللّه لەگەڵ کۆمەڵی شەیتان بەشێکە لە بیروباوەڕی ئیسلامی، یان لە ووشەی یەکخواپەرستی کە بریتیە لە (لا اله الا اللّه) هەروەک اللّه تعالی باسی ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام) دەکات و دەفەرمووێ: **(إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ)** الممتحنة٤، واتە: ئێمە بەرین لە ئێوە و ئەو شتانەی کە ئێوە لەغەیری اللّه دەیپەرستن، بەڕاستی ئێمە لێتان ڕازی نین و تازە دوژمنایەتی لە نێوان ئێمە و ئێوەدا سەری هەڵدا(کۆتایشی نایە) تاوەکو بڕوا بە اللّه ی تاک و تەنیا نەهێنن.

**پرسیار:** ئایا دەربڕینی دوژمنایەتی لە قۆناغی مەککەدا چۆن بوو؟

**وەڵام:** قۆناغی مەککە واتە قۆناغی خۆ پەروەردەکردن و خۆ ڕاهێنان لە ئازارە ئەم قۆناغە قۆناغێک بوو کە موسڵمانان تیایە لاواز و کەم ئەژمار و ژێر دەستە و لاواز بوون، بەجۆرێک نەدەوێدان کە بە ئازادی و سەربەستی اللّه ی خۆیان بپەرستن...

لەوە دەترسان کە دوژمن لە پەنا را بیان ڕفێنێ و شوێن بزریان بکەن...

بەڵام هاوشان لەگەڵ ئەم حاڵەتە نالەبارە هەڵوێستێکی بوێر و ئازایەتیان هەبوو لە بەرامبەر دوژمنان.

هەروەک اللّه تعالی لە مەککە پێی فەرموون: **(قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ،لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ،وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ،وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ،لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ)**الكافرون، واتە: ئەی (محمد ﷺ) بڵێ بە بێ بڕواکان ئەوەی کە ئێوە دەیپەرستن من نایپەرستم، وە ئێوەش ئەو خوایە ناپەرستن کە من دەیپەرستم، ئەو بەندایەتیە ناکەم کە ئێوە دەیکەن وە ئێوەش ئەو بەندایەتیە ناکەن کە من دەیکەم، کەواتە ئاین و بەرنامەی خۆتان بۆ خۆتان و هی خۆشم بۆ خۆم.

یان دەفەرمووێ: **(وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ ۖ أَنتُم بَرِيئُونَ مِمَّا أَعْمَلُ وَأَنَا بَرِيءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ)**یونس٤١، واتە: ئەگەر بێ بڕواکان تۆیان بەدرۆ زانی تۆش پێیان بڵێ:کەواتە کاری خۆم بۆ خۆم، هی خۆشتان بۆ خۆتان، ئێوە بەرین لەو کارەی کە من دەیکەم، وە منیش بەریم لەو کارەی کە ئێوە دەیکەن.

**پرسیار:** ئایا دەربڕینی دوژمنایەتی بەرامبەر بێ بڕواکان لە قۆناغی مەدینەدا چۆن بوو؟

**وەڵام:** کۆمەڵگەی مەدینە بۆ دەربڕینی دوژمنایەتی دەکرێت بە سێ بەش:

یەکەم: هاوتا دانەرەکان(المشرکون):

شێوازەکانی دوژمنایەتی دەربڕین بۆ هاو تاپەرستەکان بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

١) دوای ئەوەی کە حکومەتی ئیسلامی لەمەدینە دروست بوو:

لەم حاڵەتەدا الله تعالى دەفەرمووێ: **(بَرَاءَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ)** التوبة١، واتە: الله تعالى پاشان پێغەمبەریش ﷺ لەو هاوتا پەرستانەی کە پەیمانیان لەگەڵ ئێوە بەستووە(شکاندوویانە) بەریە و لێیان دوورە.

یان دەفەرمووێ: **(وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً)** التوبة٣٦، واتە:شەڕی هاوتا پەرستەکان بکەن بە هەموو هێزتان هەروەک ئەوان شەڕی ئێوە دەکەن بە هەموو هێزیان.

٢) ڕێ پێنەدانیان بۆ سەردانی کردنی کەعبەی پیرۆز:

هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(ا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا)** التوبة٢٨، واتە: ئەی بڕوادارینە هاوتا پەرستەکان پیس و چڵکن و نابێ نزیکی کەعبەی پیرۆز بکەونەوە لەدوای ئەم ساڵەوە (واتە ساڵی ٩ ی کۆچی).

٣) ڕێنەدان بەژن و ژن خواستن لەگەڵ ئەم هاوتا پەرستانە:

هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ ۖ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ ۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ)** المتحنة١٠،

واتە: ئەی بڕوادارینە ئەگەر ئافرەتانی موسوڵمان کۆچیان کرد و هاتنە لاتان ئێوە تاقیان بکەنەوە، اللَّه ئاگادارە بە ئیمانەکەیان،ئەگەر زانیتان بەڕاستی بڕوایان هێناوە مەیانگەڕێننەوە لای بێ بڕواکان چونکە نە ئافرەتانی بڕوادار بۆ بێ بڕواکان حەلاڵن نە ئەوانیش بۆ وان حەلاڵن.

٤) ڕێنەدانی موسڵمانان بەمانەوەیان لە نێو هاوتا پەرستەکان:

هەروەک پێغەمبەری الله ﷺ دەفەرمووێ: **(أنا بريءٌ من كلّ مسلمٍ يُقيمُ بينَ أظهرِ المشركِينَ.)** رواد أبو داود، واتە: من بەریم لەو موسڵمانانەی کەوا لەنێو هاوتا پەرستان بمێننەوە.

دووەم: خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان(أهل الکتاب):

هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَاللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ)**آل عمران٩٨، واتە: بڵێ ئەی خاوەن کتێبەکان ئەوە بۆچی بڕوا بە ئایەتەکانی اللَّه ناکەن اللَّه شایەدە بەو کردەوانەی کە دەیکەن.

سێیەم: دوو ڕووەکان(المنافقون):

الله تعالی دەربارەی دووڕووەکان دەفەرمووێ: **(هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ)** المنافقون٤، واتە: دوو ڕووەکان دوژمنی ڕاستەقینەن ئاگاداریان بن بۆیە موسڵمانان زۆر دوژمنایەتی خۆیان بۆ دەردەبڕن، ئەویش بەچەند شێوازێک بوو کە بریتی بوون لە:

١) جیهاد کردن و غەرەز کێشان و ڕووبەروو بوونەوە لەگەڵیان: هەروەک الله دەفەرمووێ: **(وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُوا وَهُمْ فَاسِقُونَ)** التوبة٨٤، واتە: بەهیچ جۆرێک نوێژیان لەسەر مەکەن کەمردن وە لەسەر گۆڕیشیان مەوەستە چونکە ئەوان نە بڕوایان بە اللَّه و نە بە پێغەمبەر نەبووە و بەبێ دینی مردوون.

٣) هیچ عوزریان لێ وەرناگیرێ لەکاتێ کە لە جیهاد بە پاش کەوتن: هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(فَإِن رَّجَعَكَ اللَّهُ إِلَىٰ طَائِفَةٍ مِّنْهُمْ فَاسْتَأْذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا مَعِيَ أَبَدًا وَلَن تُقَاتِلُوا مَعِيَ عَدُوًّا ۖ إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِالْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَاقْعُدُوا مَعَ الْخَالِفِينَ)**التوبة٨٣، واتە: کە گەڕایتەوە لای کۆمەڵێ لە دووڕووەکان دێن و ئیزنت لێ وەردەگرن کە لەگەڵ ئێوە بەشداری جیهاد بکەن تۆش پێیان بڵێ: جارێکی تر لەگەڵ من دەرمەچن و بەشداری شەڕمان لەگەڵدا مەکەن،چونکە ئێوە لە پێشدا ڕازی بوون بەوەی کەدانیشن و جیهاد نەکەن کەواتە ئێستا دابنیشن و لەگەڵ ئەوانەی کەلە جیهاد بە پاش کەوتوون.

٤) نابێ داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکەیت: هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ)**التوبة٨٠، واتە: ئەگەر داوای لێ خۆش بوونیان بۆ بکەیت یان نەکەیت ئەگەر حەفتا جار داوای لێ خۆش بوونیان بۆ بکەیت ئەوا اللَّه تعالی بەهیچ جۆرێک لێیان خۆش نابێت چونکە ئەوان بێ بڕوا بوون بەرامبەر بە اللّه پاشان بە پێغەمبەرﷺ اللَّه تعالی ش ڕێنمایی کۆمەڵی بێدینان ناکات

**پرسیار:** کۆچ کردن چییه؟

**وەڵام:** کۆچ کردن پەیوەندییەکی پتەوی هەیه به مەسەلەی (الولاء والبراء) خۆشەویستی و ڕق لێبوونەوە له پێناو الله.

(أبن القيم) دەڵێ: کۆچ کردن دوو جۆرە، که بریتیه له (کۆچ کردن بەلەش له شوێنێک بۆ شوێنێک، کۆچ کردن بۆ اللّٰه).

بەڵام کۆچ کردن بۆ اللّٰه کۆچ کردنی ڕاستەقینەیه.

کۆچ کردنی دابەش بووە بۆ دوو بەش:

*مانەوە له نێو(دار الکفر)و حوکمەکەی.

*کۆچ کردن لەنێو(دار الکفر) بۆ (دار الاسلام).

مانەوە له نێو (دار الکفر) بۆ (دار الاسلام).

**دار الکفر:** بەم شوێنه دەڵێن کەوا بێ بڕوایان حوکمی تیا دەگێڕن و بەرنامەی غەیری اللّٰه ی تیا پیادە دەکەن، ئەگەرچی خەڵکەکەشی موسڵمان بن.

**دار الاسلام:** بەم شوێنه دەڵێن کەوا بڕواداران حوکمی تیا دەگێڕن و بەرنامەی اللّٰه ی تیا دەکەن ئەگەرچی خەڵکێکی خوا نەناسی تیابێ.

ئیسلام ئاینێکی بەڕێز و بەپێزە، بۆیه ڕازی نابێ کەوا بێ بڕوایان زەلیلی بکەن ئەتکی شەریعەتەکەی بکەن، کەواتە مانەوە لەنێو (دار الکفر) کارێکی ناشەرعی و ناپەسەندە له ئیسلامدا، بۆیه هەرکاتێک شوێنێک بوو بە(دار الکفر)ئەوا کۆچ کردن لەم شوێنه فەرز دەبێت لەسەر موسڵمانان.

اللّٰه تعالی دەربارەی ئەو کەسانەی کەوا کاتی خۆی له مەککه مابوونەوە و کۆچیان نەکرد بۆ مەدینه فەرمووی:**(إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ ۚ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا ۚ فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا، إِلَّا الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا)**النساء٩٧-٩٨

(له پێشدا مانای ئایەتەکه لێکدراوەتەوە).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(مَن جامعَ المُشرك وسَكنَ مَعَه فهوَ مِثلُه)** رواه أبو داود، واتە: هەر کەسێک لەگەڵ موشریک کۆبێتەوە و بەیەکەوە نیشتەجێ بێ ئەوا لەگەڵ موشریکەکان حسێبی بۆ دەکرێ،

هەروەها زانایان دەڵێن: **(اذَا لَحِقَ الرَّجُلُ بدَارِ الحَرْبِ ولَمْ يَرتَدْ عَنِ الأسْلام فَهْوَ مُرتَدْ بِتَركهِ دارِ الأسْلامِ)** واتە: هەرکەسێک پەیوەندی بکات به (دار الحرب) که (دارالکفر)یشی پێدەڵێن ئەگەر له ئیسلامیش هەڵگەڕابێتەوە هەر(مرتد)ە بەهۆی ئەوەی که وازی هێناوە له (دار الأسلام)، بەڵام ئەو کەسانەی که له (دار الحرب) دەمێننەوە هەندێ له زانایان دەیکەنه سێ بەش:

یەکەم: مانەوە له نێو(دار الحرب) به ئارەزوو وویستی خۆت و ڕازی بیت بەو شتانەی که تیایەتی.

ئەوا ئەو حاڵەتە اللَّه تعالى دەفەرمووێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ) المائدة٥١، واتە: ئەی بڕواداڕینە جولەکە و دیانەکان مەکەن بە دۆستی خۆتان کەوا هەندێکیان دۆستی هەندێکیانن هەرکەسێک لە ئێوە دۆستایەتیان لەگەڵدا بکات لەوانە.

دووەم: مانەوە لەناویان لە پێناو ماڵ و مناڵ و دونیا، بەڵام ئاینی خۆی لەلایان ئاشکرا نەکردبێ و یارمەتی موسڵمانانیش نەدات.

ئەوا لەم حاڵەتە ئەم ئینسانە کافر نابێت بەڵام پێی دەگوترێ یاخی(عاصي)ئەوەش بەهۆی ئەوەی کەلە نێویان دەرناچێ و کۆچ بۆ شوێنێکی تر ناکات، چونکە شەریعەتی ئیسلام دەڵێ: ئەگەر لە شوێنێک ئازاد نەبوویت لەوەی کە خۆتی تیا ئاشکرا بکەیت کە موسڵمانی، ئەوا دەبێ ئەو شوێنە جێ بهێڵیت و ئەگەر (دار الاسلام)ت بە چنگ نەکەوت، ئەوا بۆ شوێنێکی وا دەبێ کۆچ بکەیت کە ئەم شوێنە لە شوێنی پێشوو چاکتر بێ لەڕووی ئیسلامەتی..

سێیەم: مانەوە لەنێو (دار الحرب)بەو مەرجەی کە:

١)توانای ئەوەت هەبێ کە هەق بە(کفر) بڵێیت و لێیان نەترسیت، هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ...) الكافرون. (لە پێشتر لێک دراوەتەوە)

٢)مانەوە لە حاڵەتی لاواز(مستضعف)ی واتە مانەوەی پیاوی پەککەوتە و ئافرەت و مناڵ، ئەوانەی کە توانای کۆچ کردنیان نییە.

اللَّه تعالى دەفەرمووێ: (إِلَّا الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا) النساء٩٨، واتە: تەنها لاوازەکان نەبن لە پیا و ئافرەت و مناڵ، کەوا ناتوانن کۆچ بکەن و ڕێگایان نییە تیا دەربچن.

کۆچ کردن لە(دار الکفر) بۆ (دار الاسلام):

کاتێک کە حاڵەتی(دار الکفر)بوو ئەوا دوژمنانی ئیسلام لە موسڵمانان ناگەڕێن تاوەکو بە ئازادی خوای خۆیان بپەرستن، بۆیە تەنگیان پێ هەڵدەچنن تاوەکو ئەو دەمەی کە لە ئاینی ئیسلام هەڵیان دەگێڕنەوە، اللَّه تعالى دەفەرمووێ: (وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا)أبراهيم١٣، واتە:بێ بڕواکان بە پێغەمبەرەکانی خۆیان دەگوت: ئێمە لەسەر خاکی خۆمان دەرتان دەکەین یان دەبێ بگەڕێنەوە سەر ئاینی خۆمان.

**دەتوانین کۆچ کردن بکەین بە چەند بەشێک لەوانە:**

١) کۆچ کردن لە(دار الحرب) بۆ (دار الاسلام)...

٢)دەرچوون لە خاکێک کە بیدعەی تیا زۆربێ، هەروەک مالک (ڕەزای الله تعالی لێبێت) دەڵێ: **(لاَ یَحِلُ لأحَدٍ أنْ یُقیمَ بیَلدٍ سُبُ فیهَا سَلَفُ)** (أحکام القرأن)، واتە: دروست نییە بۆ کەسێک لە شارێک بمێنێتەوە کەوا تیا جوێن بە سەلەف بدرێ.

٣)دەرچوون لە شوێنێک کە حەرامی زۆر تیا بڵاو بوویێتەوە.

٤)ڕاکردن لەبەر زەنگ و زەبری دوژمنان لەترسی ئەوەی نەوەک دووچاری ئازارێکی زۆر بێتەوە هەروەک ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام) کاتی خۆی فەرمووی: **(إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّي)**العنکبوت٢٦، واتە: من کۆچ دەکەم بۆلای پەروەردگارم.

٥)ڕاکردن لە ترسی نەخۆشی(طاعون و کولێرا و مەلاریا....هتد).

٦)ڕاکردن کە ترسی ماڵ و نامووس، واتە لە شوێنێک لە ماڵ و حاڵت دڵنیا نەبوویت کە بە پەروەردەیەکی ئیسلامی پەروەردەیان بکەیت، ئەوا دەبێ ئەم شوێنە جێ بهێڵیت، یان لەوە ترسایت کە ئەتکی شەرەف و نامووستی تیا بکرێ، بەهەمان شێوە دەبێ ئەم شوێنە چۆڵ بکەیت.

**پرسیار:** اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)** الممتحنة٨، واتە: الله تعالی ڕێی لێ نەگرتوون کەوا چاکە بکەن و دادگەر بن لەگەڵ ئەو کەسانەی کەوا شەڕتان لەگەڵ ناکەن لەسەر دین و دەریشتان ناکەن لەنێو خاک و نیشتمانی الله دادگەرانی خۆش دەوێ، ئایا ئەم بابەتە چی دەگەیەنێ؟

**وەڵام:** ئەم ئایەتە وادەگەیەنێ کە ئەگەر دوژمنانی ئیسلام یان بێ بڕواکان ئەگەر شەڕیان نەفرۆشت بە موسڵمانان و کڕ و بێدەنگ هیچ زیانێکیان بۆ موسڵمانان نەبوو ئەوا لە ئیسلامدا ڕێگا ناگیرێ لە موسڵمانان کەوا هەڵوێستیان نەرم بێ لەگەڵ ئەم جۆرە بێ بڕوایانە.

کەواتە لەم حاڵەتەدا هەڵوێستمان بەرامبەر بێ لە زۆربەی کاروبارەکانی ژیان بەچاکی دەبێ بۆ نموونە:

١) لە کاتی کڕیم و فرۆشتن: ئیسلام ڕێگا ناگرێ لە موسڵمانان کە کڕین و فرۆشتن بێ بڕواکان بکەن، هەروەک( أبْنُ بَطْال) دەڵێ: کڕین و فرۆشتن لەگەڵ بێ بڕواکان دروستە، تەنها ئەو شتە نەبێ کە ببێتە هۆی بەهێزکردنی(بێ بڕوایان).فتح الباري

هەروەها کاتی خۆی ابو بەکر (ڕەزای الله تعالی لێبێت) دەچوو بۆ شام کە ئەو دەمە (دار الحرب)بوو، کاروباری بازرگانی لەگەڵ ئەنجام دەدان.

٢)سەر لێ دان لە نەخۆشەكانیان: دروستە كە موسڵمانان سەر بدەن لە نەخۆشی ئەو بێ بڕوایانەی كە باس كران، هەروەک دەگێڕنەوە كەوا گەنجێكی جوولەكە نەخۆش بوو، پێغەمبەریش ﷺ چوو سەری لێ دا و پێی فەرموو موسڵمان لەو دەمەی باوكی گەنجەكە لایان دانیشتبوو پێی گووت: بە گوێی بكە، ئەویش بە گوێی پێغەمبەری ﷺ كردوو شایەدی هێناو بووه موسڵمان، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **(الحَمْدُ للهِ الَّذي أنقَذَهُ مِنَ النَّار)** رواه البخاري، واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە ڕزگاری كرد لە ئاگر.

٣)سەلام لێ كردنیان: زانایان ناكۆكن لەسەر ئەم مەسەلەیە كە ئیبراهیم (علیه السلام) لە كاتی خۆی بە باوكی وت موسڵمان بە، ئەویش داواكەی ڕەت كردەوە و(ئیبراهیم)یش پێی گوت فەرموو: **(سَلامٌ عَلَيْك)** مريم٤٧.
بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن مەبەست لەم مەسەلەیە سلامەتی و ئەمینی بوو لە چنگ ئیبراهیم، واتە ئیبراهیم پێی گوت لەمن ئەمین بە.
٤)دەست پێش خەر نەبوون لە سەلام كردن: هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(ولا تَبدئوا اليَهودَ والنَصارىَ بِاالسَلامِ)** رواه مسلم، واتە:دەست پێشخەر مەبن لە سەلام كردن لەگەڵ جوولەكە و دیانەكان، یان دەفەرمووێ: **(اذَا سَلَمَ عَليكُمْ أهلُ الكِتاب فَقُولُوا:وَعَليكُمْ)** البخاري، واتە: ئەگەر یەک لە خاوەن كتێبەكان سەلامی لێ كردن ئێوەش بڵێن: **(وَعَلَيْكُمْ)**.

**پرسیار:** حاكمیەتی الله مانای چییە؟
**وەڵام:** الله تعالی دەفەرمووێ: **(إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ)** يوسف.٤٠، واتە:حوكم گێڕان تەنها مافی اللَّه یە، فەرمانی كردووە كە هیچ شتێک نەپەرسترێ خۆی نەبێ، هەروەک: سید قطب (ڕەحمەتی الله لێ بێ) دەفەرمووێ: (تایبەتمەندترین تایبەتمەندی الله بریتیە لە حاكمیەتی الله) واتە: اللَّه ئادەمیزادی بۆ ئەوە دروست كردووە، تاوەكو تەنها اللَّه بپەرستێ، اللهش بەچاكی ناپەرستێ تەنها لە جوغزی حاكمیەتی اللَّه وە نەبێ، كەواتە ئەگەر كەسێک بیەوێ بەچاكی الله بپەرستێ با هەوڵی ئەوە بدات لە هەموو لایەكی ژیانەوە حوكم بە ئاینی الله بكات.
كەواتە: هەركەسێک لە حوكم و ئادابی ئیسلامی دەربچێت و پێی ڕازی نەبێ بەبێ چەند و چوون لە ئاینی اللَّه دەرچێ و كافر دەبێ، هەروەها ئەو كەسەی حوكم بەئاینی الله نەكا و بە شەریعەتی الله هەڵنەسێ ئەوە ئیماندار نییە، وە ئەوەی بە حوكی الله ڕازی نەبێ ئەوە موسڵمان نییە ئەگەرچی درووشمی بەندایەتیشی بەرز كردبێتەوە.

**پرسیار:** الله تعالی چ دەفەرمووێ دەربارەی حاکمیەتی خۆی.؟
**وەڵام:** زۆر ئایەت هەن کە دەربارەی حاکمیەتی الله دەدوێن لەوانە:

١) **(فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ)** النساء٦٥،واتە: سوێند بە اللَّه ی تۆ (ئەی محمد ﷺ) بڕوای نییە ئەو کەسەی کە تۆ نەکات بە دادوەر(حاکم) لە هەر کێشەیەک کە لەنێوانیاندا دروست دەبێ.

٢) **(أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ)**الأعراف٥٤، واتە: مافی وەدی هێنان و حوکم کردن تەنها بۆ اللَّه یە.

٣) **(وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ)** المائدة٤٤، هەرکەسێک حوکم بە قورئان نەکات کافرە.

**پرسیار:** زانا و پێشەوایانی ئیسلامی چی دەڵێن دەربارەی حاکمیەتی اللَّه؟
**وەڵام:** زانایان زۆر قسەیان دەربارەی حاکمیەتی اللَّه کردووە لەوانە:

١)(أبن تيمية)بە ڕەحمەت بێ دەڵێ:هەرکەس نەزەرێک حەڵاڵ بکات ئەوا بە گوتەی تێکڕایی زانایان کافر دەبێت، هەروەک لەتە نانێک حەرام بکا دیسان بە گوتەی تێکڕایی زانایان کافر دەبێت.

٢)شەهید بەئیزنی الله تعالی (د.عبداللَّه عزام)بە ڕەحمەت بێ دەڵێ:(لا اله الا اللَّه) واتە حوکم کردن بە قورئان، هەرکەس حوکم بە قورئان نەکات واتە:خوایەتی خوای ڕەت کردۆتەوە.
هەروەها دەڵێ: ئەوەی لە ژیانی دا بەردەوام ئارەق خواردبێتەوە ئەوە کافر نابێ، بەڵام ئەوەی جارێک بڵێ:(ئارەق خواردنەوە) دروستە، ئەگەر لە ژیانیشیدا ئارەق نە خواردبێتەوە ئەوە کافر دەبێ و تەڵاقیشی دەکەوێ، ئەویش بەمەرجێ ئەگەر پەشیمان نەبێتەوە و تەوبەی لە دوا نەکات.

**پرسیار:** مێژووی ئیسلامی چی دەڵێت دەربارەی حاکمیەتی اللَّە؟

**وەڵام:** زۆر نموونە هەن لە مێژووی ئیسلامدا دەربارەی حاکمیەتی اللَّە، ئێمە تەنها یەک نموونە دەهێنینەوە، ئەویش لە (ابن عباس) ڕەزای خوای لێ بێ گێڕدراوەتەوە: ڕۆژێکیان جوولەکە و دووڕوو(منافق)ێک لەسەر بابەتێک تێک گیر دەبن، ئەوانیش کێشەکە دەگەیەننە لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش حوکمەکەی داوە بە جوولەکەکە، بەڵام دووڕووەکە بەم حوکمە ڕازی نەبووە، بۆیە گوتی: حەزم لێیە سەرێک بدەین لە(ابو بکر)ڕەزای خوای لێ بێ و بزانین ئەو چ دەڵێ: بەڵام کاتێ چوونە لای ئەویش وەک پێغەمبەر ﷺ هەمان حوکمی دا، بەڵام کابرای دووڕوو هەر دڵی دانەمرکا بۆیە گوتی: حەزم لێیە سەرێکیش بدەین لە(عومەری کوڕی خەتتاب) ڕەزای خوای لێ بێ، کاتێ کە هاتنە لای(ئیمامی عومەر) و کابرای جوولەکە گوتی ئەی (عومەر) ئێمە چووینە لای پێغەمبەر ﷺ حوکمێکی دا بەڵام ئەم پیاوە دڵی ئاوی نەدەخواردەوە و بۆیە گوتی: بچینە لای (ابو بکر)کاتێ کە چووین ئەویش هەمان حوکمی دا بەڵام هەر دڵی دانەمرکا، ئێستاش هاتینە لای تۆ دەمانەوێ بزانین حوکمی تۆ چییە؟

(عومەری کوڕی خەتتابیش)ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی پێغەمبەری خوا ﷺ حوکمی دا ڕازی نەبوو؟

گوتی بەڵێ: گوتی دەنا ڕاوەستن ئێستا دێمەوە ....

چووە ژوورەوە و شمشێریکی لەگەڵ خۆی هێنا و دای لە ملی کابرای (منافق) و گوتی ئەمە حوکمی عومەرە، کەواتە: هەرکەسێک کە بە حوکمی اللَّە ڕازی نەبێ، حوکمی شمشێری ئیمامی عومەرە. (القرطبي٥/٢٦٤)

**پرسیار:** جۆرەکانی حوکم لە ئیسلامدا چین؟

**وەڵام:** ئیسلام دەبێ لە هەموو بوارێکەوە بکرێتە حاکم، چونکە بەرنامە و یاسای ژیانە بۆ ئینسان...

بۆ نموونە:

١)حوکم لە بواری بیروو باوەڕدا: هەروەک اللَّە تعالى دەفەرمووێ: **(وَأَنِ اعْبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ)** يس٦١، واتە: (ئایا پەیمانم لێ وەرنەگرتن)کەوا من بپەرستن و ئەمە ڕێگای ڕاستە؟

٢)حوکم لە بواری بەندایەتی: هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي)**متفق عليه، واتە: نوێژ بکەن وەکو کە (من) تان بینی نوێژم دەکرد.

٣)حوکم لە مامەڵە و کڕین و فرۆشتن: هەروەها اللَّە تعالى دەفەرمووێ: **(وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ، الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ، وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ)**المطففين٣.١، واتە: وای بۆ تەرازوو بازان، ئەوانەی

کەوا لە ماڵی ئینسان شتێک پێوانە بکەن بۆ خۆیان بەزیانەوە پێوانەی دەکەن وە کاتێکیش لە ماڵی خۆیان پێوانە بکەن کەمیان دەدەنێ.

٤)حوکم لە حەدوو تۆڵە سەندن: (وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالْأَنفَ بِالْأَنفِ وَالْأُذُنَ بِالْأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ)المائدة٤٥، واتە: لەسەرمان نووسین لە کتێبی اللَّه کەوا هەر کەسێ کەسێ بکوژێ دەکوژرێتەوە و ئەوەی چاوی کوێرکات کوێر دەکرێتەوە، لووت بە لووت و گوێ بە گوێ ددان بە ددان و لە برینەکانیش تۆڵە دەسەنرێ وەکو خۆی.

٥)حوکمی اللَّه لە بواری یاسا دانان: هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: (أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ) الشوری٢١،واتە:ئایا هاوبەشیان بۆ اللَّه داناوە کەوا یاسا و بەرنامەی ژیانیان بۆ دادەنێن بەشێوەیەک کە اللَّه ئیزنی لەسەر نییە و پێی ناڕازییە؟

**پرسیار:** حوکمی اللَّه چییە بۆ ئەو کەسانەی کەوا حوکم بە قورئان ناکەن؟

**وەڵام:** حوکمی اللَّه لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت، بۆ نموونە:

١)فەرمانڕەوایی یەکەم لە وولات: ئەو فەرماندەیە ئەگەر حوکم بە قورئان نەکا و پێشی ڕازی نەبێ و بشزانی کەوا پێی گوناهبار دەبێ ئەوا کافرە و لە ئایین دەردەچێ.

٢)ئەوانەی کە یاسا دادەنێن: حوکمی ئەوانەش هەمان حوکمی فەرماندەکەیە ئەگەرچی هەموو دەقەکانی یاسا لەگەڵ شەریعەتی اللَّه یەک بگرنەوە بەس تەنها یەک یاسا نەبێ کە دژە لەگەڵ دەقێکی شەریعەت، ئەوها هەر کافر دەبێت.

٣)نوێنەری گەل: ئەگەر هەر یەکێک لەم نوێنەرانە کە (توقیع) بکات لەسەر یەک یاسا کە دژ بێ لەگەڵ شەریعەتی اللَّه ئەوا کافر دەبێت، بۆ نموونە:

ئەگەر (توقیع) بکات لەسەر ئەوەی ئارەق خواردنەوە حەڵاڵە، کە بۆ خۆی حەرامە، یان خڕبوونەوە لە مزگەوت بە نیەتی قورئان خوێندن بە حەرام بزانی یان(توقیع)بکەن لەسەر ئەوە کە کە پیاو و ئافرەت لە بواری میراتەوە دەبێ وەک یەک بن.

ئەوا پێی کافر دەبن و لە ئیسلام دەردەچن.

٤)موسڵمانان بە گشتی: گەلی موسڵمانان پێویستە هەموو ئەو جۆرە یاسایانەی کە بە پێچەوانەی ئیسلام و یاسای ئیسلام دەردەچن ڕەتی بکەنەوە ئەگەر بە دڵیش بێ، هەرکەسێک حوکم بەم جۆرە یاسا دەستکردانە بکات وەک ئەوە وایە لە نوێژێکی بەیانیا لەدوای مەلایەک نوێژ دەکات کەچی ئەو(مەلا)یە لە جیاتی دوو ڕکات سێ ڕکات نوێژیان بۆ بکات.

زانایان دەڵێن: ئەگەر هەرچی هەقمان هەیە بەزایە بچێت هێشتا چاکترە لەوەی کە بچیتە لای ئەم جۆرە حاکمانە وو حوکمیان پێ بکەین.

هەر کەسێک لە ڕیزی تاغوتەکان بوەستێ و بۆ تەختی حوکمڕانێتیان هەڵبژێرێ و بشزانێ کە ئەم تاغوتە حوکم بە قورئان ناکات و یاسای دەستکردی مرۆڤ پیادە دەکات، جا ئەگەر لەبەر بەرژەوەندی دونیا یان لەبەر بەرژەوەندی تاکە کەسی بێ، ئەوا لە ئیسلام دەردەچن و بەچاوی موسڵمان سەیر ناکرێن...

بەڵام ئەگەر ئەم جەماوەرە موسڵمانە بە نەفامی ئەم تاغوتانەیان هەڵبژاردبێ، ئەوا هیوا وایە کە بە بەر عوزر بکەون، بەڵام زانایان دەڵێن: ئەم جۆرە کەسانە هیچ عوزرێکیان لێ وەرناگیرێ، لە کاتێکدا خۆیان دەنگ بدەن بەم جۆرە تاغوتانە.

**پرسیار:** ئایا چۆن حاکمیەتی اللَّه دەچەسپێ؟

**وەڵام:** بە تێکۆشان و جیهاد کردن لە ڕێگەی اللَّه دەچەسپێ، هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ)**الأنفال٣٩، واتە: شەڕیان لەگەڵدا بکەن تاوەکو شیرک و بێ بڕوایی نەمێنێ و ئاین و فەرمانڕەوایی تەنها بۆ اللَّه بێ.

**پرسیار:** جیهاد مانای چییە؟

**وەڵام:** جیهاد لەڕووی زمانەوانییەوە بەمانای سەرف کردنی هێز وتوانا دێت چ لەڕووی گوتە(قول)ەوە چ لەڕووی کردار(فعل)ەوە، وە لە ڕووی شەریعەتەوە بەمانای جەنگ کردن لەگەڵ بێ بڕوا و پاشگەز و هەڵگەڕاوەکان و ...هتد دێت، هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ)**الحج٧٨، واتە: جەنگ بکەن لە پێناوی اللَّه بەم شێوەیەی کە شایەنیەتی.

**پرسیار:** حوکمی جیهاد لەپێناوی اللَّه چییه؟

**وەڵام:** جیهاد له پێناوی اللَّه فەرزی کیفایەیه بەمەرجێ، ئەگەر هەندێک پێی هەڵسان و پێویستی به ئەوانی تر نەکات،هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً)** التوبة١٢٢،واته:بۆ بڕواداران نەهاتووه هەر هەموویان ڕاپەڕن و جیهاد بکەن، ئەوه ئەگەر جیهاد فەرزی کیفایه بوو...

بەڵام جیهاد دەبێته فەرزی عەین بەم مەرجانەی خوارەوە:

١) **اذا التقى الزحفان وتقابل الصفان حرم على من حضر الانصراف:** واته ئەگەر دوو سوپا (سوپای کوفر و ئیمان) گەیشتنه یەک و بەرامبەر یەکتر وەستان ئەوا دروست نییه بۆ کەسێک لەوێ بێ پشتی خۆی لێ هەڵکا و جیهاد نەکات.

هەروەک پێغەمبەر خوا ﷺ دەفەرمووێ: (یەک له شته بەهیلاک دەرەکان بریتیه له ڕاکردن له ڕۆژی شەڕ) یان اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبَارَ)** الانفال١٥،

واته: ئەی بڕوادارینه کاتێ گەیشتن به بێ بڕواکان هێرشیان بکەنه سەر و پشتیان تێ مەکەن.

**(اذا نزل الكفار ببلد تعين أهله قتالهم و دفعهم)** واته: ئەگەر کافرەکان هاتنه ناو شاری موسڵمانان، ئەوا لەسەر ئەهلی ئەم شاره جیهاد دەبێته فەرزی عەینی بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و بەرەنگاری کردنیان هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً) التوبة١٢٣**،

واته: ئەی بڕوادارینه شەڕ بکەن لەگەڵ ئەو کافرانەی لێتان نزیکن و با توندو تیژیتان تێدا ببینن.

٣) **(اذا استنفر الامام قوماً لزلمهم النفير):** واته: ئەگەر پێشەوای کۆمەڵێکی موسڵمان داوای ڕاپەڕینی لێ کردن، ئەوا ئەو دەمه ڕاپەڕینەکه، فەرز دەبێت بەفەرزی (عەین) هەروەک پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەفەرمووێ: **(واذَا أستَنفرْتُمْ فانْفِروا)** مسلم،البخاري،واته:ئەگەر داوای ڕاپەڕینیان لێ کردن ئێوەش ڕاپەڕن.

کەواته:جیهاد له بنچینەدا فەرزی عەینه،بۆیه پێویسته لەسەر مسوڵمانان به هەر جۆرێک بێت و بەپێی توانا جیهاد بکەن،هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(جَاهِدواالمُشْركينَ بألسِنَتِكُمْ و أنْفُسِكُمْ وأموالِكُمْ و أيْديْكُمْ)** صحيح رواه أحمد،واته: جیهاد بکەن لەگەڵ هاوەڵ پەرستەکان به(زمان و گیان و ماڵ و دەست)ەکانتان.

پرسیار: جیهاد چەند جۆری هەیه؟

وەڵام: جیهاد دەکرێت به چوار بەش:

١)جیهادی دەروون:

واته: بەرەنگار بوونەوە لەگەڵ هەوا و ئارەزووە پیس و چەپەڵەکانی دەروون و خۆ زاڵکردن به سەر یانا.

هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَنَهَى النَّفسَ عَنِ الهَوى)** النازعات٤٠،واته:جڵەوگیری نەفسی خۆی کردبێ له ئارەزوو بازی)

٢)جیهادی شەیتان:

واتە: بەرەنگار بوونەوەی فرۆفێڵی شەیتان و خۆنەخستنە بەر ویستە فریو دەرەکانی شەیتان، هەروەک اللَّه تعالی لەباسی شەیتانا دەفەرمووێ: **(إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا)**فاطر٦،واتە: بەڕاستی و بەبێ گومان شەیتان دوژمنی ئێوەیە،دە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی بزانن.

٣)جیهادی کافر و دووڕووەکان:

ئەمەشیان بریتیە لە ڕووبەڕووبوونەوەی کافر و دووڕووەکان بۆ تێک و پێک شکاندنی هێزە بەزۆر داسەپێنەرەکانی کوفر... هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ)**التوبة٧٣،واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جیهاد بکە لەگەڵ کافر و دووڕووەکان توند و تیژ بە لەسەریان.

٤)جیهاد لەگەڵ گوناهبار و زۆردار و خاوەن بیدعەکان:

موسڵمان دەبێ هەمیشە ڕووبەڕووی تاوان و سەرپێچی بێتەوە تاوەکو خەڵکی ملکەچی ئاین و بەرنامەی اللَّه بن هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ)** رواه مسلم،واتە: ئەگەر هەرکەسێک لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بەدەست بیگۆڕێ، ئەگەر نا بەزمان بیگۆڕێت، ئەگەر بە زمانیش نەی توانی بیگۆڕێ ئەوا با بەدڵ پێی ناخۆش بێ،بەڵام ئەمەی دوای لاوازترین باوەڕ دەردەخا..

**پرسیار:** بۆچی دەبێ جیهاد بکەین؟

**وەڵام:** گرنگترین هۆ بۆ جیهاد کردن بریتیە لە:

١) بە جیهاد کردن بێ بڕوایی لادەچێ و یەکخواناسی و حاکمیەتی اللَّه دەچەسپێ:

هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ)**الانفال٣٩،واتە: شەڕیان لەگەڵدا بکەن تاوەکو شیرک و بێ بڕوایی نەمێنێ و ئاین و ملکەچایەتی تەنها بۆ اللَّه تعالی بمێنێ.

٢) بۆ بەرپەچ دانەوەی دەست درێژی دوژمنان و پاراستنی شەریعەتی اللَّه: هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ)**البقرة١٩٤، واتە: گەر هەرکەسێک دەست درێژیان کردنە سەر، ئێوەش دەست درێژیان بۆ بکەن بەوێنەی دەست درێژیەکانی ئەوان بۆ سەر ئێوە.

٣) لە ترسی ئاگر: اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(إِلَّا تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ)** التوبة٣٩، واتە: ئەگەر ئێوە ڕانەپەڕن بۆ جیهاد و خەبات کردن دژ بە دوژمنانی ئیسلام و موسڵمانان، اللَّه تعالی سزاتان

دەدات، سزایەکی سەخت و کاریگەر وە لەجیاتی ئێوە گەلێکی دیکە لە نەوەی ئێوە نەبێت دەکات بەکار گوزاری ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

٤) وەڵام دانەوەی بانگەوازی اللَّه تعالى: اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(انفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَ أَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ)**التوبة٤١، واتە: ڕاپەڕن بۆ جیهاد، سواربن یان پیادە، گەنج بن یان پیر،هەڵگری چەکی قورس بن یان سووک، لە هەر حاڵەتێکدا بن بەبێ وەستان هەڵمەت بەرن جیهاد بکەن بە ماڵ و سامان و گیانتان بەخت بکەن لەپێناو ڕێگەی اللَّه تعالى دا، ئەو جیهادە بۆتان باشترە ئەگەر بزانن،چونکە سەربەرزی هەردوو جیهان دەبن.

٥)بۆ پاراستنی چەوساوەکانی سەر ڕووی زەوی و ڕزگار کردنیان: اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا)** النساء٧٥، واتە: ئەوە چیتانە بۆ ناجەنگن لە ڕێگەی اللَّه تعالى دا بۆ بەرز کردنەوەی دروشمی(لا اله الا اللَّه محمد رسول اللَّه) لە پێناوی چەوساوان و زۆر لێ کراوان و ژێر دەستاندا) لە پیاوان و ئافرەتان و مناڵاندا ئەوانەی کە بەدەنگە کپە زوڵاڵەکانیان دەڵێن:ئەی پەروەردگارمان دەربازمان بکە لەم ئاواییە کە خەڵکەکەی زۆردار و ستەمکارن... وە لەلایەن خۆتەوە یەکێکیان بۆ بڕەخسێنە کە سەرمان بخات.

٦) جیهاد کردن پارێزگاری دروشمەکانی ئایینی ئیسلام دەکات: اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيرًا)**الحج.٤، واتە: ئەگەر اللَّه تعالى هەندێ کەسی خراپکار بەدەستی موجاهیدان لەناو نەبربا و پاڵی پێەوە نەدابا، ئەوا پەرستگا و گۆشەنیگای گاور و جوولەکە و دێر و کەنیسەکان و مزگەوتەکانی مسوڵمانان دەڕووخێنران و کاول دەکران،کە یادی اللَّه یان زۆر تێدا دەکرا و پەرستشیان تێدا ئەنجام دەدرا.

**پرسیار:** فەزڵی جیهاد لە ئیسلامدا چییە؟

**وەڵام:** لە ئیسلامدا جیهاد گەورەترین و چاکترین کردەوەیە لەلای الله تعالی هەروەک لە پێغەمبەری خوایان ﷺ پرسی: **(أيُ العَملِ أفضَلُ؟قَالَ الايمانُ باللهِ،والجِهادُ في سَبيلهِ)**متفق عليه. واتە: چ کردەوەیەک لە هەموو کردەوەیەک چاکترە (لەلای اللَّه) ئەویش فەرمووی: بڕوا هێنان بە اللَّه و تێکۆشان لە پێناوی.

بۆ خاڵی بوون لەم پرسیارە چەند خاڵێک بە نموونە دەهێنینەوە:

١.سەنگەرنشینی: هەروەک(أبو هريرة) ڕەزای اللَّه تعالی لێبێت دەفەرمووێ: **(لأنْ أرَابطَ لَيْلة فِي سَبيلِ اللهِ أحَبُ إلَيَ مِن أنْ أوافِقَ لَيلةَ القَدرِ عِندَ الحَجَرِ الأسْوَدِ)**رسالة العمدة في أعداد العدة. واتە: سەنگەر نشینی یەک شەوم لەڕێگەی اللَّه پێ خۆشترە لە شەونوێژی (ليلة القدر )لە بن باڵی کەعبەدا.

٢)ئێشک گرتن حەرەس (الحراسة) لە پێناوی اللَّه تعالی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(عَيْنانِ لا تَمَسُهُما النَّارُ:عَينٌ بَكَتْ مِنْ خَشيَةِ اللهِ و عَينٌ بَاتَتْ تَحْرُسُ فِي سَبيلِ اللهِ)**صحيح البخاري، واتە: دوو چاو ئاگریان ناگاتێ، چاوێک لەترسی اللَّه گریابێ، چاوێکیش لە ترسی اللَّه تعالی ئێشکی گرتبێ.

٣)هیچ بەندایەتیەک پێش جیهاد ناکەوێ: **(قِيلَ: يا رسُولَ اللَّهِ ﷺ، ما يَعْدِلُ الجِهَادَ في سَبيلِ اللَّهِ ؟ قَالَ: لا تَسْتَطيعُونَه) فأعادوا عليه مرتين أو ثلاثاً كل ذلك يقولُ:(لا تستطيعون) ثُمَّ قال:(مثَل المجاهد في سبيل اللهِ كمثَل الصَّائمِ القَائمِ القَانتِ بآياتِ اللهِ لا يَفْتُرُ: مِنْ صلاةٍ ، ولا صيامٍ ، حتى يَرجِعَ المجاهدُ في سبيل اللهِ)**متفقٌ عليه. واتە: لە پێغەمبەری خوایان ﷺ پرسی: چ شتێک هەیە خێری بە ئەندازەی جیهاد کردن بێ؟ فەرمووی: (پێتان نییە واتە ناکرێ) دووبارە و سێ بارە پرسیارەکەیان لێ کردەوە و هەموو جارێ دەیفەرموو: (پێتان ناکرێ) پاشان فەرمووی: نموونەی ئەو کەسەی جیهاد دەکات لە پێناوی اللَّه تعالی دا وەکو ئەو کەسەیە کە هەردەم بەڕۆژووە و شەونوێژ دەکات، لە خوێندنی قورئانی پیرۆز دەست هەڵناگرێ و چرکەیەکیش لە نوێژکردن و ڕۆژووگرتن غافڵ نابێ تاوەکو کابرای موجاهید دەگەڕێتەوە.

٤)زامداری لەڕێگەی اللَّه تعالی دا: **(ما مِنْ مكلومٍ يُكلَمُ في سبيلِ اللهِ إلا وجاءَ يومَ القيامةِ وكَلْمُه يَدمي:اللونُ لونُ الدَّمِ ، والرِّيحُ رِيحُ المسْكِ)**رواه البخاري، واتە: هەر کەسێک لە پێناوی اللَّه تعالی دا زامدار بێ، ئەوا ڕۆژی دوایی بەلەشی خوێناویەوە دێتەوە بەردەستی اللَّه خوێنەکەی ڕەنگی میسکە.

٥)شەهید ئاواتە خوازە کە دەجاران لە ڕێگەی اللَّه شەهید بێتەوە: **(الشَّهيدُ يتمنَّى أن يرجعَ إلى الدُّنيا فيُقتلَ عَشرَ مرَّاتٍ لما يَرى منَ الكَرامةِ)**رواه البخاري. واتە: شەهید ئاواتە خوازە کە بگەڕێتەوە دونیا دەجاری تر شەهید بێتەوە لەبەر گەورەیی و ڕێزی شەهادەت.

٦)شەهید هەست بە ئازاری مردن ناکات: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(الشَهيدُ لا يَجِدُ مِنَ القَتْلِ إلاَّ كَمَا يَجِدُ أحَدكُمْ القَرصَةَ يَقْرصُهَا)** رواه البخاري،واتە: شەهید ئازار نابینێ تەنها بەقەد ئازاری نقورچەیەک لە لەشی نەبێ.

٧)جیهاد هەموو گوناهێک دەسڕێ: پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(يُغْفَرُنم لِلشَّهِيدِ كُلُّ ذَنْبٍ إِلَّا الدَّيْنَ)**رواه مسلم، واتە: هەموو گوناهێکی شەهید(بە شەهیدی) لا دەچێت تەنها قەرز نەبێت.

٨)موجاهید چاکترین کەسە لەلای اللّه تعالی: **(قيلَ لِلنَبي ﷺ أيُ النَّاسِ أفضَلُ؟فَقالَ مُؤمِنُ يُجاهِدُ بِنفسِهِ ومَالِهِ في سَبيلِ اللّهِ)متفق عليه**،واتە: لە پێغەمبەریان پرسی ﷺ چ کەسێک لە هەموو کەس چاکترە؟ئەویش فەرمووی:بڕوادارێک جیهاد بکات بە گیان و بە ماڵی خۆی لە ڕێگەی اللّه دا.

٩)لووتکەی بەرزی ئیسلام جیهاد کردنە:پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(رَأسُ الأمْرِ الإسْلامُ، وعَمودُهُ الصَلاةُ وذَروُةُ سَنامِهً الجِهادْ)**صحيح الترمذي واتە: سەری هەموو کارێک ئیسلامە، وە کۆڵەکەی ئیسلامیش نوێژە، لوتکە هەر بەرزەکەشی جیهاد کردنە لە ڕێگەی اللّه تعالی دا.

١٠)تیر(یان گوللە) هاویشتن لە ڕێگەی اللّ تعالی دا: پێغەمبەری ئازیز ﷺ **(مَنْ رَمى بَسْهَم في سَبيلِ اللّهِ فَهوَ لَهُ عَدْلُ مُحَررةِ)**صحيح الترمذي،واتە: هەرکەسێک تیرێک (یان گوللەیەک) لەڕێگەی اللّه بهاوێژێ وەک ئەوە وایە کۆیلەیەکی ڕزگار کردبێ.

**پرسیار:** حوکمی ئەو کەسەی جیهاد نەکات چییە؟

**وەڵام:** لە ئیسلامدا حوکمی زۆر توند هەیە بۆ ئەو کەسانە کە جیهاد ناکەن بۆ نموونە:

١) پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(مَنْ مَاتَ ولَمْ يغزُولَمْ يُحدّثُ بِهِ نفسْهِ بالغَزوِ ماتَ عَلَى شُعبةٍ مِنْ النفاقِ)**رواه مسلم،واتە: هەرکەسێک بمرێ و جیهادی نەکردبێ و خۆشی بۆ جیهاد ئامادە نەکردبێ (لە دڵی خۆی دا)ئەوا لەسەر لقێکی دووڕوویی مردووە.

٢)هەروەها دەفەرمووێ: **(إذَا تَبَايَعْتُمْ بِالْعِينَةِ وَأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ الْبَقَرِ، وَرَضِيتُمْ بِالزَّرْعِ، وَتَرَكْتُمْ الْجِهَادَ، سَلَّطَ اللّهُ عَلَيْكُمْ ذُلًّا لَا يَنْزِعُهُ حَتَّى تَرْجِعُوا إِلَى دِينِكُمْ)**صحيح رواه أحمد، واتە: ئەگەر دەستان کرد بە کڕین و فرۆشتن و دەستان گرت بە کلی مانگگاکانتان و خووتان گرت بە کشتوکاڵەکانتان و وازیشتان هێنا لە جیهاد کردن لە ڕێگەی اللّه تعالی، ئەوا اللّه تعالی سەرشۆڕیتان دەهێنێتەوە سەر، لاشی نابات تاوەکو دەگەڕێنەوە سەر دین (جیهاد)ەکەتان.

٣)هەروەها دەفەرمووێ: **(مَنْ لقيَ اللّهُ بغَيرِ أثَرٍ مِنْ جِهاد، لَقِي اللّهُ وفيهِ ثُلْمة)**رواه الترمذي،واتە: بێتەوە بەردەستی اللّه تعالی، بێ ئەوەی شوێنەوارێکی جیهاد بە لەشیەوە بێ ئەوا بە لەکەداریەوە گەیشتۆتە بەردەستی اللّه تعالی.

**پرسیار:** باوەڕ بەفریشتەکان یانی چی؟

**وەڵام:** واتە باوەڕ بوون بە بوونیان بەبێ هیچ گومانێک.

**پرسیار:** فریشتەکان کێن و لەچی دروست کراون و ژمارەیان چەندە؟

**وەڵام:** ئەو کارمەندانەن کە بەکار و فەرمانەکانی اللَّه تعالی هەڵدەستن، بەبێ لاملی لێ کردن، وە لە(نور) دروست کراون، هەروەک پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(خُلِقَت الملائكةُ من نورٍ)**مسلم، واتە: فریشتەکان لە ڕووناکی دروست کراو.

هیچ کەسیش لە غەیری اللَّه تعالی نازانێ کە ژمارەیان چەندە، هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ...)**المدثر٣١، واتە: هیچ کەسێک بە لەشکری اللَّه تعالی نازانێ تەنها بۆ خۆی نەبێ.

**پرسیار:** ئیش و کاری فریشتەکان چین؟

**وەڵام:** ئیش و کاریان گەلێک زۆرە کە بەم جۆرەی خوارەوەیە:

١) الله تعالى بە پاک ڕاگرتن(تسبيح)هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(وَتَرَى الْمَلَائِكَةَ حَافِّينَ مِنْ حَوْلِ الْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ)** الزمر٧٥، واتە: فرشتەکان دەبینرێن لە دەوروبەری (عرش) دان و تەسبیحاتی پەروەردگاریان دەکەن.

٢) هەڵگری بارەگای الله تعالى (عرش الرحمن) هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ)**الحاقة١٧، واتە: لە ڕۆژی دوایی لە سەرەوەی فریشتەکان، هەشت فریشتە بارەگای الله تعالى هەڵدەگرن.

٣) سڵاو کردن لە ئەهلی بەهەشت: هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(وَالْمَلَائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ، سَلَامٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ)** الرعد٢٣-٢٤، واتە: فریشتەکان لە هەموو دەرگاکان لێیان دێنە ژوورەوە و سڵاویان لێ دەکەن و دەڵێن: سڵاوتان لێ بێ بەو ئارامیەی کە گرتوتانە.

٤) ئازاردانی ئەهلی دۆزەخ: هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ)** التحريم٦، واتە: ئەی بڕواداربنە خۆتان و ماڵ و منداڵتان لە ئاگرێک قوتار بکەن کە سووتەمەنیەکەی بریتیە لە بەرد و ئادەمیزاد، دوای ئەوە چەند فریشتەیەکی زۆر توند وتیژیان بەسەرەوەیە.

٥) هێنانە خوارەوەی (وەحی): ئەم فریشتەیە پێی دەڵێن (جبريل) عليه الصلاة والسلام، هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(وَإِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ، نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ)**الشعراء١٩٢،١٩٣.واتە: ئەم قورئانە نێردراوی پەروەردگاری جیهانە، کە لە ڕێگەی(جبريل)ی ئەمین هاتۆتە خوارەوە.

٦) نووسینی کردەوەکان: هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُم ۚ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ)**الزخرف.٨٠، واتە: ئایا وا حسێب دەکەن ئێمە گوێمان لە نهێنی و چرپەکانیان نەبێ، بەڵێ: بەڕاستی ئێمە نێردراوی خۆمان هەیە کە هەرچی شتێک بکەن(لە دونیا)ئەوان دەینووسن.

٧) دامەزراندنی بڕواداران: هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا)** الانفال١٢، واتە: بەڕاستی اللّە تعالى فریشتەکانی بۆ ڕەوان کردن تا پێیان بڵێ (من لەگەڵ ئێوەدام کەواتە ئێوەش بڕواداران بەهێز بکەن).

٨) گیان کێشان: ئەمەشیان فریشتەیەک پێی هەڵدەستێ کە پێی دەڵێن: **(قُلْ يَتَوَفَّاكُم مَّلَكُ الْمَوْتِ)** السجدة١١، واتە: پێیان بڵێ ئەی(محمد ﷺ): کەوا(ملک الموت)گیانتان دەکێشێ.

٩) پیاکردنی گیان بە ئادەمیزاد: هەروەک پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(عن عبد اللَّهِ بن مسعود قال حدثنا رسول اللَّهِ ﷺ وهو الصّادق المصدوق: «إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ في بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا ثُمَّ يَكُونُ في ذلك عَلَقَةً مِثْلَ ذلك ثُمَّ يَكُونُ في ذلك مُضْغَةً مِثْلَ ذلك ثُمَّ يُرْسَلُ الْمَلَكُ فَيَنْفُخُ فيه الرُّوحَ وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ بِكَتْبِ رِزْقِهِ وَأَجَلِهِ وَعَمَلِهِ وَشَقِيٌّ أو سَعِيدٌ)**رواه البخاري، واتە: هەریەک لە ئێوە لە نێو سکی دایکی دا شێوەی دروست کردنەکانی بە(٤٠)ڕۆژ کۆدەبێتەوە، کە یەکەم جار(ئاوە)ئینجا دەبێتە(علقة)ئینجا دەبێتە خوێن پارە(مضغة) ئینجا فریشتەیەک دێت گیان بەو کەسەدا دەکا و ئینجا چوار شتی بۆ دەنووسێ کە(بریتین)لە ڕۆزی و کاتی مردنی و بەدبەختی و خۆشبەختی لە کردارەکانی.

١٠) چاودێریکردنی ئادەمیزاد و کارەکانی: هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: **(لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِّن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ)** الرعد١١، واتە: بۆ ئادەمیزاد چەند فریشتەیەک هەن کە چاودێرن بەسەر کارەکانی پێشوو و دواوەیان،کە دەشیان پارێزن بە فەرمانی اللّه.

١١) پرسیاری نێو گۆڕ: ئەمەشیان دوو فریشتە پێی هەڵدەستن کە: (نکیر و منکر)ن هەروەک پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە عائشەی فەرموو: **(انَّ صَوتَ مُنْكَرٍ و نَكِيرٍ في أسماَعِ المؤمنينَ كَالأَثمَدِ في العَيْنِ)**الشرح الصدورل٣٤٥، واتە: ئەی عائیشە دەنگی(نکیر و منکر)لەبەر گوێی ئیمانداران سووکە وەکو کلی چاو.

**پرسیار:** ئایا لای اللَّه ئادەمیزاد پلەدارترە یان فریشتەکان؟

**وەڵام:** ئادەمیزاد لەلای اللَّه پایەدارترە لە فریشتەکان بە چەند خاڵێک کە ئەمانەی خوارەوەن:

١)اللَّه تعالى کاتێک ئادەمی دروست کرد ڕووی کردە فریشتەکان و پێی فەرموون سوژدەی بۆ بەرن.

٢) اللَّه تعالى بە ڕەواتری بینی کەوا ئادەمیزاد ببێتە جێ نشینی ئەو دروست کراوانەی کە لە پێش خۆی هەبوون، نەک فریشتەکان.

٣)ئادەم کاتی خۆی فێری زۆر شت کراوە بەڵام فریشتەکانی فێر نەکردوون،وەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا...)** البقرة٣١،واتە: ئادەم فێری هەموو ناوەکان کرا، بەڵام فریشتەکان ناوەکانیان نەزانی.

٤)ئادەمیزاد ئازادە لەوە کە خواپەرست بێ یان خوا نەناس،بەڵام فریشتەکان بەتەنها بۆ خواپەرستی دروست کراون و ناتوانن ڕەتی بکەنەوە.

٥)ئادەمیزاد توانای ڕابواردنی هەیە بەڵام فریشتەکان نیانە.

**پرسیار:** ئایا فریشتەکان کردەوەکانی دڵ دەنوسن؟

**وەڵام:** بەڵێ: هەروەک اللَّه تعالى لە فەرموودەیەکی قودسی دا دەفەرمووێ: **(اذَا هَمَّ عَبْدي بحَسَنةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا فَاكْكتُبْهَا لَهُ حَسَنةً،فَانْ عَمِلَهَا فَاكتُبهَا عَشْراً)** متفق عليه. واتە: ئەگەر بەندەیەکی خۆم نیەتی کارێکی چاکی هەبوو بەڵام نەی کرد، ئەوا خێری بۆ بنووسن،وە ئەگەر ئەنجامی دا ئەوا دە خێری بۆ بنووسن.

**پرسیار:** ئایا فریشتەکان تاوان دەکەن؟یان مەسەلەی(هاروت و ماروت)کە دەڵێن کاتی خۆی خەڵکیان فێری (سحر)کردووە، کەچی هەرکەسێک(سحر)بکات لەدینی اللَّه تعالی دەردەچێت، ئایا ئەمە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە فریشتەکان تاوان دەکەن؟

**وەڵام:** نەخێر، فریشتەکان بەهیچ جۆرێک ناتوانن تاوان و سەرپێچی بکەن، اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(لَّا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ)**التحريم٦،واتە: فریشتەکان یاخی نابن لە فەرمانی اللَّه تعالی، وە هەرچی کارێک کە پێیان دەسپێردرێ زوو جێبەجێی دەکەن. ئەم قسەیەی کە دەربارەی(هاروت و ماروت)دەیکەن، هیچ ڕاستیەکی نییە،بەڵکو کاتی خۆی جولەکەکان درۆیەکیان هەڵبەستبوو کە گوایە دوو فریشتە کە ناویان(هاروت و ماروت)بوو خەڵکیان فێری جادوو (سحر)کردووە، ئینجا گوتویانە ئێمە بۆ ئەوە هاتووین تاوەکو کەسێک فێری جادوو بکەین ئینجا تاقی بکەینەوە تا بزانین، کامیان جادووەکە دەکەن تا بە کافری حسێب بکەین و ئەو کەسەش فێر دەبێ و نایکات بە بڕواداری بهێڵنەوە،قورئان ئەم قسەیە بە درۆ دەخاتەوە: **(وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ ۚ وَمَا هُم بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ)**البقرة١٠٢،واتە: هچ جۆرد جادوویەک نەنێردراوەتە خوارەوە لەبابل بۆ سەر هارووت و مارووت(کە گوایە دوو فریشتە بوون) وە(ئەمانە)کەسیان فێر نەکردووە تا پێیان بڵێن: ئێمە هەر تاقی کەرەوەی(ئادەمی)ن کەواتە بێ بڕوا مەبە،ئینجا فێری جادووی وابن لێیانەوە کە ژن و مێردی پێ لەیەک بکەن،ئەوان بەم جادووە ناتوانن زیان بەکەس بگەیەنن مەگەر بە خواستی اللَّه تعالی.

**پرسیار:** ئەی بۆچی(ابلیس)لە فەرمانی اللَّه یاخی بوو؟

**وەڵام:** ڕاستە: بەڵام خۆ ئیبلیس فریشتە نەبوو،بەڵکو لە جنۆکەکان بوو،واتە لە ڕەگەزی فریشتەکان نەبوو هەروەک بۆخۆی دەڵێ: **(خَلَقْتَنِي مِنْ نَارٍ وَخَلَقْتَهُ مِنْ طِينٍ)**ص٧٦، واتە: منت لە ئاگر دروست کردووە و ئەوت لە قوڕ دروست کردووە، لە پێشدا دیار کەوت کەوا فریشتە لە(نوور)دروست کراون نەک ئاگر.

**پرسیار:** گرنگی باوەڕ بوون بە فریشتەکان چییە؟

**وەڵام:** گرنگی باوەڕ هێنان بە فریشتەکان بریتین لە:

١)دەزانی اللَّه زۆر گەورەیە و بەهێز و دەسەڵاتە، چونکە گەورانی بەدیهێنراو(مخلوق)لە گەورەیی(خالق)ە.

٢)سوپاس کردنی اللَّه تعالی لەسەر ئەوەی کە بایەخ بە نەوەی ئادەم دەدا،وەکو ئەوە دەبینی هەندێ فریشتە عایدی ئەوەیە مرۆڤ دەپارێزێ، هەندێکیان کردەوەکانی مرۆڤ دەنووسن،جگە لەوانەش لەگەڵ بەرژەوەندی تری مرۆڤی تێدایە.

٣)خۆش ویستنی فریشتەکان لەسەر ئەوە کە هەڵدەستن بەبەندایەتی کردنی اللَّه تعالی.

**پرسیار:** جنۆکە(جِنّ)کێن؟

**وەڵام:** جۆرێکن لە دروست کراوەکانی اللّه تعالی، کەوا لە ئاگر دروست بوونە، هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَخَلَقَ الْجَانَّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ)**الرحمن١٥، واتە: جنۆکە لە بڵێسە و گڕی ئاگر دروست کراون.

**پرسیار:** بۆچی دروست کراون؟

وەڵام: بۆ خوا پەرستی هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)**الذاريات٥٦، واتە: ئێمە جنۆکە و ئادەمیزادمان بۆ هیچ شتێ دروست نەکردووە تەنها بۆ خوا پەرستی نەبێ.

**پرسیار:** ئایا ئادەمیزاد پێشتر دروست کراون یان جنۆکە؟

وەڵام: جنۆکە لەپێشتر دروست کراون، هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ،وَالْجَانَّ خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ مِنْ نَارِ السَّمُومِ)**الحجر٢٦-٢٧. واتە: بێگومان ئێمە ئادەمیزادمان لە قوڕێکی وشک دروست کردووە،وە جنۆکەشمان لە پێش ئادەمیزاد لە ئاگرێکی دوکەڵدار دروست کردووە.

**پرسیار:** چۆن دەرزانی کەوا جنۆکە هەیە؟

وەڵام: اللّه تعالی جگە لەوەی سورەتێکی بەناو کردوون دەش فەرمووێ: **(وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)** الذاريات٥٦،(لە پێش دا تەفسیر کراوە) ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر بوونی جنۆکە.

**پرسیار:** ئایا جنۆکە لە غەیب دەزانن؟

وەڵام: نەخێر: هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِ أَحَدًا،إِلَّا مَنِ ارْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا)**الجن٢٦-٢٧.واتە: هەر اللّه یە ئاگادارە بە نهێنیەکان و کەسیش ئاگادار ناکا بەسەر نهێنی خۆیا،مەگەر پێغەمبەرێکی هەڵبژێردراو نەبێ، بێگومان اللّه چاودێری خۆی کە(فریشتەکان)ە لەبەردەم و پشتی ئەم پێغەمبەرە داناوە، واتە اللّه تعالی پێغەمبەرێکی نارد یەکێکیٔ وا هەڵبژێرێ کە بتوانێ ئەم بارە گرانە هەڵگرێ بەتەواوی.

**پرسیار:** پەیوەندی جنۆکە بە ئادەمیزاد چییە؟

**وەڵام:** پەیوەندیەک هەیە لەنێوان جنۆکە و ئادەمیزاد، بەڵام ئەم پەیوەندیە تایبەتە و لە ئادەمیزادێک بۆ ئادەمیزادێکی تر جیایە،جنۆکە لەگەڵ ئێمە دادەنیشێ و نان و ئاو دەخوات،جنۆکە کافری هەیە و بڕواداری هەیە، ئەوانەی کە کافر بوونە خۆیان لە ڕێگەی(وەسوەسە)وە بەسەر ئادەمیزاد دەسەپێنن، هەندێک جار جنۆکە چەند زانیاریەک لە فریشتە دەدزن و دەیخەنە گوێی فاڵچی و جادووکەرەکانەوە بۆیە هەندێک جار فاڵچی قسەیەک دەکات و ڕاست دەردەچێ ئەوە هی ئەوەیە، بەڵام مەرج نییە هەموو قسەیەکیان ڕاست دەربچێ، بەڵکو لەپەنای ڕاستیەک سەد درۆیان وەگەڵ دەخەن، بەم جۆرە گەمە لەگەڵ مێشکی پیاو و ژنە ئادەمیزادەکان دەکەن، تا بڵاو دەبێتەوە کەوا جنۆکە دەستی هەیە لە سوود و زیان گەیاندن بە ئادەمیزاد.

**پرسیار:** شەیتانەکان(الشیاطین)کێن؟

**وەڵام:** (الشیاطین) کۆی (شیطان)ە کەلە بنچینەوە لە(شَطَنَ)هاتووە واتە(ابتعد)یانی دوورکەوتنەوە لە ڕەحمەتی اللَّه تعالی، کەواتە هەرکەسێک لە اللَّه تعالی یاخی بێ چ ئادەمیزاد چ جنۆکە ئەوا پێیان دەڵێن (الشیاطین)سەرکردەی هەمووشیان(شەیتان)ە ئەگەر فریشتەکان گشتیان سەرباز و نوێنەری خێر و چاکەی اللَّه تعالی بن، ئەوا شەیتان و ئەو شەیتانانەی کە لەگەڵ ئەون گشتیان دوژمنی اللَّه تعالی ن و نوێنەری شەڕ و ئاژاوەن.

**پرسیار:** ئایا ئادەمیزاد بەردەوام شەیتانێکی لەگەڵە یان نا،بە بەڵگەوە ئەوە بسەلمێنە؟

**وەڵام:** بەڵێ: هیچ ئادەمیزادێک نییە کەوا شەیتانێکی لەگەڵدا نەبێ،هەتا پێغەمبەرانیش(علیهم الصلاة والسلام) لە گەڵیانە، هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا)الانعام١١٢**،واتە: بەم شێوەیە ئێمە بۆ هەموو پێغەمبەرێک شەیتانی جنۆکە و ئینسانمان داناوە،کە هەندێک هەندێژتان فریو دەدەن بە قسەی ڕازێنراو،هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(ما منكُم من أحدٍ إلَّا وقد وُكِّلَ بِهِ قرينُهُ منَ الجنِّ،قالوا : و إيَّاكَ يا رسولَ اللَّهِ ؟ قال : و إيَّايَ إلَّا أنَّ اللَّهَ أعانَني عليهِ فأسلَمَ فلا يأمرُني إلَّا بخيرٍ)**رواه مسلم،واتە:هەریەک لە ئێوە برادەرێکی جنۆکەی لەگەڵدایە،گوتیان تۆش ئەی پێغەمبەری خواﷺ؟ فەرمووی:بەڵێ،بەڵام من اللَّه یارمەتی دام بەسەریا و تەسلیم بووە و ئێستاش لەخێر زیاتر هیچم پێ ناڵێ.

**پرسیار:** ئایا شەیتان دەتوانێ هەموو کەس لەخشتە بەرێ؟

**وەڵام:** نەخێر: تەنها ئەوانە نەبێ کە پشت لە ئاینی اللَّه تعالى دەکەن، هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلَّا مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ)**الحجر٤٢،واتە: تۆ دەسەڵاتت بەسەر بەندەکانی مندا نییە، تەنها ئەو گومڕایانە نەبێت کە بەدوای تۆ کەوتوون.

**پرسیار:** اللَّه تعالى چۆن باسی شەیتانمان بۆ دەکات لەومان ئاگادار دەکاتەوە؟

**وەڵام:** اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ)**فاطر٦، واتە:بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە،دە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن،چونکە شەیتان داوا لە پێڕەکەی خۆی دەکات بۆ ئەوەی بیانکات بە هاوەڵانی دۆزەخ.

هەروەها دەفەرمووێ: **(يَا بَنِي آدَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ)**الاعراف٢٧،واتە:ئەی نەوەی ئادەمی با شەیتان فریوتان نەدات هەروەک فریوی دایک و باوکی ئێوەی دا.

**پرسیار:** ئایا ئەو شێوازانە چین کە شەیتان دەیگرێتە بەر بۆ فریودانی ئادەمیزاد؟

**وەڵام:** اللَّه تعالى لە قورئانی پیرۆزدا باسی شەیتانمان بۆ دەکات کە چۆن خۆی بەدەمی خۆی گوتویەتی: **(قَالَ فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ)**الاعراف١٦،واتە: گوتی لەبەر ئەوەی منت لە رێ لادا،(منیش)بۆیان دادەنیشم و رێگا ڕاستەکەی تۆیان لێ دەگرم،جا لەبەر ئەوە شەیتان چەند شێوازێک بەهەنگاو بۆ لەخشتە بردنی ئینسانی گرتۆتە بەر، بۆ نموونە:

١)هەنگاوی یەکەم: شەیتان لە هەموو لایەکەوە بۆ ئینسان دێت،بۆ ئەوەی کافری بکات یان بیکاتە (مشرک)،بەڵام ئەگەر ئەم ئینسانە موسڵمان بێت ئەوا بەشێوازێکی تر لە قۆناغێکی گونجاوەوە بۆی دێت و هەوڵی تەفرەدانی دەدات.

٢)هەنگاوی دووەم: بریتیە لە قۆناغی (بیدعە)،کەوا لە ئینسان دەکات کە پەل بۆ بیدعە ببات و ببێتە بیدعە چییەکی نەقۆڵا،جا ئەگەر ئەم ئینسانە لە ئەهلی سوونە و جەماعە بوو،ئەوا لە قۆناغێکی وەک سێیەما بۆی دێت.

٣)هەنگاوی سێیەم: قۆناغی گوناهە گەورەکان(الكبائر)کە بریتیە:لە قۆناغی یاخی بوون،واتە شەیتان هەوڵی ئەوە دەدات کە گوناهی پێ بکات،بەڵام ئەگەر شەیتان ئەوەی پێ لەگەڵ نەکرا،ئەوا لەرێی ترەوە بۆی دەچێت.

٤)قۆناغی چوارەم: قۆناغی گوناهە بچووکەکان(السیئات): واتە هەوڵی ئەوەی لەگەڵ دەدات کە گوناهی (بچووک)ی پێ بکات، بەڵام ئەگەر لەم ڕووەش نەیتوانی زەفەری پێ ببات ئەوا ئەم ئینسانە خەریک دەکات بە چەند شتێکی تر.

٥)هەنگاوی پێنجەم: ئەمەشیان قۆناغێکە تیایا شەیتان وا لە ئینسان دەکات کە خەریکی کاتە،کەوا(کات بەفیڕۆ)بدا و بە شتە(موباح)ە کانی خەریک بکات.

٦)هەنگاوی شەشەم: بەڵام ئەگەر شەیتان هەر هیچی پێ لەگەڵ نەکرا ئەوا هەوڵی ئەوەی لەگەڵ دەدات کە ئەم ئینسانە لەبەر سونەتەکانی پێغەمبەر ﷺ ئاگای لە واجبەکان ببڕێ،واتە وای سەرقاڵ دەکات بەبەندایەتی بچووکەوە کە گەورەکانی بۆ نەکرێت، بۆ نموونە سونەتی سادەی لێ دەکات بە ڕاتب و ڕاتبی بیر دەباتەوە یان بە سونەتی ڕاتبەوە ئەوەندە سەرقاڵی دەکات کەفەرزی لەبیر بچێتەوە وەک ئەو کەسەی کەشەوان زۆر خەریکی وێرد و تەسبیحات دەبێت تا بەشێکی گرنگی شەو دەچێت و کاتێ خەوت،بۆ نوێژی بەیانی بەخەبەر نایەت و خۆیشی ئەمە دەزانێ.

**پرسیار:** ئایا شەیتان لە چ دەرگایەک بۆ لە خشتە بردنی ئینسان دێتە پێش؟

**وەڵام:** شەیتان زۆر شێوازی هەیە بۆ لە خشتە بردنی ئینسان لەوانە:

١)ڕازاندنەوەی کاری نابەجێ: هەروەک اللَّه تعالی لەسەر زمانی شەیتان دەفەرمووێ: **(قَالَ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ،إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ)**الحجر٣٩-٤٠،واتە:ئەی پەروەردگار لەبەر ئەوەی گومڕات کردم،منیش لەسەر زەوی کاری خراپیان بۆ دەڕازێنمەوە وهەر هەموویان گومڕا دەکەم،تەنها بەندە خواناسەکانی تۆ نەبێ لەوان.

٢)لێ زیاد کردن و لێ کەم کردن: هەرکاتێک اللَّه فەرمانی کرد بەبەندەنەکانی،ئەو کاتە شەیتان هەوڵی لە تەفرەدانیان دەدات،کاتێک کە بەندەیەکی اللَّه(٤)ڕکات نوێژ بکات شەیتان وەسوەسە دەخاتە دڵی و پێی دەڵێ ڕکاتێکی زیاد بکات.یان کاتێک ئەو بەندەیە دەیەوێ کارێکی خێرێک بکات و یارمەتی هەژارێک بدات،ئەو دەمە شەیتان دەچێتە ناو دڵی و پێی دەڵێ تۆ ئەگەر ئەو پارەیە ببەخشیت ئەوا ماڵ و منالْت لەبرسان دەمرن...هتد

٣)وا لە ئینسان دەکات کە تەمبەڵی بکات لەخێر و چاکە:هەروەک ڕۆژێک بە پێغەمبەریﷺ خوایان گوت کەوا فلانە پیاو شەوێ خەوتووە تا ڕۆژ هەڵاتووە لە خەو هەڵنەساوە و نوێژی بەیانی لە کیس چووە،ئەویش فەرمووی: **(ذَلِكَ رَجُلٌ بَالَ الشَيطَانُ في أذُنَيه)**البخاري،واتە: ئەم پیاوە شەیتان میزی لە گوێکانی کردووە.

٤)پەیمانە بەدرۆدان:شەیتان زۆر پەیمان بە ئینسان دەدات،بەڵام هیچی نایەتە جێ،بۆ ئەوەی بەردەوام لە خشتەی بەرێ،هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ الْيَوْمَ مِنَ النَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَّكُمْ ۖ فَلَمَّا تَرَاءَتِ الْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكُمْ)**الانفال٤٨،واتە:

شەیتان کارەکانی بۆ ڕازاندونەوە،دەڵێ ئەمرۆ هیچ کەس بەسەر ئێوەدا زاڵ نابێ،من لە تەک ئێوەم بەڵام کاتێ چاوی کەوت بەکۆمەڵی ئیمان و کۆمەڵی کوفر یەکسەر بە پاژنە پێ گەڕایەوە و گوتی من لە ئێوە بەریم.

٥) ڕازاندنەوەی بەناو ئامۆژگاریەکانی بۆ ئینسان:هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ)**الاعراف٢١،واتە:شەیتان سوێندی خوارد بۆ ئادەم و حەوا و وتی من ئامۆژگاریتان دەکەم.

٦) پلە پلە لە گومڕا کردن:شەیتان یەکسەر نایەت ئینسان لە خشتە ببات، بەڵکو قۆناغ بە قۆناغ لەخشتەی دەبات،هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ...)**الصفه،واتە:کاتێ کە لایاندا اللَّه ش دڵی وەرگێڕان.

٧) وا لە ئینسان دەکات تاوەکو خواپەرستی لەبیر بکات و ئاگای ببڕێ لە ئینسان:هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ...)**المجادلة١٩،واتە: شەیتان سواری ملیان بووە و زیکری اللَّه ی لەبیر بردوونەتەوە.

٨) ترساندنی بڕواداران و دۆستانی اللَّه تعالی: هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ)**ال عمران١٧٥,واتە: بێگومان شەیتان دۆستەکانی اللَّه دەترسێنێ کەواتە ئێوە لێیان نەترسن بەتەنها لەمن بترسن ئەگەر بڕوادارن.

٩)دەچێتە نێو دەروونی ئیسلام: لەو دەرگای ئینسان پێیەوە سەرقاڵە:هەروەک اللَّه تعالی لەسەر زمانی شەیتان دەفەرمووێ: **(وَقَالَ مَا نَهَاكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ الشَّجَرَةِ إِلَّا أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ الْخَالِدِينَ)** الاعراف٢٠، واتە: شەیتان بە(ئادرم و حەوای)گوت: اللَّه تعالی ئێوەی لەم دارە بەرگری نەکردوە تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە ئێوە نەبن بە دوو فریشتە یان بە نەمری نەمێننەوە.

١٠)دروست کردنی گومان و شوبوهات:هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺدەفەرمووێ: **«يَأْتِي الشَّيْطانُ أَحَدَكُمْ فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ كَذا؟ مَنْ خَلَقَ كَذا؟ حَتَّى يَقُولَ: مَنْ خَلَقَ رَبَّكَ؟ فَإِذا بَلَغَهُ، فَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ وَلْيَنْتَهِ».** متفق عليه. واتە: شەیتان دێتە لای یەکێکتان، دەڵێ: ئەمە کێ دروستی کردوە؟ ئەدی ئەمەیان کێ دروستی کردوە؟ هەتا دەڵێ: کێ پەروەردگارتی دروستی کردوە؟ ئەگەر گەیشتە ئەم پرسیارە ئێوە پەنا بەنە بەر اللَّه،ئەو دەمە شەیتان وازدەهێنێ.

١١) لەڕێگەی ئارەق و قومار:هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ...)المائدة٩١**،واتە: بەڕاستی شەیتان دەیەوێ دوژمنایەتیتان بخاتە نێوان لەڕێگەی ئارەق خواردنەوە و قومار کردنەوە.

١٢) لەڕێگەی سیحرەوە: هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَٰكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ...)**البقرة١٠٢،واتە: پێغەمبەر سولەیمان (علیه السلام) کافر نەبووە، بەڵکو شەیتانەکان بۆ خۆیان کافر بوون بەهۆی ئەوەی خەڵکیان فێری سیحر کرد.

١٣) شەیتان لەڕێگەی خاڵە لاوازەکانی ئینسان دەتوانێ خەڵکی لە خشتە ببات:خاڵە لاوازەکانیش بریتین لە: (لاوازی، بێ هیوایی، چاوتەنگی، خۆ بەزل زانین، دڵ ڕەق، زمان درێژی، سپڵەی، گومانی زیاد، نەزانی...هتد).

١٤) ئافرەت و خۆشویستنی دونیا:هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(المَرأةُ عَورَةٌ فَاذَا خَرجَتْ أَسْتَشرفَ عَنْهَا الشَيطانُ)**رواه الترمذي وهو حديث حسن صحيح.واتە:ئافرەت عەورەتە،کاتێ کە دەرچوو شەیتان سەرپەرشتی دەکات.

١٥) ترساندن بە هەژاری:هەروەک اللّە تعالی دەفەرمووێ: **(الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاءِ)** البقرة٢٦٨، واتە:شەیتان هیواتان پێ دەدا(دەتان ترسێنێ)بە هەژاری و فەرمانی داوێن پیسیتان پێ دەکات.

**پرسیار:** ئەو چەکە چییە کە بەرەنگاری شەیتانی پێ دەبێتەوە؟

**وەڵام:** ئەو هۆیانەی کەدەبنە هۆی ئەوەی کە شەیتانی(نەفرەت لێ کراو)نەتوانێ لە خشتەمان بەرێ بریتین لە:

١)ئاگا لە خۆبوون لە فێڵەکانی شەیتان:چونکە شەیتان ناخەوێ شەو و ڕۆژ هەوڵی تەفرەدانمان دەدات...هەروەک ڕۆژێکیان لە شێخ(حسن البصري)یان پرسی: **(أينامُ ابليسْ؟قَالَ لَوَجَدْنَا راحَةً)** واتە: ئایا شەیتان دەخەوێ؟ئەویش فەرمووی: ئەگەر بخەوتبایە ئێمە دەحەواینەوە.

٢) پابەند بوون بە قورئان و سەننەتە بەرێزەکانی پێغەمبەر ﷺ چونکە قورئان پێمان دەڵێ: **(وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ ۚ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ)**البقرة٢٠٨،واتە: بەدوای هەنگاوە فریودەرەکانی شەیتان مەکەون، چونکە شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە.

٣) خۆ پاراستن بە خوای تاک و تەنیا:هەروەک اللّە تعالی دەفەرمووێ: **(وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ)**فصلت٣٦،واتە: کاتێ کە شەیتان ویستی فریوت بدات تۆش پەنا ببە بەر اللّە.

٤) خۆ خەریکردن بە زیکری اللّە تعالی: هەروەک اللّە تعالی دەفەرمووێ: **(فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ)** البقرة١٥٢،واتە:یادم بکەن یادتان دەکەم،سوپاسم بکەن و کوفرانە مەکەن.

٥) پابەند بوون بە جەماعەوە:هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(فعليْكم بالجماعةِ فإنَّما يأكلُ الذِّئبُ القاصيةَ)**رواه أبو داود و نسائي بأسناد حسن.واتە: پابەندی جەماعە بن چونکە گورگ پەلاماری مەڕێک دەدات و دەیخوا کەلە مێگەل دابڕابێ.

٦) جوڵانەوە بە پێچەوانەی خواستی شەیتان: هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺدەفەرمووێ:(لِيَأْكُلْ أحَدكُمْ بِيَمِينِهِ، وَ يَشْرَبْ بِيَمِينِهِ،وليَأخُذْ بيَمينه،وَلبَعطِ بيَمينِهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ، وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ وَيَعطي بشمَالِهِ،وَيَأخُذْ بشمَالِهِ )رواه بن ماجه بأسناد صحيح،واتە:با لە ئێوە بە دەستە ڕاست نان بخوات و بەدەستە ڕاست بخواتەوە و بەدەستە ڕاست وەربگرێ،چونکە شەیتان بەدەستی چەپ دەخوا و بەدەستە چەپ دەخواتەوە و بەدەستە چەپ دەبەخشێ و بەدەستە چەپیش وەردەگرێ.

٧)بڕوا بوون بەخوا:هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ)**النحل٩٩، واته: شەیتان هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر بڕواداران و ئەوانەی کە پشتی خۆیان بە اللَّه دەبەستن نییە.

٨)یەکلا بوونەوە بۆ اللَّه تعالی: هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ)**الحجر.٤،واته: تەنها شەیتان دەسەڵاتی بەسەر بەندە چاکەکانی اللَّه نییە.

٩)تۆبە و پەشیمانی:هەروەک اللَّه تعالی کاتێک لە ئادەم و حەوا خۆش بوو کە پەشیمان بوونەوە لە تاوانەکانیان و گوتیان: **(رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ)**الاعراف٢٣، واته: ئەی خوایە ئێمە(زوڵم)مان لەخۆ کرد ئەگەر تۆ لێمان خۆش نەبیت و ڕەحممان پێ نەکەیت ئێمە لە خەسارەت مەندەکان دەبین.

**پرسیار:** ئەی کەواتە اللَّه بۆ شەیتانی دروست کردووە؟

**وەڵام:** فریشتە پاکترین دروست کراوی اللَّه ن و داوای شتی پاکیش دەکەن، بەهەمان شێوە شەیتانەکان خراپترین و بەدکارترین دروست کراوی اللَّه تعالی ن و داوای کاری خراپ دەکەن.

ئادەمیزاد لەنێوان ئەمانەدا خاوەن ویست و بیرکردنەوەی خۆیەتی، دەتوانێ بەوویستی خۆی ڕێگای فریشتەکان هەڵبژێرێ تاوەکو دوارۆژ بچێتر بەهەشت، بەهەمان شێوە دەتوانێ بە وویستی خۆی ڕێگای شەیتان بگرێتە بەر و بەرەو دۆزەخ هەنگاو بنێت،یلێرەدا ئادەمیزاد خاوەن وویستی خۆیەتی، اللَّه تعالی ش ئاگاداری دەکاتەوە کەوا ڕێگای شەیتان نەگرێتە بەر،چونکە شەیتان هۆیەکە لە هۆیەکانی تاقی کردنەوەی مرۆڤ لەم ژیانەدا.

**پرسیار:** باوەڕ هێنان بە کتێبەکانی اللَّه چی دەگرێتەوە؟

**وەڵام:** باوەڕ هێنان بە کتێبەکانی اللَّه ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١) باوەڕێکی تەواو بەگشت کتێبەکان لەلای اللَّه هاتوون بۆ پێغەمبەران و لەوانیشەوە بۆ بەندەکانی اللَّه، بەئامانجی ڕێنموونی بۆ کاری چاک و چەسپاندنی یەکخواناسی.

٢) باوەر بوون بەوە کەگشت کتێبەکان گوتەی اللَّه ن.

٣) باوەڕ هێنان بەهەموو ئەو شەریعەتانەی کەلە قورئان دا هاتوون.

٤) باوەڕ هێنان بەوە کەگشت کتێبە ئاسمانیەکان یەکتر بەڕاست دەزانن.

٥) باوەڕ هێنان بەوە کەهەندێک هەندێکیان نەسخ کردۆتەوە.

٦) باوەڕ هێنان بەوە کەهیچ کتێبێکی تر لەدوای قورئان نایەت تاکو(نسخ)ی بکاتەوە.

٧) باوەڕ هێنان بەگشت کتێبەکان و ئەوانەی کە تیایاندا هاتوون،کتێبەکانیش بریتین لە (قورئان)کە بۆ محمد ﷺ هاتۆتە خوارەوە،(تەورات) بۆ (موسی) و (ئینجیل) بۆ (عیسی) و (زەبور) بۆ (داود) و (صحف) بۆ (ابراهیم و موسی) (علیهم الصلاة والسلام) هاتۆتە خوارەوە.

٨) باوەڕ هێنان بەوە کە قورئان هەموو کتێبەکانی تری(نسخ)کردۆتەوە و بەتەنها حوکم بەویش دەکرێ، ئەگەر پێغەمبەران زیندوو ببنەوە هەر دەبێ حوکم بەو بکەن (عیسی) (علیه الصلاة والسلام)دوای هاتنە خوارەوەی لە ئاسمان حوکم بە قورئان دەکات.

**پرسیار:** ئایا بۆچی ئەو کتێبانەی کەدەهاتنە خوار،دوا بەدوای ئەوان کتێبێکی تر دەهاتە خوارەوە گشت ئەوانی تری (نسخ)دەکردەوە؟

**وەڵام:** هەر کتێبێکی ئاسمانی کە دەهاتە خوارەوە لەگەڵ ئاستی ژیری خەڵکەکە دەدوا،بەڵام لەبەر ئەوەی زانیاری بەردەوام بەرەو پێش دەچێت، بۆیە اللَّه تعالی کتێبێکی تری دەهێنا خوار بۆ ئەوەی لەگەڵ زانستی ئەم خەڵکە بگونجێ، ئینجا کە قورئانیش هاتە خوارەوە بەجۆرێ وابوو کەهەرچەند زانست و زانیاری پێش کەوێ لە سنووری ئەم قورئانە دەرنەدەچوو دەریش ناچێ. چونکە کتێبەکانی پێشوو گشتیان لەسەر دەستی پێشەوایانی ئاینی، ئەم کاتی تێک دەچوو، (چونکە عەجایب نییە کاتێ کە پێشەوایانی ئاینی ساتمەیان برد میلەتێک لەدوای ئەوان ساتمە بەرن، لە کوردستانی خۆشمانا زۆر لە تەرزە پیاوانی واهەن کە بارن بەسەر دینەکەوە و خۆیان کردۆتە چاوساغی ئەم دینە بەڵام عەجایب لەوەدایە کە ئەحمەدی موفتی زادە بەڕەحمەت بێ دەڵێ:ئەمان هەر هەن و دینی ئیسلامیش هەر وەک خۆی ماوە)بەڵام ئەمە عەجایب نابێ چونکە بۆ دواجار اللَّه تعالی قورئانی ناردە خوارەوە بۆخۆشی پارێزگاری لێ دەکات و بەجۆرێ کە هیچ سەر لێ شێواوێک تێک نەچێ،هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(ا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ)** الحجر٩، واتە: ئێمە بۆخۆمان قورئانمان ناردۆتە خوارەوە هەر بۆخۆشمان پارێزگاری لێ دەکەین.

**پرسیار:** قورئان بە چەند قۆناغ هاتۆتە خوارەوە؟

**وەڵام:** قورئان بە سێ قۆناغ هاتۆتە خوارەوە:

١)قۆناغی یەکەم: قورئان هاتۆتە (اللوح المحفوظ)بەبەڵگەی ئەم ئایەتە: **(بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَجِيدٌ فِي لَوْحٍ مَحْفُوظٍ)** البروج٢١-٢٢، واتە: ئەم کتێبە (قورئانێکی)بەرزە لە(لوح المحفوظ)واتە بۆ یەکەم جار قورئان لەلای اللّه هاتۆتە (لوح المحفوظ)

٢)قۆناغی دووەم: لە (لوح المحفوظ)ەوە هاتۆتە(بیت العز)لە ئاسمانی دونیا، هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ)**القدر١،واتە: ئێمە قورئانمان لە شەوێکی پیرۆزەوە بۆ(بیت العز)ناردە خوارەوە...

٣)قۆناغی سێیەم: کە دوا قۆناغە ئەویش لە(بیت العز)ەوە لەرێگەی(جبریل)ەوە(علیه الصلاة والسلام)هاتە نێو دڵی پێغەمبەری ئیسلام ﷺهەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ)**الشعراء١٩٣-١٩٥، واتە:جبریل(علبه الصلاة والسلام)قورئانی بۆ نێو دڵی تۆ هێنا خوارەوە بۆئەوەی بەزمانێکی ڕوونی عەرەبی بی بە ترسێنەرانی(خەڵکی).

**پرسیار:** قورئان چەند ناوی هەیە؟

**وەڵام:** قورئان زۆر ناوی هەیە گشتیان پێناسن بۆ قورئان:

بۆ نموونە:

١)قورئان: **(إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ)**الأسراء٩،

٢)الكتاب: **(لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ)**الانبياء١٠،

٣)الفرقان: **(تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا)**الفرقان١،

٤)الذكر: **(إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَوَ إِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ)**الحجر٩،

٥)التنزيل:**(وَ إِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ)**الشعراء١٩٢

٦)شکۆمەندی(مجید): **(بَلْ هُوَقُرْآنٌ مَجِيدٌ)**البروج٢١،واتە:ئەم قورئانە (قورئانێکی)خاوەن پایە و شکۆمەندە.

٧)موژدەدەر(بشیر)و ترسێنەر(نذیر): **(كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ بَشِيرًا وَنَذِيرًا)**فصلت٣-٤،(ئەم کتێبە)کتێبێکە کە ئایەتەکانی جیاکەرەوەی حەق و ناهەقن،(ئەم قورئانە) قورئانێکە بۆ ئەو کەسانەی کە دەزانن،موژدەدەر و ترسێنەرە.

**پرسیار:** ئایا کەس دەتوانێ کتێبێک وەک ئەم قورئانە بنوسێ؟

**وەڵام:** نەخێر: هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ:**(لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْكَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا)** الأسراء٨٨، واتە: ناتوانن وێنەی ئەم قورئانە بهێنن ئەگەر هەندێکیشیان پاڵپشتی هەندێکیان بن.

**پرسیار:** ئایا قورئان بۆچی بە یەکجار نەهاتۆتە خوارەوە؟
**وەڵام:** قورئان لەگەڵ ژیانی خەڵکی ئەو کات دەڕۆیشت و وەڵامی ئەو پرسیارانە بوو کە لەکاتی خۆی لە پێغەمبەر ﷺ دەکرا، هەروەها قورئان بە ماوەی(٢٣)ساڵ لە مەککە و مەدینە هاتۆتە خوارەوە، ئەوانەی لە مەککە هاتوون پێیان دەڵێن سورەتی(مكي) ئەوانەی لە مەدینە هاتوونە خوارەوە پێیان دەڵێن: سورەتی(مدني).

**پرسیار:** ئایا قورئان قسەی اللَّه(كلا اللَّه)یە یان دروست کراو(مخلوق)ە.
**وەڵام:** قورئان بریتیە لە قسەی اللَّە،هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ:**(وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ)**التوبة٦، واتە: ئەگەر یەکێک لە موشریکەکان داوای پەناگەی لێ کردی تۆش پەنای بدە تا ئەو کاتەی گوێی لە قسەی اللَّە(ئایەتەکانی اللَّە) دەبێ.

**پرسیار:** ئایا قورئان بۆچی هاتووە؟
**وەڵام:** بۆ کار پێ کردنی،بۆ ئەوەی خەڵکی لە تاریکایی ڕزگار بکات بەرەو ڕووناکیان ببات،هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(فَاقرَأوا القُرأن وأعْمَلوا بِهِ ولا تَأكُلوا بِهِ)**رواه الامام أحمد،واتە: قورئان بخوێنن و کاریشی پێ بکەن، بەڵام بازرگانی پێ مەکەن.
هەروەها اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُورِ)**ابراهيم١،واتە: ئەم کتێبێکە کە بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە(کە قورئانە)بۆ ئەوەیە کەوا خەڵکی ڕزگار کەیت لە تاریکایەکانی(نەفامی)بۆ ڕووناکایی(ئیسلام).

هەروەها قورئان بەچەند ناوێکەوە چوێنراوە کە گشتیان بریتین لە تایبەتمەندیەکانی قورئان،بۆ نموونە:
١)چرا(لنور): **(يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُم بُرْهَانٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا)**النساء١٧٤،واتە: ئەی ئادەمی بەڕاستی پێتان گەیشت بەڵگەی ئاشکرا لەلایەن پەروەردگارتانەوە وە ناردومانە خوارەوە بۆلای ئێوە ڕووناکیەک کە قورئانە.

٢)ڕێنمایی(الهدى)و چارەسازی(الشفاء)و خێر و خۆشی(الرحمة)و ئامۆژگاری(المو عظه)هەروەک الله تعالى دەفەرمووێ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِّمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ)يونس٥٧،واتە:ئە خەڵكینە بەڕاستی بۆ ئێوە ئامۆژگاریتان لەلای پەروەردگارەوە بۆ هاتووە کەوا شیفایە بۆ دڵەکان و ڕێنمایی و خێر و خۆشیە بۆ بڕواداران.

٣)پیرۆزی(المبارک): (وَهَٰذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ)الانعام٩٢،واتە:ئەم کتێبە کتێبێکی پیرۆزە هاتۆتە خوارەوە کەوا هەموو کتێبەکانی پێش خۆی بەڕاست دائەنێ.

٤)مژدە(البشرى): (مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ)البقرة٩٧، واتە: کتێبەکانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێ و بۆخۆشی ڕێنیشان دەر و مژدەیە بۆ بڕواداران..

٥)زاڵ(العزيز): (إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالذِّكْرِ لَمَّا جَاءَهُمْ ۖ وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ)فصلت٤١، واتە: ئەوانەی بڕوایان بە قورئان نییە ئەو کاتەی کە بۆیان هات،بەڕاستی ئەم کتێبە زاڵە بەسەر هەموو کتێبێکی تر.

**پرسیار:** بۆچی قورئان لە مەککەوە لەناو عەرەبەکانا بە عەرەبی هات؟

**وەڵام:** لەبەر چەند هۆیەکی سەرەکی گرنگترینیان بریتیە لە:

١)نیوەی دوورگەی عەرەبی و شاری مەککە و دەورو بەری باشترین شوێن و ڕێ کەوتووترین جێگا و هەڵبژێراوترین زەوی بوو بۆ هەڵقولاندن و پەرەسەندنی ئاینی پاکی ئیسلام لەو کاتەدا، وە گونجاوترین نوختە بوو بۆ ئەوەی ئەو کاروانە جیهانیە لەوێوە دەست پێ بکات.

٢)لەو کاتەوە دەوڵەتێکی دامەزراو و خاوەنی دەستوور و ڕژێم و سوپا و هێز و دەسەڵات نەبوو لەنیوە دوورگەدا کە بەدەسەڵاتەکەیەوە ڕابوەستی لەڕێی عەقیدە و باوەڕەکەدا و خەڵکی لێ دوور بخاتەوە،یاخۆ بەزۆر خەڵکی لێ کۆکاتەوە لەترسانا هەموو جۆرە کەسی یا وەکو ئەڵێن ڕەش و بۆرو بازووی تیا کۆببنەوە.

٣)لەوێدا ئاینێکی ڕێک و پێک و خاوەنی بیرو باوەڕ نەبووە،وە بت پەرستیەکەیان شتێکی پڕوپوچ و شڕ و شێواوو بێ سەروبەر بوو.

٤)باری کۆمەڵایەتی نیوە دوورگەکە نرخ و بەهایەکی گەورەی بوو بۆ پاراستنی ئاینەکە و بۆ لایەنگری بانگە تازەکە، دەور دەوری عەشایەری و تیرە پەروەری بوو.یاسای دەمارگیری و ڕەگەزایەتی و کەسایەتی لەبرەو باوبوو.

٥)نیوه دوورگەکه خاکێکی بەپیت بوو بۆ ڕواندنی تۆوی ڕاچەنین و شۆڕشەکه،وه پڕ بوو لەو مرۆڤانەی بتوانن ئاڵای ئیسلام هەڵبگرن و سەر زەوی پێ ڕۆشن بکەنەوه، وه زۆر خاوەن ئەزموون بوون بەهۆی هاتوچۆ کردنیان بۆ دەورو بەری ئەو دوو ئیمپراتۆریەتەی ڕۆم و فارس که هەبوون،بەتایبەت له کاروانی هاوینەی شام و کاروانی زستانەی یەمەن دا.

٦)بەنسبەت زمانی عەرەبیشەوه: بەڕاستی و بێ دەرمارگیری زمانی عەرەبی زمانێکی تەڕوو پاراوو ڕەوان و گوشادو فراوانه،وه زمانێکی بەرزی جیهانیه، بەتایبەت لەکاتی ئیسلاما باشترین زمان بوو بۆ وەرگرتنی ئاینەکه و هەڵگرتن ڕاگەیاندنی به مرۆڤەکانا،وه ئەگەر کەم و کوڕی تیا بوایه نەی ئەتوانی ئاینەکه ئاوەها بڵاو بکاتەوه و لەنیوه دوورگەدا ئەمایەوه.

**پرسیار:** قورئان چۆن کۆکرایەوه؟

وەڵام: قورئان له چاخی یەکەم(صدر الأول) دا(٣)جار کۆکرایەوه.

١) له ماوەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ دا: کۆکردنەوەی قورئان بەڵگەیه لەسەر نووسینی ئایەتەکان و ڕێکخستنی ناوو دانانی ئایەتەکان لەشوێنی سورەتی خۆی لەماوەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ دا ئەگەر وانەبا چۆن دەزانرا ئایەتەکان شوێنیان کامەیه؟

٢) لەکاتی خەلیفایەتی ئەبو بەکردا(ڕەزای خوای لێ بێ)جارێکی تر قورئان کۆکرایەوه بەڕێک و پێک تر له جاران...

٣) لەکاتی خەلیفایەتی ئیمامی عوسمان دا(رضي الله عنه) بۆ دواجار بەڕێک و پێکتر له پێشوو به(٣) دانه نووسرایەوه، شایەنی باسه تا ئێستا قورئان لەسەر ڕێکخستنی ئیمامی عوسمان چاپ دەکرێتەوه.

**پرسیار:** گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ چی بوو؟

وەڵام: گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ بریتی بوو له(قورئان)کەوا بەرەنگاری بێ باوەڕەکانی مەککەی پێ دەکرد، که بتوانن ئایەتێکی ئەم قورئانه بهێنن،ئەگەر چی بێ بڕواکان له نێو فەرهەنگ و ئەدەبیات و بەلاغه و ڕەوان بێژی و ...هتد ڕۆچوون.

**پرسیار:** ئەعجازەکانی قورئان چین؟

**وەڵام:** هەندێکیان بریتین لەمانەی خوارەوە:

١)هەواڵێک کە شاراوە بوو هێشتا نەهاتبوو،لە دوایی دا دەهات.

٢)هەواڵی ڕاستی و دروستی ئەو پێغەمبەرانەی پێ بوو کە ڕابردوون.

٣)ڕێک و پێکی و شێوازی ڕەوانبێژی(بەلاغە)لە قورئاندا.

٤)زانیاریەکانی دەروونی ئادەمیزاد و نهێنی گەردوون.

٥)هیچ کەسێک ناتوانێ وێنەی ئەم قورئانە بهێنێ.

**پرسیار:** پایە(فضل)ی قورئان خوێندن چییە؟

**وەڵام:** قورئان خوێندن خێرێکی زۆر گەورەی هەیە لەلای اللَّه،هەروەک لەم فەرموودانەی لای خوارەوە بەدیار دەردەکەوێ:

١) **(اقْرَأُوا الْقُرْآنَ فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعاً لأَصْحَابِهِ)**رواه مسلم.واتە:قورئان بخوێنن،چونکە ڕۆژی دوایی ئەم قورئانە دێ شەفاعەت بۆ هاوڕێ قورئان خوێنەکەی دەکات.

٢) **(مَن قرأَ حرفًا من كتابِ اللَّهِ فلَهُ بِهِ حسنةٌ، والحسنةُ بعشرِ أمثالِها، لا أقولُ آلم حرفٌ، ولَكِن ألِفٌ حرفٌ ولامٌ حرفٌ وميمٌ حرفٌ)**رواه الترمذي حديث حسن صحيح،واتە: هەر کەسێک وشەیەک لە کتێبی اللَّه (قورئان) بخوێنێ چاکەیەکی بۆ دەنوسرێ،چاکەش دە خێرە من ناڵێم(الم)پیتێکە،بەڵکو(الف)پیتێکە و (لام)پیتێکە و (میم)ش پیتێکە.

**پرسیار:** خێری ئەو کەسە چییە کەبەس گوێ لە قورئان ڕابگرێ؟

**وەڵام:** پێغەمبەری خوا ﷺ **(مَن استمَعَ إلَي آية مِن كِتاب الله عَزَوَجَلَّ كانَت لَه نورًا يومَ القيامَة)**رواه أحمد، واتە: هەرکەسێک گوێ لە ئایەتێکی قورئانی پیرۆز ڕابگرێ ئەوا لەڕۆژی دوایی چرایەکی ڕووناکی بەبەر دەکەوێ.

**پرسیار:** گرنگی باوەڕهێنان به کتێبەکان چییه؟

**وەڵام:** گرنگی باوەڕهێنان به کتێبەکان بریتیه له:

١)دەزانین کەوا اللَّه تعالى بايەخى بەبەندەكانى خۆى داوه كەوا كتێبى بۆ ناردوون و تاوەكو حيكمەتى دروست بوونى خۆيان بزانن و ڕێگای چاكی خۆيان بناسن.

٢)دەزانین حيكمەتى اللَّه چييه له شەريعەتەكەى،كه بۆ هەرگەلێک شەريعەتێكی پڕ به پێستی ئەوانی بۆ ناردوون.

٣)لەسەر ئەم چاكانه ستايشى اللَّه تعالى بكەين،كه ناردنی پێغەمبەران و کتێب و شەريعەت دانانه.

**پرسیار:** باوەڕهێنان به پێغەمبەران(عليهم السلام)يانى چى؟

**وەڵام:** باوەڕهێنان به پێغەمبەران(عليهم السلام)واته:

١)باوەڕهێنان بەوەی كه اللَّه تعالى بۆ هەر گەلێک پێغەمبەرێكی ڕەوان كردووه كه داوا له گەلەكەی خۆيان دەكەن اللَّه ی تاک و تەنيا بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕيار نەدەن.

٢)دەبێ باوەڕت بەوەبێ كه گشت پێغەمبەران(عليهم السلام)ڕاستن و درۆ نين.

٣)بانگەوازی گشت پێغەمبەران(عليهم السلام)هەر يەكه.

٤)باوەڕهێنان بەوه كه بانگەوازی هەموو پێغەمبەران(عليهم السلام)هەقه و هەركەسێكيش بڕوا بەيەكيان نەكات ئەوه كافر بووه به هەمووان.

٥)باوەڕ هێنان بەگشت ئەو هاوەڵانەی كه باسيان لێ كردوون.

**پرسیار:** چەند پێغەمبەر(علیهم والصلاة والسلام) تا ئێستا هاتوون؟ناویان چییە؟

**وەڵام:** لە(مسند)ی ئیمام (أحمد)هاتووه کەوا(١٢٤٠٠٠)پێغەمبەر هاتوون، بەڵام ئەوەی کە لە قورئان دا هاتوون بریتین لە(٢٥)پێغەمبەر،کە ئەمانەی خوارەوەن:

(أدم،نوح،أدريس،صالح،ابراهيم،هود، لوط، يونس، اسماعيل، اسحاق، يعقوب، يوسف، أيوب، شعيب، موسى، هارون، اليسع، ذوالكفل، داود، زكريا، سليمان، الياس، يحيى، عيسى، محمد،) (علیهم والصلاة والسلام)

ناوی ئەم پێغەمبەرانەش لەم ئایەتانەی خوارەوە هاتوون:

١) **(وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَىٰ قَوْمِهِ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَّن نَّشَاءُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ،وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِ دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ وَ أَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَارُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ،وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ الصَّالِحِينَ،وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ)** الانعام٨٤-٨٦،

٢) **(وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا)** هود٥٠،

٣)**(وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا)** هود٦١،

٤)**(وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا)** الاعراف٨٥،

٥)**(إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَىٰ آدَمَ)** ال عمران٣٣،

٦)**(وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ ۖ كُلٌّ مِّنَ الصَّابِرِينَ)** الانبياء٨٥،

٧)**(مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ)** الفتح٢٩،

**پرسیار:** ئایا(أولو العزم)کێن؟

**وەڵام:** بریتین لەم(٥)پێغەمبەرەی خوارەوە:

(محمد، ابراهيم، موسى، عيسى، نوح)(علیهم الصلاة والسلام).

**پرسیار:** اللَّه تعالى بۆچی پێغەمبەرانی ناردووه؟

وەڵام: اللَّه تعالى بۆ زۆر شت پێغەمبەرانی هەڵبژاردووه،لەوانە:

١)اللَّه تعالى پێغەمبەرانی ڕەوان کردووه تاوەکو خەڵکی بە اللَّه ی بناسێنن و بانگیان بکەن بۆ یەکخواناسی، هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ)**الانبياء٢٥،واتە: هیچ پێغەمبەرێکمان لە پێش تۆدا نەناردووه مەگەر پێمان ڕاگەیاندبێ کە غەیری من هیچ کەس شیاوی پەرستن نییە و بەتەنها من بپەرستن.

٢)بۆ ئەوەی ئایەتی اللَّه مان بەسەردا بخوێنن و پاکمان بکەنەوە لە خەسڵەتی شەیتان و فێری(کتێب)ی اللَّه و حیکمەت و لێزانینمان بکەن،هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا تَعلَمُونْ)**البقرة١٥١، واتە: هەر وەکو ئێمە پێغەمبەرێکمان لەخۆتانەوە بۆ ناردوون، بۆ ئەوەی ئایەتەکانی ئێمەتان بەسەردا بخوێنێ و پاکتان بکاتەوە و فێری قورئان خوێندن و کارزانیتان بکات و شتی واتان فێر بکات کە ئێوە لە پێشدا نەتان دەزانی.

٣)بۆ ئەوەی ڕزگارمان بکات لە دووبەرەکی و ڕێنمایمان بکات لە ژیاندا بۆ ڕێگەی هەق و ڕاستی،هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(وَمَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ ۙ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ)**النحل٦٤،واتە: ئێمە قورئانمان بۆ تۆ نەناردووەتە خوارەوە،تەنها بۆ ئەوە نەبێ کە ئەو شتانەی لێی ناکۆکن بۆیان ڕوون بکەیتەوە، ئینجا ئەم کتێبە ڕێ نیشاندەر و ڕەحمەتە بۆ گەلێکی بڕوادار.

٤)پێغەمبەران هاتوون بۆ چەسپاندنی ئاین و بەرنامەی اللَّه تعالى و وەلانانیی دووبەرەکی و ناتەبایی، هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ ۖ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا)**الشورى١٣،واتە: اللَّه تعالى لە ئاینەکەی خۆی بۆی ڕوون کردوونەوە کە پێشتر بۆ (نوح)دانرابوو،ئەو بەرنامەی کە بۆ تۆمان ڕەوان کردووه هەر ئەوەیە کە ڕاسپاردەی(ابراهیم)و(موسى)و(عیسى)ی پێکرابوو،کە دینی اللَّه بەرپا بکەن و سەقام گیری بکەن.

٥)پێغەمبەران بۆ ئەوە هاتوون کە مژدەی بەهەشت بە مسوڵمانان بدەن و بێ بڕوایان بترسێنن بە ئاگری دۆزەخ،هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا)**الفتح٨، واتە: ئێمە تۆمان بە شایەد و مژدەدەر و ترسێنەر ناردووه.

٦)بۆ ئەوەی هاتوون کەوا بین بەسەر قافڵە و پێشەنگ(أسوة حسنة)ی خەڵکی،هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ...)**الاحزاب٢١،واتە: بەڕاستی بۆ ئێوە لە پێغەمبەری خواوە،پێشەنگی و سەقافڵەیی هەیە.

**پرسیار:** ئایا پێغەمبەران(علیهم السلام)پارێزراو (معصوم)ن لە تاوان یان نا؟

**وەڵام:** (عصمة)یەکە لە تایبەتمەندیە هەرە چاکەکانی پێغەمبەران،اللَّه تعالى ڕێزی لێ گرتوون و پاڵاوتنی لەو گوناهانەی کە بەدرێژایی ڕۆژگار ئادەمیزادەکان دەیکەن،تا ئێستا هیچ خیانەتێک،دزی و درۆیەکیان لێ روونەداوە،هەروەک اللَّه تعالى لە ئاستیا دەفەرمووێ: **(وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَ إِقَامَ الصَّلَاةِ وَ إِيتَاءَ الزَّكَاةِ وَكَانُوا لَنَا عَابِدِينَ)** الانبياء٧٣،واتە: ئێمە پێغەمبەرانمان(ابراهیم و لوط و اسحاق و یعقوب)کردۆتە پێشەوا،بە فەرمانی ئێمە دەڕۆن بەڕێوە و سرووش(وحی)مان بۆ ناردوون کەوا کاری چاک ئەنجام بدەن و نوێژ بکەن و زەکات بدەن و بەتەنهاش من دەپەرستن.

**پرسیار:** ئەی بۆچی(أدم)علیه الصلاة والسلام،فەرمانی اللَّه ی شکاند و نزیکی ئەو دارە کەوتەوە کەوا اللَّه تعالى بەرهەڵستی لێ کردبوو؟

**وەڵام:** ڕاستە اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(وَعَصَىٰ آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَىٰ)** طه١٢١،واتە: ئادەم لە اللَّه ی خۆی یاخی بوو بە قسە (وەسوەسە)ی شەیتان تەفرە درا.

بەڵام کاتێ سەیری ئایەتەکەی دوای ئەو دەکەیت دەفەرمووێ: **(ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ)** طه١٢٢،واتە: پاشان اللَّه دووری خستەوە لە تاوان و ئینجا لێی خۆش بوو ڕێنمایی کرد.

بەڵام (أدم) علبه الصلاة والسلام، ئەم تاوانەی لە پێش پێغەمبەرایەتی بوو نەک لەکاتی پێغەمبەرایەتی، هەروەها تاوانەکەی ئادەم(علیهم الصلاة والسلام)بەهۆی لەبیرکردن بوو نەک لەکاتی ئاگاییەوە بێ،هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَىٰ آدَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا)** طه١١٥،واتە:ئێمە لەپێشدا پەیمانمان لە ئادەم وەرگرت(لەسەر ئەوە کەوا نزیکی دارەکە نەکەوێ)بەڵام ئادەم ئەم پەیمانەی لە بیرکرد.

**پرسیار:** (معجزة)چییە؟

**وەڵام:** بریتیە لەو شتە دەستەوسان کەرەی کەلەسەر دەستی پێغەمبەران ڕوودەدەن،واتە:شتێک کەلە ژێری ئادەمیزاد دوورە.

**پرسیار:** تایبەتمەندیەکانی(معجزة)چییە؟

**وەڵام:** بەچەند خاڵێک(معجزة) دەناسینەوە کە ئەمانەی خوارەوەن:

١)دەستەوسان کەر بێ.

٢)(تحدّی)ی تێدا بێ وەکو ئەو(تحدّی)یەی کە(اللّٰه)کردی لەسەر ئەوەی کەسێک بتوانێ وێنەی ئەم قورئانە بهێنێ.

٣)(معجزة)لەلای(اللّٰه)وە بێ.

٤)لەسەر دەستی پێغەمبەران ڕووبدات.

٥)(معجزة)ەکە پاڵپشت بێ بۆ بانگەوازی ئەو پێغەمبەرەی کەلەسەر دەستی ئەو ڕوو دەدات.

٦)نابێ دژایەتی لەگەڵ بانگەوازەکەی ئەو بکات.

**پرسیار:** (معجزة)ی پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام) چین؟

**وەڵام:** هەر پێغەمبەرێک(معجزة)یەکی تایبەتی خۆی هەبوو کە بەم شێوەیەی خوارەوە بووە:

١)(معجزة)ی ئیبراهیم(علیه الصلاة والسلام):دوای ئەوەی کە ئیبراهیم(علیهم الصلاة والسلام) چەندین بەڵگەی هێنا بۆ گەلەکەی لەسەر ئەوە کە غەیری(اللّٰه)هیچ شتێک شایەنی پەرستن نییە،ئەوانیش بەردەوام بە خراپترین شێوە ڕووبەڕووی دەبوونەوە.تاوەکو ڕۆژێک ئاگرێکی زۆر گەورە و فراوانیان کردەوە و (ئیبراهیم) یان علیه الصلاة والسلام تێ فڕێ دا ناو ئاگرەکە،بەڵام اللّٰه تعالی بە لوتف و کەرامەتی خۆی یاسایی ئاگرەی گۆڕی و (ابراهیم)علیه الصلاة والسلام بەسەلامەتی لە ئاگرەکە هاتە دەرەوە بێ ئەوەی شوێنێکی گەرم داهاتبێ،ئەمەش(معجزة)یەکی اللّٰه یی بوو کە اللّٰه تعالی لەسەر دەستی (ابراهیم)علیه الصلاة والسلام هێنایە خوارەوە.

٢)(معجزة)ەکانی موسی(علیه الصلاة والسلام):

موسی علیه الصلاة والسلام، بانگی (فیرعەون)ی دەکرد بۆ یەکخواناسی بەڵام(فیرعەون)زیاتر گومڕا دەبوو و بە ساحیرەکانی خۆی هەڵخەڵەتابوو، بۆیە اللّٰه تعالی ش گۆچانێکی خستبووە بەر دەستی (موسی) تاوەکو ڕۆژێک کە هەموو ساحیرەکان سیحری خۆیان دەکرد،ئەویش گۆچانەکەی خۆی فڕێ دا سەر زەوی یەکسەر گۆچان بەویستی اللّٰه بوو بە ئەژدیهایەک هەموو ماری ساحیرەکانی خوارد.

ئینجا دوای ئەوەی کە فیرعەون بەدوای(موسی)کەوت،لەو دەمە(موسی)گەیشتە ڕووبارێک و اللّٰه تعالی ڕووبارەکەی بۆ کردە دوو لەت و بە ناوەندیان دا ڕەت بوو،بەڵام کاتێ(فیرعەون)ویستی بەهەمان شوێن بپەڕێتەوە یەکسەر ئاوەکان بەیەکتر گەیشتنەوە و (فیرعەون)و دار و دەستەکەی لەناو ئاوەکەدا خنکان.

٣)(معجزة)ەکانی( عیسی)علیه الصلاة والسلام:

*قسه کردن لەناو بێشکه

*باڵندەی لەقوڕ دروست دەکرد و پاشان فووی پیا دەکرد و باڵندەکه به ئیزنی الله یەکسەر دەستی به فڕین دەکرد.

*چاک کردنەوەی بەڵەک و کوێری.

*زیندوو کردنەوەی مردوو.

*ئاشکرا کردنی ئەو شتانەی کە خەڵکی لەماڵی خۆیان دەیان شاردنەوە.

**پرسیار:** جیاوازی نێوان(رسول)و(نبي)چییه؟

وەڵام: (نبي)شەریعەتی نوێی پێ نییه بەڵکو ئاینی پێغەمبەری پێش خۆی زیندوو دەکاتەوە،بەڵام(رسول)بابایەکه کە شەریعەتێکی نوێی پێیه لەلای (الله)وە بۆیه دەڵێین:هەموو(رسول)ێک(نبي)ە،بەڵام مەرج نییه هەموو (نبي)ێکیش(رسول)بێ.

**پرسیار:** باوەڕمان چۆن بێ به پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ؟

**وەڵام:** پێویسته لەسەر ئێمه باوەڕمان بەوە بێ کە(موحەمەد)کوڕی(عەبدوڵڵا)نێراو و بەندەی دڵسۆزی الله یه،هیچ کاتێک هاوەڵی بۆ الله بڕیار نەداوە و هەروەها خاتەم و گەورەی پێغەمبەرانه و هیچ پێغەمبەرێکیش لەدوای ئەم پێغەمبەره نایه.

هەروەها هەر بۆخۆی پێغەمبەری ئینسان و جنۆکەیه و بەشەریعەت بۆ هەر هەموویان هاتوە،پێویسته له خۆمان و باوک و دایک و ماڵ و حاڵمان خۆشتر بوێ،باوەڕمان دەبێ هەبێ کە ئەو (معجزة)انەی لەسەر دەستی ئەو ڕوودەدەن بەڵگەن لەسەر ڕاستی و دروستی ئەم پێغەمبەره.

**پرسیار:** (معجزة) ەکانی(موحەمەد) ﷺ چین؟

وەڵام: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر(موعجیزە)ی هەبوون لەوانه:

١)قورئانی پیرۆز.

٢)لەت کردنی مانگ.

٣)هەڵکشان بەرەو ئاسمان(الأسراء والمعراج).

٤)دەرچوونی ئاو له کەلێنی پەنجەکانی.

٥)زۆر کردن و بەبەرەکەت خستنی خواردن...هتد.

**پرسیار:** هەقی پێغەمبەر ﷺ چییە بەسەر ئوممەتەکەیەوە؟

**وەڵام:** پێغەمبەر ﷺ گەڵێ هەقی بەسەر ئوممەتەکەیەوە هەیە، لەوانە:

١)بڕوا پێ بوونی:هەروەک اللّه تعالى دەفەرمووێ: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ)**النساء١٣٦، واتە:ئەی بڕوادارینە،بڕوا بهێنن بە اللّه تعالى پاشان بە پێغەمبەر ﷺ.

٢)گوێ ڕایەڵ بوونی: هەروەک اللّه تعالى دەفەرمووێ: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ..)** النساء٥٩، ئەی بڕوادارینە،گوێ ڕایەڵی اللّه تعالى پاشان پێغەمبەر ﷺ بن.

٣)شوێن کەوتن و پەیوەندی پێ کردن:هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَلَدِهِ وَوَالِدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ)**رواه البخاري. واتە: بڕوای نییە کەس لە ئێوە تاوەکو منی لەخۆی و لە کوڕی و لە باوکی و لە هەموو خەڵکی خۆشتر نەوێ.

٤)کاتێ کە گوێت لە ناوی دەبێ سەڵەواتی لەسەر لێ بدەیت، هەروەک پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(البخيل الذي من ذُكِرتُ عندَهُ فلم يصلِّ عليَّ)**رواه الترمذي،واتە:پیاوی ڕەزیل ئەو کەسەیە کە ناوی منی لەلا ببیێت و سەڵەواتم لەسەر لێ نەدات.

٥)خۆشەویستیمان بۆی هەبێ، بە جۆرێک کەسمان لە دروست کراوەکانی اللّه خۆشتر نەوێ،هەروەک پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەفەرمووێ: **(والذي نَفسي بيَدهِ لايؤمِنُ أحدُكم حتى أكونَ احبَّ إليه من مالِه وأهلِه والناسِ أجمعين)**متفق عليه. واتە: سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە یەک لە ئێوە باوەڕی تەواو نابێ تاوەکو خۆشەویست ترین کەسی نەبم لای ئەو لە ماڵەکانی و لە دایک و باوکی و لە هەموو خەڵکی.

٦)نزم کردنی دەنگ لە کاتێ فەرموودەکانی باس دەکرێ،یان لەلای گۆڕەکەی یان لە مزگەوتەکەی،هەروەک اللّه تعالى دەفەرمووێ: **(إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ...)**الحجرات٣،واتە:ئەو کەسانەی کە دەنگیان نزم دەکەن لەلایەن پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە ئەو کەسانەن کە اللّه تعالى دڵەکانیانی تاقی کردۆتەوە بۆ پارێزگاری لە تاوان و سەرپێچی.

٧)بەڕاست دانانی هەر شتێک کە باسی لێوە کردووە یان هەواڵی پێ داوین،جا چ لەکاری دین یان دونیایی،هەروەک اللّه تعالى دەفەرمووێ: **(وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا)**الحشر٧، واتە:ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆی هێناون وەری بگرن،وە ئەوەی نەهی کێ کردوون تخوونی مەکەون.

٨)زیندوو کردنەوەی سوننەتەکانی و ئاشکرا کردنی بەرنامەکەیی و گەیاندنی بانگەوازەکەی بە هەموو کون و قوژبنێکدا هەروەک دەفەرمووێ: **(مَنْ أحيا سُنَّةً من سُنَّتي قدْ أُميتَتْ بَعدِي فإنَّ لهُ من الأجرِ مِثلَ مَنْ عَمِلَ بِها النأَّس)**رواه أبن ماجه،واتە: هەرکەسێک سونەتێک لە سونەتەکانی من زیندوو بکاتەوە لە نێو خەڵکی کە لە پاش من نەمابێ(کاری پێ نەکرابێ)و ئەوا پاداشتی بۆ هەیە بەقەد هەرکەسێک کەکاری پێ دەکات.

**پرسیار:** تایبەتمەندییەکانی(الخصائص)ی پێغەمبەر ﷺ چین؟

وەڵام: ئەو تایبەتمەندییانەی کەلە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دا هەیە بەڵام لە پێغەمبەرانی تر دا نەبوون بریتین لە:

١)خاتەمی پێغەمبەرانە: واتە کۆتا پێغەمبەرە لە پێغەمبەران ﷺ هەروەک دەفەرمووێ: **(أَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّيْنَ لَا نَبِيَ بَعْدِيْ)** البخاري و مسلم.

٢)(المقام المحمود)واتە شەفاعەتی گەورە: هەروەها اللّٰه تعالى دەفەرمووێ: **(عَسَىٰ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا)** الأسراء٧٩،واتە: اللّٰه تعالى دەتگەیەنێتە پلەی شەفاعەتی گەورە.

٣)(محمد) پێغەمبەری ئینسان و جنۆکەیە ﷺ: هەروەک اللّٰه تعالى دەفەرمووێ: **(قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا)** الاعراف١٥٨،واتە: (ئەی پێغەمبەر)بڵێ:ئەی خەڵکینە(چ ئینسان چ جنۆکە)من نێراوی اللّٰه م بۆ هەمووتان.هەروەها دەفەرمووێ: **(وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُواۖ فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ)** الاحقاف٢٩،واتە: چەند کەسێک لە جنۆکە کە گوێیان گرت لەم قورئانە کە تۆ دەتخوێندەوە بەڵام کاتێ بەشداریان کرد لە گوێگرتن لەقورئان خوێندنەکە،لە نێو خۆیان بەیەکتریان گوت:گوێ ڕابگرن (بۆ ئەم قورئانە)بەڵام کاتێ کە (پێغەمبەر لە قورئان خوێندنەکە) بۆوە جنۆکەکان یەکسەر بۆ ترساندن چوونەوە،گەلەکەی خۆیان پێ ترساندن.

٤)یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ بریتیە لە قورئان:

ئەم قورئانە پڕیەتی لە ئەعجازی دەستەوسانکەر بەجۆرێ تا ئێستا هیچ کتێبە ئاسمانییەکان بەم جۆرە نەبووە، بەڵکو قورئان بەجۆرێکە لە هەرچەند زانیاری پێش کەوێ لە سنووری ئەم قورئانە دەرناچێ، پڕیەتی لە ڕەوانبێژی (البلاغة)و ئەعجاز و ئەندازەگیری و ....هتد.

٥)ئیسرا و میعراج(شەوڕۆیی و بەرز بوونەوە):

ئەمەیان جۆرە ڕۆشتنێکە کە غەیری پێغەمبەری ئیسلام ﷺ هیچ کەسی تر ئەمەی پێ نەسپێردراوە.

٦) شەریعەتی پێغەمبەر ﷺ: اللّٰه تعالى هەندێک ئەحکامی داناوە تایبەتە بە پێغەمبەری ئیسلام، غەیری ئەو هیچ کەسی تر ئەم حوکمەی بۆ نەدراوە...بۆ نموونە:

هەندێ شت لەسەر پێغەمبەر ﷺ فەرزە لەسەر کەسی تر فەرز نییە وەکو:

أ)هەڵسانی شەو نوێژ: لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ بە فەرز دانراوە کە هەموو شەو دەبێ شەو نوێژ بکات، هەروەک اللّٰه تعالى دەفەرمووێ: **(يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا)** المزمل١-٢.واتە: ئەی ئەو کەسەی خۆت داپۆشیوە بە شەوان نوێژ بکە کەمێک نەبێ.

ب) زەکات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرز نەکراوە و ناکرێ وەریشی بەدەگرت.

ج) بۆ پێغەمبەر ﷺ دروست بوو کە (٤) ژن زیاتر بێنێ بەڵام بۆ خەڵکی تر لە(٤)ژن زیاتر حەرامە.

د)ئەگەر ژنێکی خۆی تەڵاق بدا بوایە، نەدەبوو کەسی تر مارەی بکاتەوە.

٧)ڕێز لێ گرتنی: هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَ اتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ ۙ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)**الاعراف١٥٧،واتە: ئینجا ئەوانەی کە بڕوایان (بە پێغەمبەر)هێنابێ و بەڕێز و گەورەیان گرتبێ و یارمەتی و کۆمەکیان کردبێ، ئینجا دوای ئەو نور (قورئان)ە کەوتن کە هێنراوەتە خوارەوە لەگەڵ ڕەوانە کردنەکەی دا، ئەوا ئەو کەسانە گەیشتوون بە ئامانج.

٨)کردنە حاکم و ڕازی بوون بە حوکمەکەی:

اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ..)**النساء٦٥، واتە: سوێند بە اللَّه ی تۆ (ئەی پێغەمبەر) باوەڕیان نییە ئەو کەسانەی تۆ نەکرنر حاکم و لەهەر کێشەیەک کەلە نێوانیان دا هەیە.

**پرسیار:** ئایا پێغەمبەر ﷺ هیچ کات هەڵەی کردووە؟

**وەڵام:** هەندێک لەزانایان دەڵێن پێغەمبەر ﷺ هەڵەی کردووە بەڵام لەدوای اللَّه بەهەڵە دانەنراوە، بۆ نموونە:

١-پێغەمبەر ﷺ لەبواری ڕاگەیاندنی قورئاندا بەهیچ جۆرێک هەڵەی نەکردووە، چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتێک کە شەریعەتی بەخەڵکی ڕادەگەیاند لەخۆوە قسەی نەدەکرد، هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ)**النجم٣-٤.واتە: پێغەمبەر ﷺ لە هەواو هەوەسی خۆی قسە ناکات،بەڵکو ئەوەی کە دەیڵێ وەحییە.

٢)کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ بە (اجتهاد)قسە دەکات لەوانەیە هەڵەی تیا بکات، بەڵام ئەم هەڵەیە لەلای اللَّه بە گوناهـ دانانرێ، هەروەک پێغەمبەر ﷺ لەشەڕی(بەدر)لە ئاست(دیل)ەکان(اجتهاد)ی بەهەڵەدا چوو بەرەڵای کردن...ڕاستیەکەی دەبوایە بیکوشتبان.

٣)هەمیشە پێغەمبەر ﷺ گەر دوو کاری لەپێش بوایە،کامیان چاکتر با ئەوی هەڵدەبژارد، هەروەک کاتی خۆی ڕێی بە دووڕووەکان دا کەوا بۆ جیهاد دەرنەچن لەگەڵ بڕواداران ...

بەڵام اللَّه تعالی دوای ئەوە فەرمووی: **(عَفَا اللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ)**التوبة٤٣، واتە: اللَّه تعال لێت ببورێ (ئەی محمد)ئەوە بۆچی ئیزنت دان(تەنها بە چەند عوزرێک کە نەیەنە جیهاد) تاوەکو بۆت ڕوون دەبۆوە کەوا ڕاست دەکەن کە عوزری شەرعییان هەیە یان درۆ دەکەن؟

٤)بەڵام لەکاتی بەڕێوەبردن و جەنگ و پێک دادان دا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەموو هاوەڵانی دەوەستا و وەک ئەوان ڕای خۆی دەردەبڕی، هەندێ جارانیش لەوانەیە ڕاکەی هەڵە بووایە، هەروەک لەشەڕی (بدر) ڕای (حباب کوڕی منذر)ی پێ چاک بوو بۆیە لەڕاکەی خۆی پاشگەز بۆوە.

٥)هەروەها لەڕووی کاروباری دونیاوە دیسان پێغەمبەر ﷺ هەندێ جاران ڕاکەی بە هەڵە دادەچوو، هەروەک کاتی خۆی نەیهێشت کۆمەڵێک لە هاوەڵەکانی موتوربەی دارخورماکانیان بکەن، کە گوایە ئەگەر موتوربەشی نەکەن هەر بەردەگرێ بەڵام کاتێ کە بەگوێی ئەویان کرد بۆ ساڵی داهاتوو هیچ بەری نەگرت، بۆیە فەرمووی: **(أنتم أعلم بأمر دنياكم)**رواه مسلم عن أنس،واتە: ئێوە باشتر کاروباری دونیای خۆتان دەزانن.

**پرسیار:** بەرز بوونەوە و شەوڕۆیی(الاسراء والمعراج)چی بوو؟

وەڵام: پێغەمبەر ﷺ بەسواری(براق)شەوڕۆیی کرد لە(مەککە)ی پیرۆزەوە تا گەیشتە(المسجد الأقصی) لە فەلەستین، ئینجا لەوێوە سەرکەوت بۆ ئاسمانەکان و لە ئاسمانی حەوتەم (بیت المعمور)ی بینی، ئینجا بۆ(صدرة المنتهی) بەرز کراوە، ئینجا بەخزمەت اللّٰه تعالی شاد بوو، ئینجا هەر لەو شەوەدا گەڕاوە بۆ(مکة)، ئەم ڕووداوە گرنگە بە لاشە و بە گیانی پێغەمبەر ﷺ بوو، لە شەوی(٢٧)ی ڕەجەب، واتە: ساڵ و نیوێک پێش کۆچ کردن بۆ مەدینە، شایەنی باسە هەر لەم گەشتە ئاسمانیە بوو کەوا(٥)فەرزەی نوێژ فەرز کرا.

**پرسیار:** چۆن دەڕوانیتە پێغەمبەر ﷺ ؟

وەڵام: ئێمە لەڕێگەی قورئان و ئاکار و ڕەوشتە جوانەکانی خۆی، پێغەمبەر ﷺ هەڵدەسەنگێنین و جگە لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ و خاتەمی پێغەمبەران و پێشەوای گەلانە، لە هەمان کات ئەمانە و چەندین کاری تر هەن بەڵگە نین لەسەر ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ جۆرە دروستکراوێکی تر بێ کە ڕیزپەڕ(شاذ) لەگەڵ ئینسانەکانی تر وێڕای ئەوانەی کە باس کران دەتوانین بڵێین:

١)پێغەمبەری خوا ﷺ لە جوغزی بەشەر دەرنەچووە، هەروەک اللّٰه تعالی دەفەرمووێ: **(قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ)**الكهف.١١٠،واتە: پێیان بڵێ: من ئینسانێکم وەکو ئێوە تەنها وەحی نەبێ کەتەنها بۆ من دێتە خوارەوە (بۆ ئێوە نایەت).

٢) پێغەمبەر ﷺ شارەزای غەیب نەبووە، هەروەک اللّٰه تعالی دەفەرمووێ: **(وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَا إِلَّا هُوَ)**الانعام٥٩، واتە: کیلی غەیب لەلای اللّٰه تعالی یە،غەیری اللّٰه تعالی هیچ کەس غەیب نازانێ.

٣)پێغەمبەری خوا ﷺ سوود و زیانی بەدەست نییە، هەروەک اللّٰه تعالی دەفەرمووێ: **(قُلْ إِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا)**الجن٢١، واتە: بڵێ من هیچ سوود و زیانێکم بۆ ئێوە بەدەست نییە،هەروەها دەفەرمووێ: **(قُل لَّا أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ)**الاعراف١٨٨، واتە: بڵێ من هیچ شتێکم لە سوود و زیان بۆخۆم بە دەست نییە،تەنها ئەوە نەبێ کە اللّٰه دەیەوێ.

٤)نابێ پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوەی پێغەمبەرە بپەرسترێ، یان بەجۆرێک بەرزکرێتەوە کەلە سنووری ئینسانی دەرچووبێ،هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(لا تُطرُني كَمَا أطرَتِ النَّصارَى ابْنَ مَرْيَمَ انَّمَا أنا عَبْدٌ،فَقولوُا عَبْدوُا لِله ورسولُهُ)**رواه البخاري، واتە: وام بەرز مەکەنەوە، هەروەک دیانەکان لەکاتی خۆی (عیسی) کوڕی (مریم)یان بەرز کردەوە، بەڵکو من بەندەم،ئێوەش بڵێن بەندەی اللّٰه و نێرراوی اللّٰه.

٥)پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو باقی ئینسانەکانی پێشوو(ملک الموت)گیانی کێشاوە و وەفاتی کردووە، هەروەک اللّٰه تعالی دەفەرمووێ: **(إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ)**الزمر.٣٠،واتە: تۆ دەمری و ئەوانیش دەمرن.

**پرسیار:** هەڵوێستمان دەبێ چۆن بێ دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ؟

**وەڵام:** ئەهلی سوننە و جەماعەت گشتیان لەسەر ئەوەن کەنابێ بوغز و کینە و دوژمنایەتی و تیر و توانج هاویشتن و جوێن دان و نەفرەت کردنمان هەبێ بەرامبەر هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ دەبێ خۆشمان بوێن و دوعای خێریان بۆ بکەین اللّٰه تعالی پاشان پێغەمبەر ﷺ هەوڵوێستیان چۆن بووە بەرامبەریان ئێمەش هەمان هەڵوێستمان هەبێ، هەروەک اللّٰه تعالی لەپێشدا هەڵوێستی بڕواداری ڕاستەقینە دەردەبڕێ بەرامبەر بەم هاوەڵە بەڕێزانە، وەکو الله تعالى دەفەرمووێ: **(وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ....)** الحشر،١٠،واتە: ئەو بڕوادارانەی کەلە دوای هاوەڵانی پێغەمبەرەوە دێن دوعا دەکەن و دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان لە گوناهەکانی ئێمە و ئەو برا موسڵمانانەی لە باوەڕ پێش ئێمە کەوتوون خۆش بە. هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە کەوا کاتی خۆی کێشەیەک کەوتە نێوان (خالیدی کوڕی وەلید)و(عبدالرحمن-ی کوڕی عەوف)، (خالید)جوێنیدا بە (عبدالرحمن) پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: **(لا تسبوا أحدًا من أصحابي، فإن أحدَكم لو أنفق مثل أحدٍ ذهبًا ما أدرك مُدَّ أحدِهم ولا نَصِيفَهُ)** رواه البخاري و مسلم،واتە: جنێو بەهیچ صەحابەیەکی من مەدەن،چونکە گەر هەریەکێکتان بە وێنەی کێوی( أحد)زێر ببەخشێ،هێشتا ناگاتە خێری مشتێکی ئەوان و نیو مشتی ئەوانیش.

**پرسیار:** ئایا کەرامات چییە؟

**وەڵام:** بریتیە لە ڕێز لێنانی اللّٰه تعالی لە بەندە ساڵحەکانی خۆی،بەوەی کە هەندێ شتیان لەسەر دەستا ڕوودەدات ڕاست دەردەچێت،گەورەترین کەرامەتیش کە مەرجیشە بۆ(بوون بە دۆستی اللّٰه)بریتیە لە جەخت (استقامة)بوون لەسەر شەریعەت، بەڵام بە مەرجیش نەزانراوە کەوا ئەگەر کەسێک(ولي) بوو کاری دوور لە عەقڵی ئادەمیزادی لێ بپشکوێتەوە،بەڵام بەمەرج گیراوە کەوا(استقامة)ی هەبێ لەسەر شەریعەت.

**پرسیار:** دۆستی اللّٰه(ولي)کێن؟

وەڵام: اللّٰه تعالی دەفەرمووێ: **(أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ)** يونس،٦٢،٦٣، واتە: بێگومان دۆستانی اللّٰه تعالی ئەوانەن کە نەترسیان لەسەرە و نە خەمباریشن، ئەمانەش ئەو کەسانەن کە باوەڕیان بە اللّٰه هێناوە و خۆشیان تەسلیمی اللّٰه کردووە.

کەواتە دەتوانین بڵێین: دۆستانی اللّٰه تعالی، ئەو کەسانەن کەوا (بڕوادار و خۆپارێز لە گوناهـ و موسڵمان)ن.

**پرسیار:** باوەڕ بە ڕۆژی دوایی یانی چی؟

**وەڵام:** واته باوەڕ بە هەموو ئەو هەواڵانەی کە اللَّه تعالی لەڕێگەی کتێبی خۆی دەربارەی ڕۆژی دوایی باسی کردوون، وە ئەو هەواڵانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی فەرموویەتی، هەروەها باوەڕ هێنان بەو کارەساتانەی کەلە دوای مردنەوە دێن، کە بریتین لە زیندوو بوونەوە و حەشرکردن و کتێب وەرگرتنەوە و حسێب لەگەڵ خەڵکی کردن و تەرازوو و حەوزی کەوسەر و پردی دۆزەخ و شەفاعەت و بەهەشت و ئاگر...هتد.

**پرسیار:** بەڵگە لەسەر بوونی ڕۆژی دوایی چییە؟

**وەڵام:** بە دوو جۆر بەڵگە، کە یەکیان(نقلي)و ئەوی تریان (عقلي)یە...

بەڵگە (نقلي)یەکان:

بریتین لە هەموو ئەو ئایەتانەی کە اللَّه تعالی دەربارەی ڕۆژی دوایی فەرموویەتی،بۆ نموونە دەفەرمووێ:

١- **(زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ۚ وَذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ)** التغابن٧ واته: ئایا بێ بڕواکان وا گومان دەبەن ک زیندوو نەکرێنەوە دوای مردن؟بەڵێ سوێند بە پەروەردگارم بێ گومان زیندوو دەکرێنەوە،پاشان هەواڵی کردارەکانی پێشووتان پێ دەدرێتەوە،ئەمەش لەلای اللَّه کارێکی ئاسانە.

٢-**(وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ الصَّاعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ثُمَّ بَعَثْنَاكُم مِّن بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ)** البقرة٥٦.٥٥. واته:بێ بڕواکان گوتیان بە (موسی)باوەڕت پێ ناهێنین تا بە ئاشکرایی اللَّه نەبینین،ئینجا اللَّه تعالی دایگرتن بە هەورە تریشقەیەکی تووند(تا گشتیان مردن)ئێوەش ئەوانتان دەبینی،ئینجا لەدوای ئەوە زیندووی کردنەوە لەدوای مردنەکەتان تاوەکو سوپاسی اللَّه بکەن.

بەڵگە ژیری(عقلي)یەکان:

٣) **(وَمِنْ آيَاتِهِ أَنَّكَ تَرَى الْأَرْضَ خَاشِعَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ الَّذِي أَحْيَاهَا لَمُحْيِي الْمَوْتَىٰ ۚ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)** فصلت٣٩، واته: لە ئایەت و نیشانەکانی اللَّه،تۆ دەبینی کە ئەم زەوییە مات و شل هەڵگەڕاوە، کاتێک لە ئاسمان بارانمان بەسەردا باراند(خاکەکە)جووڵا و هەڵقڵیشا،ئەو کەسەی کە دوای ئەوە زیندووی کردەوە،مردوو زیندوو دەکاتەوە،چونکە اللَّه تعالی بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکا.

هەموو ساڵ ئەم مردن و ژیانە بەسەر ئەم خاکەی لەسەری دەژین دێت هەر ئەم خاکە کاتی وا هەیە هیچ گژو گیایی بەسەرەوە نییە بە مردوو دادەنرێ، بەڵام هەر ئەم خاکە دەبینین گژوگیایەکی لەسەر شین بووە لەو دەمە هەست بەوە دەکەیت کەوا ئەم خاکە گیانی بەبەردا کراوەتەوە خەڵکی دریکەن بەشوێنی گەشت و گوزار و ڕابواردن،مەسەلەی خەوتن و هەڵسانیش بەڵگەیەکی ترە لەم بابەتە.

**پرسیار:** ڕۆژی دوایی لە قورئاندا بە چەند مانا هاتووە؟

**وەڵام:** ڕۆژی دوایی لە قورئاندا بە زۆر مانا هاتووە لەوانە:

١)ڕۆژی زیندوو بوونەوە **(یوم البعث):** لەبەر ئەوەی خەڵک لەم ڕۆژە زیندوو دەکرێنەوە.

٢)ڕۆژی دەرچوون **(یوم الخروج):** لەبەر ئەوەی خەڵکی لەم ڕۆژەدا لەناو گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە.

٣)ڕۆژی بەرنامە **(یوم الدین):** چونکە لەو ڕۆژە لێ پێچینەوە لەسەر بەرنامەیە و هیچی تر.

٤) ڕۆژی کۆمەڵ بوون بۆ لێپرسینەوە **(یوم الحشر):** چونکە لەم ڕۆژەدا خەڵکی کۆدەکرێنەوە بۆ لێ پێچینەوە .

٥) ڕۆژی جیاکردنەوە **(یوم الفصل):** چونکە لەم ڕۆژەدا خەڵکی بە دادگەری حوکمی دەکرێ و لێک جیا دەکرێنەوە.

٦) ڕۆژی هەڵسانەوە **(یوم القیامة):** لەبەر ئەوەی خەڵکی لەم ڕۆژەدا هەڵدەستنەوە بۆ لێ پێچینەوە.

٧)ڕۆژی لێ پێچینەوە **(یوم الحساب):** چونکە لەم ڕۆژەدا خەڵکی لێیان دەپێچرێتەوە.

٨)ڕۆژی کۆبوونەوە **(یوم الجمع):** چونکە لەم ڕۆژەدا خەڵکی بەیەکەوە بۆ پاداشت و سزا کۆ دەکرێنەوە.

٩)ڕۆژی بەڵێنی سزادان **(یوم الوعید):** چونکە لەم ڕۆژەدا هەموو بەڵێنەکان دێنە دی بۆ سزادانی بێ باوەڕان.

١٠)ڕۆژی داخ و پەژارە **(یوم الحسرة):** چونکە لەم ڕۆژەدا بێ بڕوایان دووچاری خەم و پەژارەیەکی زۆر دەبن.

١١)ڕۆژی نەمری **(یوم الخلود):**چونکە ئەم ڕۆژە ڕۆژێکە مردنی تیا نییە

١٢)ڕۆژی دوایی **(دار الأخرة):** لەبەر ئەوەی لەدوای ژیانی دونیا ژیانێکی تر دێ کە ڕۆژی دواییە.

١٣)ڕۆژی جێگیر بوون **(دار القرار):** چونکە خەڵکی لەم ڕۆژەدا ئۆقرە گر دەبن و جێگیر دەبن هەتا هەتایە.

١٤)خانووی هەتا هەتایی **(دار الخلد):**لەبەر ئەوەی خەڵکی تا هەتا هەتایی تیا دەمێننەوە.

١٥)ڕۆژی ڕوودان **(الو اقعة):** چونکە لەم ڕۆژەدا کارەساتی گەورە ڕوودەدات.

١٦)ڕۆژی وەڕاست گەڕین **(الحاقة):**چونکە لەم ڕۆژەدا هەرچی شتێک کە لە دونیا دەربارەی ڕۆژی دوایی باس کراوە دێتە دی.

١٧)ڕۆژی داچڵەکێنەر**(القارعة):** چونکە لەم ڕۆژەدا خەڵکی دادەچڵەکێن.

١٨)ڕۆژی دەورەدان **(الغاشیة):**چونکە لەم ڕۆژەدا بێ بڕوایان بە ئاگری دۆزەخ دەور دەدرێن.

١٩)ڕۆژی شریخە **(الطامة):**چونکە لەم ڕۆژەدا شریخەیەکی گەلێ گەورە هەڵدەستێ.

٢٠)ڕۆژی نزیک **(الأزفة):**چونکە ڕۆژی دوایی نزیکە لە تەمەنی دونیا.

٢١)ڕۆژی زیان باری **(التغابن):**چونکە لەم ڕۆژەدا گەلێ زیانبارە لەسەر بێ بڕوایان.

٢٢)ڕۆژی بانگ ڕاهێشتن **(یوم التناد):** لەبەر ئەوەی لەم ڕۆژەدا زۆر جۆرە بانگ هێشتن دەکرێ، وەکو بانگ هێشتنی خەڵکی لەنێوان خۆیان یان بانگ هێشتنی بەهەشتییەکان بۆ دۆزەخییەکان یان بە پێچەوانەوە...هتد.

٢٣)ڕۆژی گەیشتنەوەیەک **(یوم التلاق):**چونکە لەم ڕۆژەدا هەمو خەڵک لە گۆڕەپانی مەحشەر دەگەنەوە یەک.

**پرسیار:** ئایا گیان(روح)و نەفس یەک شتن، یان دووشتی لێک جیان؟

**وەڵام:** زانایان بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ڕای جیاجیایان هەیە، هەندێک دەڵێن: دووشتی لێک جیان، هەندێکیش دەڵێن: دووڕووی یەک هەقیقەتن.

گیان و نەفس بەچەند مانایەکەوە هاتوون، هەندێک جاریش بەیەک ماناوە هاتوون، بۆ نموونە: **(أخرجوا أنفسكم)** لێرەدا (نفس) بەمانای گیان دێ.

**(فسلموا على آنفسكم)** لێرەدا (نفس)بەمانای خود(ذات)ی نەفسەکەوە دێت.

**(مالهُ نفسُ سائِلهُ، وَما لَيسَ لَه نفسُ سائِلهُ):** لێرەشدا بەمانای خوێن(الدم)ەوە هاتووە.

(ابن تيمية) ڕەحمەتی اللّه تعالی لێ بێ دەڵێ: سێ جۆر نەفس هەن کە بریتین لە:

یەکەم: نەفسی فەرمانکەر بە خراپە **(النَفْسَ الأمارةَ بالسُوءِ):**هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ)**یوسف٥٣، واتە: نەفسی ئینسان فەرمانی کاری خراپ بە ئینسان دەکات.

دووەم: نەفسی سەرکۆنەکەر **(النفس الوامة):** ئەویش ئەو نەفسەیە کە تاوان دەکات و پاشان پەشیمان دەبێتەوە، واتە: ئەگەر ئەم نەفسە کارێکی خراپی کرد پەشیمان بێتەوە، ئەو دەمە بەو نەفسە دەڵێن نەفسی لۆمەکار(لوامة).

هەروەک اللّه تعالی ئەم جۆرە نەفسەی لە قورئان ناو بردووە و دەفەرمووێ: **(وَلَا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ)** القيامة٢، واتە: سوێند ئەخۆم بە نەفسێک کە سەرکۆنەکەر بێ...

سێیەم: نەفسی ئاسوودە **(النفس المطمئنة):** ئەمەش ئەو نەفسەیە کە وا ئارەزووی لە خێر و چاکەیە، هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ارْجِعِي إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً)**الفجر٢٨،٢٧، واتە: ئەی نەفسی بە ئارام بگەڕێوە بۆلای پەروەردگاری خۆت بەڕەزامەندی و ڕازی لێ بوویی.

بەهەمان شێوە گیان(روح)یش چەند مانایەک دەگرێتە خۆ،بۆ نموونە:

بەمانای قورئان دێت هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا)**الشورى٥٢ واتە: بەم شێوەیە ئێمە قورئانمان لەلای خۆمانەوە بۆ تۆ ناردووە.

بەمانای (جبريل)دێت، هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم...)**القدر٤، واتە: فریشتەکان، جبریلیشیان لەگەڵ دایە بەفەرمانی اللّه تعالی لەشەوی بەڕێز(ليلة القدر)دێنە خوارێ.

بەمانای سروش(وحی)دێت، هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ)** غافر١٥ واتە: لەلای خۆیەوە سروش بۆ بەندەیەک دەنێرێ کە بیەوێ.

**پرسیار:** گیان(روح)چییه؟

وەڵام: (شیخ الاسلام ابن تیمیة) ڕەحمەتی اللَّه تعالی لێ بێ دەڵێ: (گیان) شتێکی غەیبە و پەیوەستە بەلەشەوە، بەڵام نە بۆخۆی بریتیە لە لەش وە نەبەشێکیشە لە لەش.

هەروەها ئیمامی (أحمد) ڕەحمەتی اللَّه تعالی لێ بێ دەڵێ: (گیان) لە هیچ شتێک پێک نەهاتووە و نە ڕەنگی هەیە و نە بۆنی هەیە و نازانرێ لە کێوەی لەش ئۆقرەی گرتووە...

بۆیە اللَّه تعالی بۆ وەڵامی ئەو کەسانەی کە دەڵێن(گیان)لە کوێیە، دەفەرمووێ: **(وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِرَبِّي)**الاسراء٨٥، واتە: دەربارەی گیان پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ(نهێنی)گیان لەلای پەروەردگارە...

**پرسیار:** ژیانی ئادەمیزاد دەکرێت بە چەند بەش؟

**وەڵام:** دەکرێت بە دوو بەش:

١)ژیانێکی کورت لە ماڵی کۆشش کە دونیایە.

٢)ژیانێکی نەمری لە ماڵی پاداشت کە ڕۆژی دواییە.

ماڵی کۆشش(دار العمل): ئەو زەوییەیە کەوا لەسەری دەژین بۆ کاتێکی دیاری کراو.

ماڵی پاداشت وەرگرتن (دار الجزاء): ئەو ماڵەیە کە ئادەمیزاد بەرهەمی کارەکانی خۆی تیا دەدورێتەوە پاداشتی کردەوەکانی لێ دەدرێتەوە، لە ڕێگەی (مردن)یش ئادەمیزاد لەماڵی کۆشش بۆ ماڵی پاداشت دەکەوێتە ڕێ.

**پرسیار:** مردن چییە؟

وەڵام: ئادەمیزاد پێک هاتووە لە گیان(روح)و لاشە(جسد) کاتێک کە گیان لەلاشە جیا بۆوە بەم کارە دەڵێن مردن، بە مانایەکی تر(مردن)بریتیە لە گواستنەوەی ئادەمیزاد لە ماڵێکی کاتی کە دونیایە، بۆ حاڵێکی هەمیشەیی کە ڕۆژی دواییە، هەموو کەسێکیش دەبێ تاڵاوی ئەم مردنە بچێژێ، هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ)**العنكبوت٥٧، واتە: هەموو نەفسێک دەبێ(تاڵاوی)مردن بچێژێ.

**پرسیار:** کێ لێپرسراوی گیان کێشانە؟

**وەڵام:** یەک لە فریشتەکانی اللَّه کە ناوی (ملک الموت)ە، هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(قُلْ يَتَوَفَّاكُم مَّلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ)**السجدة١١، واتە: بڵێ فریشتەی گیان کێشان دەتانمرێنێ، ئەو فریشتەیەی کە تایبەتە بۆ گیان کێشانتان،پاشان بۆلای پەروەردگارتان دەگەڕێنەوە.

**پرسیار:** چۆن(ملک الموت)پێ ڕادەگات و دەتوانێ کە هەندێک کەس لە ڕۆژئاوا و هەندێکیش لە ڕۆژهەڵات گیان بکێشێ؟

**وەڵام:** دەسەڵاتی(ملک الموت)وەکو دەسەڵاتی ئێمە نییە، بەڵکو اللّه تعالی دەسەڵاتێکی چاکی داوەتێ، بەجۆرێک زەوی لەنێو مشتی (ملک والموت)وەکو دەنکە خورمایەکە لەنێو چنگی ئادەمیزاد سەرباری ئەمانەش (ملک الموت) بەتەنها بۆخۆی گیانی خەڵکی ناکێشێ بەڵکو چەندین فریشتەی تریشی لەگەڵن.

**پرسیار:** ئێمە بۆچی دەمرین؟

**وەڵام:** بۆیە دەمرین بۆ ئەوەی بەرووبوومی کارەکانمان بدورینەوە کە لە دونیا کردوومانە و ئەویش لەدوای مردنەوە دێت، هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)**ال عمران١٨٥، واتە: هەموو کەسێک تامی مردن دەچێژێ، بەم شێوەیە ئێوە پاداشتی خۆتان لەڕۆژی دوایی پێ ئەدرێتەوە...

**پرسیار:** ئایا کەس لە مردن دەربازی دەبێ؟

**وەڵام:** هیچ کەس نییە بتوانێ لەبەر مردن ڕابکات، هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ...)**الجمعة٨، واتە: بلێ ئەو مردنەی لەبەری ڕادەکەن پێتان دەگات...

**پرسیار:** حاڵی بڕواداران لەکاتی گیان کێشان و مردن چۆنە؟

**وەڵام:** حاڵی بڕوادار و بێ بڕوا لەم کاتەدا زۆر جیاوازی هەیە، بۆ نموونە:

حاڵی بڕواداران:

اللّه تعالی لە ئاقار ئەوان دەفەرمووێ: **(إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ.نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ)**فصلت٣٠،٣١، واتە: ئەو کەسانەی دەڵێن اللّه پەروەردگاری ئێمەیە و پاشان لەسەر ئەم بڕوایە جێگیر دەبن، (لە حاڵەتی گیان کێشان دا)فریشتەی گیان کێشان دێتە لایان و پێیان دەڵێن نەترسن و خەمبار مەبن،مژدەتان لێ بێ بەبەهەشت کە پەیمانتان پێدراوە،ئێمە دۆستی ئێوەین لە ژیانی دونیا و لەژیانی پاشەڕۆژ،بۆ ئێوە هەیە لەهەر شتێک کە دەروونتان دەیخوازێ و هەرشتێکیش کە داوای دەکەن تیایەتی.

**بەڵام حاڵی بێ بڕوایان:**

اللَّه تعالی دەربارەی ئەوان دەفەرمووێ: **(وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا ۙ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ)**الانفال.٥٠، واتە: تۆ ئەگەر ئەوت بدیتبایە کاتێ کە فریشتەی گیان کێشان دێن بۆ گیان کێشانی بێ بڕوایان دەیدەن لەپێش و پاشی

ئەم خوانەناسانە، ئینجا پێیان دەڵێن: دەیچێژن سزایەکی سووتێنەر(زۆر سەرسام دەبوویت)...

**پرسیار:** حاڵی شەهید چۆنە لەدوای مردن؟

**وەڵام:** اللَّه تعالی دەربارەی حاڵی شەهید دەفەرمووێ: **(وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا ۚ بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ،فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ)**ال عمران ١٧٠،١٦٩، واتە: وا حسێب مەکەن ئەوانەی لەڕێگای اللَّه کوژراون، مردوون، بەڵکو ئەوانە زیندوون لەلای اللَّه تعالی (ڕۆزی)یان دەدرێتێ زۆر شادومانن بەو شتانەی کە بەفەزڵی اللَّه پێیان دراوە، وە مژدەش دەدەن بەو کەسانەی کە هێشتا شەهید نەبوون و نەگەیشتوون بەوانەی پێشوو، بێگومان ئەو شەهیدانە نەترسیان لەسەرە و نە خەمباریشن(واتە: نە خەم لە ڕابردوو دەخۆن و نەترسی داهاتووشیان هەیە).

**پرسیار:** بەرزەخ چییە؟

**وەڵام:** بەرزەخ بریتیە لەو حاڵەتەی کەلەدوای مردن بەسەر ئادەمیزاد دا دێ تا ئەو کاتەی کە ڕۆژی دوای دادێ،لەزمانەوانیش بەمانای(پەردە)دێت، هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(حَتَّىٰ إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّا ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا ۖ وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ)**المؤمنون٩٩-١٠٠، واتە: ئایا کاتێک یەک لە بێ بڕواکان دەمرێ و دەڵێ:ئەی پەروەردگار بمگەڕێنەوە ژیانی دونیا تاوەکو کاری چاک ئەنجام بدەم کەلە کاتی خۆی وازم لێ هێنابوو،(اللَّه ش دەفەرمویێ)وا مەڵێن،بەڵکو ئەوە قسەیەکە هەر بۆخۆی دەیکات، لەدوای ئەوە پەردەیەک هەیە تا ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێتەوە...

کەواتە: بەپێی ئەم ئایەتە گۆڕ دەبێتە بەشێک لە ژیانی بەرزەخی.

**پرسیار:** شوێنی جێگیر بوونی گیان(روح)ەکان لەژیانی بەرزەخ(لەگۆڕ)لە کوێیە؟

**وەڵام:** هەندێک گیان لەبەرزترین شوێنایە کە ئەویش گیانی پێغەمبەرانە، وە هەندێک لەدڵی باڵندەیەکی سەوز دایە لە بەهەشت دا هاتووچۆ دەکات بۆ هەر شوێنێک کە خۆی بیەوێ، ئەویش گیانی هەندێک لە شەهیدانە، هەندێک گیان لەبەر دەرگای بەهەشت بەند کراوە، ئەویش گیانی هەندێک لەو شەهیدانەیە کە شەهید بوونە بەڵام قەرزی خەڵکیان لەسەر شان بووە و بەڵام نەیان داوەتەوە،هەندێک(گیان)یش هەن، لە ژێر سێبەری درەختی بێ دڕکایە و یان لەژێر سێبەری دار مۆز و سێبەری دوور و درێژ دایە.

بەڵام گیانی بێ بڕواکان، بەزۆری لەنێو ئاگر و ئاوی لەکوڵ و سێبەری دووکەڵی ڕەش دایە.

**پرسیار:** چ شتێک لەناو گۆڕ ڕوودەدات؟

وەڵام: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(إن العبدَ إذا وُضِعَ في قَبرِه، وتولى عنه أصحابَه، ليسمعُ قَرْعَ نعالِهم,اذَا ولو عَنْهُمْ مُدبرينَ قَالَ:يأتيهِ ملكانِ ، فَيُقعَدانِه فيقول لهُ: ما كنتَ تقولُ في هذا الرجلِ؟قَالَ: فأما المؤمنُ فيقولُ: أشهدُ أنه عبدُ اللهِ ورسولُه، قلاَ:فَيُقالُ له: انظرْ إلى مقعدِكَ من النارِ، قد أبدلك اللهُ به مقعدًا من الجنةِ، قالَ النبيﷺ:فيراهما جميعًا، قال قَتادَةُ وذكر لنا: أنه يُفْسحُ لَهُ في قبرِه سبعونَ ذِراعاً ويُملأُ عَليهِ خُضراً الى يومِ يُبعثون، وأما المنافقُ والكافرُ فَيُقالُ له: ما كنتَ تقولُ في هذا الرجلِ؟ فيقولُ: كنتُ أقولُ ما يقولُ الناسُ، فَيُقالُ: لا دَريتَ ولا تَليتَ، ويُضْرَبُ بِمَطارِقَ من حديدٍ ضربةً، فيصيحُ صيحةً، يَسمعُها من يليه غيرَ الثقلين)**متف عليه واتە: کاتێ کە بەندەی اللَّه دەخرێتە ناو گۆڕ هاوڕێکانی جێی دەهێڵن، لەو دەمە مردووەکە گوێی لە چرپەی(سۆڵ)نەعلەکان دەبێ،کە دەڕۆن ئینجا دوو فریشتە(ملائکة)دێنە لای و کە ناویان (نکیر و منکر)ە دادەنیشن و پێی دەڵێن:تۆ چی دەڵێیت بەرامبەر ئەم پیاوە واتە: محمد ﷺ ئەگەر مردووەکە بڕوادار بێ دەڵێ: شایەدی دەدەم کە ئەم پیاوە بەندەی اللَّه و نێردراوی اللَّه یە، ئینجا پێی دەڵێن بڕۆ سەیری شوێنی خۆت بکە لە ئاگر بەڵام اللَّه تعالى گۆڕیتیەوە بە بەهەشت.

(قتادة)دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بۆمانی ڕوون کردەوە کە ناو گۆڕەکە(٧٠)باڵ فراوان دەبێت و پڕ دەبێت لە گوڵ و گوڵزاری بەهەشت تا ئەو ڕۆژەی کە زیندوو دەکرێنەوە.

بەڵام پیاوی دووڕوو بێ بڕوا، پێی دەڵێن: چی دەڵێیت دەربارەی ئەم پیاوە (محمد ﷺ)؟وەڵام دەداتەوە و دەڵێ:خەڵکی چییان دەوت منیش ئەوە دەڵێم،ئینجا پێی دەڵێن: نەزانیت وەڵام بدەیتەوە نەکاتی خۆی شتێکت دەربارەی خوێندووە،ئینجا بە(تۆپز)ێکی ئاسن و زۆر بە توندی دەیکێشن بەسەریا، ئەویش لەداخا هاوارێکی وای لێ هەڵدەسێ هەموو گیانلەبەرێک گوێی لەدەنگی دەبێ تەنها ئادەمیزاد و جنۆکە نەبێ.

**پرسیار:** بەڵگەت چییە لەسەر سزای نێو گۆڕ؟

**وەڵام:** اللّٰە تعالی دەربارەی فیرعەون و دارو دەستەکەی دەفەرمووێ: **(النَّارُيُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ)**غافر٤٦، واتە: ئاگر بەردەوام بەیانیان و ئێواران ڕووبەڕوویان دەبێتەوە،لە ڕۆژی دوایش دارودەستەکەی فیرعەون بخەنە ناو سەخترین سزاوە.

یان: **(مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى قَبْرَيْنِ، فَقَالَ (إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لاَ يَسْتَتِرُ مِنَ الْبَوْلِ، وَأَمَّا الآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ)**متفق عليه، واتە: پێغەمبەری ئازیز ﷺ ڕۆژێک بەلای دوو گۆڕدا ڕەت بوو فەرمووی ئێستا ئەوانە سزا دەدرێن،سزاکەشیان لەسەر گوناهی گەورە نییە،ئینجا فەرمووی:بەڵێ،یەک لەوانە خۆی پاک ناکاتەوە لە میز، ئەوی تریش قسە دێنێ و دەبا.

**پرسیار:** ڕۆژی دوایی کەی دێت؟

**وەڵام:** هیچ کەس نازانێ کەی ڕۆژی دوایی دێت،هەروەک اللّٰە تعالی دەفەرمووێ: **(يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا فِيمَ أَنْتَ مِنْ ذِكْرَاهَا إِلَى رَبِّكَ مُنْتَهَاهَا)**النازعات٤٢-٤٣،واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆژی دوایی کەوا کەی دادێت، تۆ چیت داوە لەڕۆژی دوایی،بەڵکو زانینی ئەم ڕۆژە بۆ پەروەردگارت دەمێنێ.

**پرسیار:** نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی چین؟

**وەڵام:** نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی دوو جۆرن:

**یەکەم: نیشانە بچووکەکان:**

زۆربەی نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی دوایی بەسەر براون هی واش هەیە لەمەو دوادێت نیشانەکان بریتین لە:

١)هاتنی پێغەمبەر ﷺ کەدوا پێغەمبەر ﷺ بوو.

٢)بەزایە چوونی ڕاسپاردە.

٣)بڵاوبوونەوەی داوێن پیسی و ئارەق خواردنەوە و تاوانکاری و زۆربوونی ئافرەت و کەم بوونی پیاو.

٤)بەرپا بوونی ئاژاوە و دەردەسەری بۆ موسڵمانان و زۆر بوونی پارە و دارایی و زۆر مردن بە بوومەلەرزە و نەخۆشی و سپڵەیی بەرامبەر دایک و باوک و دەنگ هەڵبڕین بەسەریاندا و نەچوون بۆ مزگەوت و ...هتد.

٥)بڵاو بوونەوەی پیاو و کوڕی و قرچۆکی و ...

٦)کاری دونیا دەکەوێتە بەر دەستی ئافرەت و کاربەدەستان خراپترین کەس دەبن و ڕاستگۆ بە درۆزن و درۆزن بە ڕاستگۆ سەیر دەکرێت...هتد

## دووەم: نیشانە گەورەکان:

١)دووکەڵێکی ڕەش دەکەوێتە سەر زەوی لە کونە لووت و چاو و گوێ و دەمی بێ بڕواکان دەردەچێت.

٢)هاتنی(دجال)کە پیاوێکی جولەکەی یەک چاوە و لەنێو چاوانی نوسراوە(کافر)،(٤٠)ڕۆژ دەمێنێتەوە،لەم ماوەیەدا سەراپای دونیا دەگەڕێ،تەنها(شاری مەککە و مەدینە و قودس)نەبێ.

٣)ئاژەڵێک لەزەوی دێتە دەر قسان دەکات.

٤)ڕۆژ لە ڕۆژئاوا دەردەچێت.

٥)هاتنە خوارەوەی عیسی(علیه السلام)بۆ سەر زەوی.

٦)هاتنی(محمدی مهدی).

٧)ئاگرێک لە چیایەکی(حجاز)هەڵدەستێ ملی حوشترەکان(بصری)ڕووناک دەکاتەوە.

٨)هاتنی(یأجوج و مأجوج)

٩) لێدانی(نفخ الصور)و...هتد

**پرسیار:** (نفخ الصور) چییە؟

**وەڵام:** (نفخ الصور )بریتیە لەم(فوو)یەی (ئیسرافیل)(علیه السلام)بەکەرەنا (صور) ی دا دەکا بۆ وێران بوون و کاول بوونی دونیا...

**پرسیار:** چۆن دونیا وێران دەبێت؟

**وەڵام:** دوای ئەوەی کە بڕواداران لەسەر زەوی نامێنن و دەمرن،سەراپای زەوی دەکەوێتە دەستی بێ بڕواکان و زەوی پڕ دەکەن لە تاوان و سەر پێچی...ئینجا اللَّه تعالی بەڵێنی خۆی دەگەیەنێتە جێ و هەموو بوونەوەر دەهەژێنێ و یەک لەدوای یەک پێویستیەکانی دونیا لەبەیین دەچێ کە بەم جۆرەی خوارەوەیە:

١)زەوی: اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا،وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا)** الزلزلة١-٢، واتە: کاتێ کە زەوی تەکانی پێ کەوت بە تەکانێکی گەورە،ئینجا قورساییەکانی ناو زەوی لەزەوی دەردەچن.

٢)ئاسمان و چیاکان: اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(يَوْمَ تَكُونُ السَّمَاءُ كَالْمُهْلِ،وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ)**المعارج٨-٩، واتە: ئاسمانەکان لەم ڕۆژەدا وەک مس دەتوێنەوە،چیاکانیش وەک خووری لێک هەڵدەوەشێن.

٣)دەریاکان: اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ)**التكوير٦،واتە: کاتێ کە دەریاکان تەقینەوە.

٤)ئەستێرەکان: اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ)**التكوير٢،واتە:کاتێ کە ئەستێرەکان هەڵوەرین.

٥)مانگ و ڕۆژ: اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ)**التكوير١،واتە: کاتێ کە ڕۆژ پێچرایەوە. یان دەفەرمووێ: **(وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ)**القيامة٩، واتە: کاتێ کە ڕۆژ و مانگ پێک دادران.

٦)ئادەمیزاد: اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(يَوْمَ يَكُونُ النَّاسُ كَالْفَرَاشِ الْمَبْثُوثِ)**القارعة٤،واتە: لەو ڕۆژەدا خەڵکی وەکو پەپوولە بەندیادا بڵاو دەبنەوە.

ئەم هەموو کارەساتە گەورەش دوای ئەم(فوو)ەوە دێت کەوا(ئیسرافیل)بە کەڕەنا( صور)ی دا دەکات...

دوای ئەم کارەساتەی کە بەسەر دونیادا دێت خەڵکی حاڵیان زۆر ناخۆش دەبێت، هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ ۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ،يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَىٰ وَمَا هُم بِسُكَارَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ)**الحج١-٢،واتە: ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسن چونکە بومەلەرزەی ڕۆژی دوایی شتێکی گەورەیە،لەم ڕۆژە خەڵکی دەبینرێن کەوا دایکەکان لەبەر کۆرپە شیر خۆرەکانیان ڕادەکەن و ئەو ئافرەتانەش کە مناڵیان لە سکدایە،لەداخی ئەم ڕۆژە مناڵەکان لەسک دەردەچن،خەڵکی دەبینی کە سەرخۆشن،(لە ڕاستیدا)سەرخۆش نین،بەڵام سزای اللَّه زۆر گەورە و ناخۆشە لەم ڕۆژەدا.

**پرسیار:** ڕۆژی حەشر چییە؟

**وەڵام:** ڕۆژێکە خەڵکی لەدوای زیندوو بوونەوە کۆدەکرێنەوە و چاوەڕێی ئەوە دەکەن کە اللَّه تعالى حسێبیان لەگەڵ بکات حاڵی ئەم خەڵکەش لەم ڕۆژەدا وەک حاڵی ئەو ڕۆژەیە کە تیایدا لە دایک بوونە، هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ:(**يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ،قالَ: (يَا عَائِشَةُ، الْأَمْرُأَشَدُّ مِنْ أَنْ يَنْظُرَبَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ)**.مسلم

واتە: خەڵكی كۆ دەكرێنەوە لە ڕۆژی دوایدا گشتیان پێ خواس و ڕووت و قووت و سوونەت نەكراون، (عائشەش) فەرمووی: چۆن تەماشای یەكتر ناكەن؟ئەویش فەرمووی: نا یا عائیشە بەڵكو ڕۆژەكە زۆر لەوە ناخۆشترە كە تەماشای یەكتر بكەن...

لەم ڕۆژەدا بەتەنها ئادەمیزاد خڕ ناكرێتەوە بەڵكو جنۆكە و باڵندە و ئاژەڵیشیان لەگەڵ كۆ دەكرێتەوە، هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: (**وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ**)التكويره،واتە:كاتێ كە ئاژەڵ كۆكرانەوە.

**پرسیار:** چەند جار فوو بە(صور)دا دەكرێت؟

**وەڵام:** هەندێک لە زانایان دەڵێن (٣)جار فوو بە(صور)دا دەكرێت:

یەكەم: اللَّه تعالى دەفەرمووێ: (**فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ نَفْخَةٌ وَاحِدَةٌ،وَحُمِلَتِ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَاحِدَةً،فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ، وَانشَقَّتِ السَّمَاءُ فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ**)الحاقة١٣-١٦،واتە: كاتێ كە یەک فوو بە (صور)دا كرا، زەوی و چیاكان بەرز دەبنەوە و بەیەک دا ئەدرێن بەیەک تەكان زرمەیان لێ هەڵدەستێ پەم ڕۆژە كارەساتی گەورە ڕوودەدات ا ئاسمان لەت و پەت دەبێ سست و بێ كەڵک دەمێنێ.

دووەم: اللَّه تعالى دەفەرمووێ: (**ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ**)الزمر٦٨،واتە: پاشان فووێكی تر بە (صور)دا دەكرێ ئەم جارە تێكڕا خەڵكی لەناو خاكدا هەڵدەستنەوە.

سێیەم: اللَّه تعالى دەفەرمووێ: (**وَنُفِخَ فِي الصُّورِ ذَٰلِكَ يَوْمُ الْوَعِيدِ،وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ**)ق.٢٠-٢١، واتە: كاتێ فوو بە(صور)دا دەكرێ ئەمە ئەو ڕۆژەیە كە لەپێشدا اللَّه پەیمانی بە سزادانی بێ بڕواكان پێ دابوو، ئینجا لەم ڕۆژە تاک تاكی خەڵكی بە خۆ و بە دوو فریشتە یەكیان ڕای دەكێشێ ئەوی تریان شایەدە لەسەر كردەوەكانی.

بەڵام ڕاستر ئەوەیە كە دوو جار فوو بە(صور)دا دەكرێ.

**پرسیار:** (الحساب)چییە و اللَّە تعالی چۆن حسێب لەگەڵ خەڵکەکەدا دەکات؟

**وەڵام:** اللَّە تعالی خاوەنی سیفەتی تێر و تەسەل و شایستەی خۆیەتی،یەک لەسیفەتەکانی(اللَّە)ش بریتیە لە دادپەروەری (العدل)، ئەم ڕۆژەش ڕۆژێکە خەڵکی کردەوەکانی دەهێنرێتەوە پێش چاو و اللَّە تعالی ش بەپێی کردەوەکانی حسێبی لەگەڵ دەکات بێ ئەوەی زوڵمی لێ بکات، هەروەک دەفەرمووێ: **(وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِّمَّا عَمِلُوا)**الاحقاف١٩، واتە: بۆ هەمووان بەپێی کردەوەکان پلەیان پێ ئەدرێت،چۆنیەتی ئەم (حسێب)ەش بەپێی ئەم سورەتەیە کە دەفەرمووێ: **(إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا،وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا،وَقَالَ الْإِنسَانُ مَا لَهَا،يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا، بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا،يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ،فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ،وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ)**الزلزال،واتە: کاتێ زەوی لەرزی بەلەرزینێکی تەواو،هەرچی شتی قورس و گرانی هەیە فرێی دایە دەرەوە،لەم کاتەدا ئادەمیزاد بە سەرسوڕمانەوە دەڵێ ئەوا ئەم زەویە بۆ وای لێهات، ئەمە ڕۆژێکە زەوی هەواڵی خۆی دەگێڕێتەوە و شایەدی لەسەر کردەوەکانی ئادەمیزاد دەدات کە چ شتێکی ئەنجام داوە لەسەر پشتی زەوی،ئەمەش پەروەردگار پێی ڕاگەیاندووە کە کردەوەکانی ئادەمیزاد بگێڕێتەوە،ئەم ڕۆژە ڕۆژێکە خەڵکی پۆل پۆل بەشێواوی دێنەوە بەر دەستی اللَّە تا کردەوەی خۆیان نیشان بدرێ،ئینجا هەرکەسێک بەقەدەر وردیلەیەک چاکەی کردبێ دەی بینێتەوە وە هەروەک بەقەدەر وردیلەیەکیش خراپەی کردبێ دەی بینێتەوە. هەروەها دەفەرمووێ: **(يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ)**النور٢٤،واتە: لەم ڕۆژە (خەڵکی دەمەکانیان دادەخرێن)و زمان و دەست و پێکانیان شایەدیان لەسەر دەدەن بەهۆی ئەو کردەوانەی کە لە دونیا کردویانە.

**پرسیار:** چۆن کردەوەکانی ئادەمیزاد سەرژمێر دەکرێن و لە ڕۆژی دوایی نیشانیان دەدرێتەوە؟

**وەڵام:** ئادەمیزاد لە ژیانیدا دوو فریشتەی لەگەڵدایە تا دەشمرێ لێی جیا نابنەوە،فریشتەکانیش یەکیان کارە چاکەکان دەنووسێ ئەوی تر خراپەکان دەنووسێ...هەروەک اللَّە تعالی دەفەرمووێ: **(مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ)**ق١٨، واتە: هەر وتەیەک لەزار دەربچێ فریشتەکان چاودێرن بەسەریەوە و قسەکە ڕاستەوخۆ تۆمار دەکەن...

دوای ئەوەی کە ئەو کەسە لە ڕۆژی دوایی دێتەوە بەردەستی اللّە تعالی،ئەو دەمە اللَّە کردەوەکانی بەبیر دەهێنێتەوە، هەروەک دەفەرمووێ: **(وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا ۚ وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا)**الكهف٤٩، واتە: لە ڕۆژی دوایی هەرکەس نامەی خۆی پێ دەدرێتەوە،تاوانباران لەم ڕۆژەدا بە ترسێکی زۆرەوە سەیری کردەوە بەدەکانی خۆیان دەکەن و دەڵێن: ئەی خاک بەسەرمان ئەم نامەیە چییە کە کردەوەیەکی بچووک یان گەورەی بەجێ نەهێشتووە و گشتی ژماردوون،ئنجا ئەو کردەوانەی کە لە دونیا کردبوویان دەیان بیننەوە، اللَّە تعالی ش بەهیچ جۆرێک زوڵم لەکەس ناکات.

**پرسیار:** کێ حسێب لەگەڵ ئەم خەڵکە دەکات؟

**وەڵام:** اللَّه تعالی بە گەورەیی خۆی حسێب لەگەڵ ئەم خەڵکە دەکات،هەروەک پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەفەرمووێ: **(مَا مِنْكُمْ مِنْ أحَدٍ ألا سَيُكَلِمُهُ رَبُهُ اليَومَ القيامَةِ،لَيسَتْ،بَينَهُ و بَينَهُ تَرجُمَانُ فَيُنظرُ أيمَنَ مِنهُ،فَلاَ يَرى الاَّ مَا قَدمَ مِنْ عَمَلهِ،و يَنظُرُ أشأمَ مِنْهُ،فَلاَ يَرى الاَّ مَا قَدَمَ،وَ يَنظرُ بَيْنَ يَدَيهِ،فَلاَ يَرى الاَّ النَّارَ تِلقَاءَ وَجْهِهِ،فَاتَقوا النَّارَ وَلَوْ بشَق تَمرَة)** البخاري و مسلم والترمذي،واتە: هیچ کەس نییە لە ئێوە گەر پەروەردگار قسەی لەگەڵ نەکات بەشێوەیەک کە هیچ وەرگێڕێک(ترجمان)ێک لەنێوانیان نییە،تەماشای کای ڕاستی دەکات هەر کردەوەکانی دەبینێ،تەماشای لای چەپی دەکات بەهەمان شێوە کردەوەکانی دەبینێ، تەماشای پێشەوەی خۆی دەکات تەنها ئاگری دۆزەخ دەبینێ کەوا بۆلای دەم و چاوی دێت،کەواتە لە اللَّه بترسن خۆتان لە ئاگر بپارێزن با بەلەتێ خورماش بێت.

**پرسیار:** حیکمەتی ئەم حسێبە چییە؟

**وەڵام:** حیکمەتی ئەم حسێبە دەرخستنی پایەی خواناسانە لەم شوێنە مەترسیدارە و ئاشکرا کردنی کردەوە خراپەکانی بێ بڕوایان و یاخی بوونە، بەتایبەت سەرکردە خوانەناسەکان.

**پرسیار:** پردی(صراط)چییە؟

**وەڵام:** پردێکی درێژە لەسەر پشتی ئاگری دۆزەخ هەموو کەس بەسەریدا ڕەت دەبێ بڕوادار چ بێ بڕوا، بەڵام بڕواداران بەپێی کردەوەکانیان هەندێکیان هەندێکیان وەکو بروسک هەندێکیان وەکو ڕەشەبا هەندێکیان بە غاردان هەندێکیان بەپێیان هەندێکیان بە نەرمی و هەندێکیان بە گاگۆڵان....بەسەریدا ڕەت دەبن، بەڵام بێ بڕواکان ناتوانن بەسەریدا بڕۆن، هەرکە چوونە سەر پردەکە یەکسەر بەردەبنەوە ناو ئاگر. پەنا بە اللَّه تعالی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەم پردە دەفەرمووێ: **(يَضربُ الصّراط بين ظهري جهنّم فأكون أنا وأمّتي أوّل من يجيز، ولا يتكلم يومئذ إلا الرّسل، ودعوى الرّسل يومئذ اللهم سلم سلم،وَفي جَهنم كَلاليبُ مِثلُ شوكِ السَعدان غَيرُ أنَهُ لا يَعلَمُ ما قَدرَ عِضمُها الاَّ اللَّهُ:تخطيفُ النَّاسَ بأعمالِهم)** مسلم،واتە: پردی(صراط)بەسەر پشتی دۆزەخ ڕادەهێنرێ، من و ئومەتەکەم یەکەم چینین بەسەریدا ڕەت دەبین،هیچ کەس لەم ڕۆژە قسان ناکات فریشتەکان نەبێ کە دەڵێن خودایە سەلامەتیان بکە،خودایە سەلامەتیان بکە،ئینجا لەم دۆزەخە دەمە ئاسن (قولاپ)ی دۆزەخی هەن وەکو دڕکی(سەعدان)وایە هەر اللَّه دەزانێ کە ئەم قولاپانە چەند گەورەن، خەڵکی بەپێی کردەوەکانیان دەکەونە بەر چنگی ئەم قولاپانە و تێ فرێدەدرێنە ناو دۆزەخ لە پاش (٧٠) ساڵ ئینجا دەکەونە بنەوەی دۆزەخ.

هەروەها دەفەرمووێ: **(الصِّرَاطُ عَلَى جَهَنَّمَ مِثْلُ حَدِّ السَّيْفِ فَتَمُرُّ الطَّبقة الأُولَى كَالْبَرْق وَالثَّانِيَةُ كَالرِّيح وَالثَّالِثَةُ كَأَجْوَدِ الْخَيْل وَالرَّابِعَةُ كَأَجْوَدِ وَالْبَهَائِم، ثُمَّ يَمُرُّونَ وَالْمَلاَئِكَةُ يَقُولُونَ: اللهُمَ سَلِّمْ سَلِّمْ)**أخرجه أبن جرير،
واتە: پردی سەر دۆزەخ وەکو نوکی شمشێر باریک و تیژە،چینی یەکەم وەکو بروسک پێیدا ڕەت دەبن،چینی دووەم وەکو ڕەشەبا، سێیەم وەکو مایین، چوارەم وەکو گیانەوەر ئینجا ئەوانی تر بەسەریدا ڕەت دەبن و فریشتەکانیش دوعایان بۆ دەکەن و دەڵێن: خودایە سەلامەتیان بکە(خودایە)سەلامەتیان بکە....

**پرسیار:** (الشفاعة) چییە؟

**وەڵام:** (الشفاعة)بریتیە لە دوعایانەی کە اللّٰە تعالى وەرە دەگرێت،ئەویش دەکرێت بەم بەشانەی خوارەوە:

١)شەفاعەتی گەورە: شەفاعەتێکە لە غەیری پێغەمبەری ﷺ هیچ کەسی تر بۆی نییە ئەم شەفاعەتە بکات، ئەم شەفاعەتەش لەو ڕۆژە دەکرێت کەوا خەڵکی(٤٠)ساڵ لە گۆڕەپانی(حشر) دەمێننەوە لە بارودۆخێکی زۆر ناخۆش دادەژین، ڕۆژێکە کە خەڵکی لەخۆیان بێزارن و ئاواتە خوازن اللّٰە تعالى بیان خاتە دۆزەخ بەس بۆ ئەوەی لەم ڕۆژە دەرچن، دەچنە لای هەموو پێغەمبەران بۆ ئەوەی لە اللّٰە تعالى بپاڕێنەوە لەم ڕۆژەیان دەرباز بکەن. بەڵام وەڵامی هەموو پێغەمبەران تەنها(نفسي نفسي)یە، تەنها پێغەمبەری نازدار ﷺ نەبێ کە دەفەرمووێ: (أمتي أمتي)واتە:(ئوممەتی خۆم ئوممەتی خۆم)،پاشان سەر دەخاتە سەر سوژدە، پاش ماوەیەک ئنجا اللّٰە تعالى وەڵامی دەداتەوە، ئینجا پێی دەفەرمووێ: سەرت هەڵبڕە چیت دەوێ تاوەکو بۆت جێ بەجێ بکەم،ئینجا پێغەمبەر ﷺ لەخۆشیا سوپاسێکی هێندە گەورەی اللّٰە تعالى دەکات کە ئەو دەمە اللّٰە دەیهێنێتە سەرزاری و بە اللّٰە تعالى ڕادەگەیەنێ کەلەو ڕۆژەیان ڕزگار بکات و حسێبێکیان لەگەڵ بکات، ئەگەرچی بشیانباتە دۆزەخ، ئینجا اللّٰە تعالى حسێبیان لەگەڵ دەکات.

٢)چەند گەلێک اللّٰە تعالى بەبێ حسێب دەیانخاتە بەهەشت کەخۆی دەدات لە(حەفتا هەزار)کەس هەروەک فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بە ڕیوایەتی(مسلم و البخاري)یەوە هاتووە کەوا ئەمانە لەبەر کەمی تاوانەکانیان حسێبیان لەگەڵ ناکات ئەمەش شەفاعەتێکە کە اللّٰە لەگەڵ ئەم کەسانەدا دەکات.

٣)اللّٰە تعالى موسڵمانە گوناهبارەکان دەخاتە بەر شەفاعەتی خۆی دوای ئەوەی کە لە گوناهەکان دەشۆرێن ئینجا لە دۆزەخ دەریان دەهێنێ و دەیانخاتە بەهەشت.

٤)شەفاعەت کردن بۆ سووک کردنی لەسزا بۆ بەشێک لە بێ باوەڕان، وەکو حاڵی(بو طالب)ی مامی پێغەمبەری ئازیزﷺ کە دوو پشکۆی ئاگری لەژێر پێدا دائەنرێ تاوەکو مێشکی وەکو مەنجەڵ دەبڵقێ، ئەو ئایەتەش کە دەفەرمووێ: **(لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ)**البقرة١٦٢،واتە: سزایان لەسەر سووک ناکرێ و چاوەڕێی دەرباز بوونیشیان لێ ناکرێ،بە نسبەت(أبو طالب)یش ئەو سزایەی باسمان کرد سووکتر ناکرێ.

٥)اللَّه تعالی پلەی بەهەشتیەکان لەبەهەشت زیاد دەکات بەهۆی شەفاعەتەوە پێغەمبەران و شەهیدان و پیاو چاکان بەشدارن لەم شەفاعەتە.

٦)شەفاعەتی قورئان و ڕۆژوو: پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(الصيامُ والقرآنُ يشفعانِ يومَ القيامَةِ)** رواه أبو داود، واتە: لە ڕۆژی دوایی قورئان(بەهۆئقورئان خوێندنی دونیاوە)و ڕۆژوو(بەهۆی ڕۆژوو گرتنی ئەو کەسە لە دونیا)شەفاعەت بۆ خاوەنەکەی لەلای اللَّه تعالی دەکەن.

**پرسیار:** حەوز(الحوض)چییە؟

وەڵام: لە ڕۆژی دوایی هەر پێغەمبەرێک حەوزێکی هەیە، کە خۆیی و ئوممەتەکەی لێی دەخۆنەوە پێش ئەوەی بچنە بەهەشت، هەروەک پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(انَّ لِكُل نَبِي حَوْضاً)**رواه الترمذي،پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ وەک پێغەمبەرانی تر حەوزێکی هەیە پێی دەڵێن: (حەوزی کەوسەر) هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(حوضي ميسرة شهرة مأوه أبيض من اللبن وريحه اطيب من المسك وكيزانه كنجم السماء من شرب منه فيها فلا يظمأ ابدا)**رواه البخارى. واتە:حەوزەکەی من و پان و بەرینی یەک مانگە ڕێ درێژە، ئاوەکەی لە شیر سپی ترە و بۆنەکەشی لە (مسک)خۆشترە، پەرداخی ئاوەکان ژمارەیان بەقەد ئەستێرەکانی ئاسمانە هەرکەسێک لێی بخواتەوە جارێکی تر تینووی نابێتەوە.

**پرسیار:** تەرازوو(الميزان)چییە؟

**وەڵام:** تەرازوویەکە کەوا کردەووی چاک و خراپی پێ هەڵدەسەنگێنرێ،هەرکەس تای تەرازووی چاکەی لەهی خراپەی زیاتر بێ ئەوە بەهەشتی خۆی مسۆگەر دەکات، بەڵام ئەگەر خراپەی زیاتر بێ،ئەوا یەکسەر بەرەو ئاگری دۆزەخ پەلکێش دەکرێ،ئەگەر اللَّه ڕەحمی پێ نەکات (اللَّه پەنامان بات)هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ)**القارعة٦-٩، واتە: ئەو کەسەی کێشی کردەوە چاکەکانی لە تەرازوو قورس بێت ئەوا یەکسەر لە بەهەشت دەخرێتە نێو ژیانێکی خۆشەوە، بەڵام ئەوەی کێشی کردەوە چاکەکانی لە تەرازوو سووک بێت ئەوا یەکسەر دەخرێتە دۆزەخەوە.

**پرسیار:** دەفتەری کردەوەکان(صحف الأعمال)چییە؟

**وەڵام:** اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ كِرَامًا كَاتِبِينَ)**الأنفطار٩-١٠،واتە: چەند فریشتەیەک بەسەر ئێوەدا چاودێرن و کردەوەکان دەنووسن و بەڕێزن،ئینجا هەموو کەس لەڕۆژی دوایی ئەم نوسراوانە وەر دەگرێتەوە، اللَّه تعالی پێیان دەفەرمووێ: **(اقْرَأْ كِتَابَكَ)**الأسراء١٤،واتە: دەفتەری کردەوەکانت بخوێنەوە،جا ئەم خەڵکە لە وەرگرتنەوەی کتێبەکان دوو جۆرن،هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا، وَيَنْقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُورًا وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُورًا وَيَصْلَى سَعِيرًا)**الانشقاق٧-١٢،واتە: هەرکەسێک دەفتەری کردەوەکانی بەدەستی ڕاست بدرێتەوە،ئەوا حسێبێکی گەلێک ئاسانی لەگەڵ دەکرێ و بەدڵ خۆشی دەگەڕێتەوە ناو خێزانەکەی لە بەهەشت،بەڵام هەرکەسێک لە لای پشتیەوە(بەدەستی چەپ)دەفتەری کردەوەکانی بدرێتەوە ئەوا هاواری قوڕ بەسەری و داماوی خۆی دەکا و دەچێتە دۆزەخ.

**پرسیار:** ئەو چوار پرسیارە چین کەلە ڕۆژی دوایی لە خەڵکی دەکرێن؟

**وەڵام:** پێغەمبەر ﷺدەفەرمووێ: **(لَنْ تّزولُ قَدمَ عَبدٍ يَومَ القيامَة حَتى يَسألّ عَنْ أربَعَ خِصالٍ: عَنْ عُمرِه فيمَا أفناهُ، وعَنْ شَبابِهِ فيما أبلاهُ ، وعَنْ مالِهِ مِنْ أينَ اكتَسَبهُ وفيما أنفَقَهُ ، وعَنْ عَلمِهِ ما عَملَ فيهِ)**رواه البرازوالطبراني بأسناد صحيح،واتە:لەڕۆژی دوایی قاچی هیچ بەندەیەک لە مەحاکەمە لاناکەوێت تاوەکو لەبارەی چوار شت پرسیاری لێ دەکرێت:

١-لەبارەی تەمەنی کە ئایا بەچی بەسەر بردووە؟

٢-لابارەی گەنجیەتیەکەی کە ئایا لەچی بەسەر بردووە؟

٣-لەبارەی ماڵەکەی کە ئایا لەکوێ پەیدای کردووە و لەچی خەرج کردووە؟

٤-لەبارەی زانستەکەی،ئایا چی پێ کردووە؟

**پرسیار:** دۆزەخ(جهنم)چییە؟

**وەڵام:** اللّٰه تعالی پاداشتی بڕواداران بداتەوە بە بەهەشت،ئەوا سزای تاوانبار و بێ بڕوایان بە ئاگرێک دەداتەوە کە پێی دەڵێن:ئاگری دۆزەخ(نار جهنم)

کەواتە دۆزەخ ماڵێکی(ئاگر)ینە کەوا بێ بڕوایانی تێدەخرێتە ناو لە تۆڵەی ئەو کردەوە ناپەسەندانەی کەلە دونیا خەریکی بوو ون.

اللّٰه تعالی دەفەرمووێ: **(وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنْسَانُ وَأَنَّى لَهُ الذِّكْرَى)**الفجر٢٢-٢٣،واتە: لە ڕۆژی دوایی اللّٰه تعالی، پاشان فریشتەکان پۆل پۆل دێنە مەیدانی مەحشەر، ئینجا(٤٩٠٠٠٠٠٠٠)چوار هەزار و نۆسەد ملیۆن فریشتە ئاگری دۆزەخ دەهێنن، بەڵام لەم کاتە دۆزەخ زۆر تووڕەیە و لە حەفتا هەزار لاوە فریشتەکان گرتویانە،بەڵام ئەو لەداخی بێ بڕوایان ڕاناوەستێ وهێرشیان بۆ دەبات،هەروەک اللّٰه تعالی دەفەرمووێ: **(تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ)**الملک٨، دۆزەخ لەو ڕۆژەدا لەداخا وەختە پارچە پارچە بێ.

**پرسیار:** ئاگری دۆزەخ چەند ناوی هەیە؟

**وەڵام:** ئاگری دۆزەخ لە قورئان بەزۆر ناو هاتووە،لەوانە:(الهاوية، السعير، لظى، الحطمة).

**پرسیار:** سووتەمەنی دۆزەخ چییە؟

**وەڵام:** سووتەمەنی دۆزەخ بەتەنها بەرد و ئادەمیزادە،هەروەک اللّٰه تعالی دەفەرمووێ: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ....)**التحريم٦،واتە: ئەی بڕوادارینە خۆتان و ماڵ و مناڵتان لە ئاگرێک بپارێزن کە سووتەمەنیەکەی لە بەرد و ئادەمیزاد پێک هاتووە....

زانایان دەڵێن: ئەو بەردە پێی دەڵێن:(بەردی کبریت) کە پێنج خەسڵەتی ناوازە(شاذ)ی تیایە کە ئەمانەن:

١-زوو گڕ دەگرێ.

٢-دووکەڵێکی چڕی هەیە.

٣-بۆنێکی ناخۆشی هەیە.

٤-گەرماییەکی زۆری هەیە.

٥-بەتووندی بە پێستی ئادەمیزادەوە دەنووسێ.

**پرسیار:** ئایا دۆزەخ جێگەی ئەم هەموو خەڵکەی تیا دەبێتەوە؟

وەڵام: بەڵێ بە زیادەوەش جێگەی دەبێتەوە، بەڵگەش هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ)**ق.٣٠، واتە: ئێمە لەو ڕۆژە بە دۆزەخ دەڵێین:ئایا پڕ بوویت؟ئەویش دەڵێ:ئایا زیاتر ماون تا بیانسووتێنم؟ واتە: (هێشتا جێگا لە دۆزەخ دەمێنێ تا پڕ بێ).

**پرسیار:** ئایا خواردن و خواردنەوەیان لە دۆزەخ چییە؟

**وەڵام:** زۆر جۆرە خواردنی ناڕێک و بێزراویان بۆ هەیە لەوانە خواردنی داری(زقوم)، کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: (ئەگەر پەلکە گەڵایەکی ئەم دارە بکەوێتە سەر دونیا هەمووی گڕ دەگرێ) ،اللّه تعالی باسی ئەم درەختە دەکات و دەفەرمووێ: **(أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِّلظَّالِمِينَ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِفَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ)**الصافات٦٢-٦٧، واتە: ئایا بەهەشت چاکترە یان(خواردنی)داری زەقوم کەوا ئێمە بۆ مەینەتی زۆردارانمان ئامادە کردووە،دارێکە لەناخی دۆزەخەوە وەکو سەری شەیتانەکان وایە و دەردەچێ،بێ بڕوایان لەم دارە دەخۆن و سکی خۆیانی لێ پڕ دەکەن،دوای ئەوە لەسەرەوە ئاوێکی کوڵاویان (بەسەردا دەکرێ و پاشان) دەرخواردیان دەدرێ.

خواردنەوەشیان بریتیە لە ئاوێکی کوڵاوو گەرم، هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَإِن يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا)**الكهف٢٩،واتە: ئەگەر داوای ئاویان کرد ئاوێکیان دەدرێتێ وەکو مسی تواوە،یەکسەر دەم و چاویان دەسوتێ و هەڵدەکەنێ، ئەم ئاوەش پیسترین و خراپترین خواردنەوەیە دەرخواردیان دەدرێ.

**پرسیار:** دۆزەخییەکان چ جلێکیان لەبەرە لەم ڕۆژەدا؟

**وەڵام:** دۆزەخییەکان لەم ڕۆژەدا جلێکی ئاگرینیان لەبەر بڕدراوە...هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ وَلَهُم مَّقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ)**الحج١٩-٢٢ واتە: ئەوانەی کە بێ بڕوان جلێکیان لەبەر دەبڕدرێ لە ئاگر، ئینجا لەسەرەوە ئاوێکی کوڵاویان پیا دەکرێ کە پێست و هەرچی شتێک کەلە هەناویان دا هەیە دەقرچێن و دەسووتێن لێک دەپچڕێن،ئینجا کۆتێکی پۆڵاینیان هەیە بۆ لێدانیان هەرکاتێک ویستیان لە ناو ئاگرەکە ڕابکەن یەکسەر دەکەونە ناوی و(پێیان دەڵێن)بچێژن ئازاری سووتێنەر.

**پرسیار:** ئایا کەس لە حەژمەتی ئەم ئاگرە دەمرێ؟
**وەڵام:** لە دۆزەخ خەڵکی لەنێوان مردن و ژیان دان،نە مردنی مردنە و نە ژیانی ژیانە،هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَى)الاعلى١٣**،واتە: پاشان لەم شوێنەدا نە دەمرن و نە دەژین.

**پرسیار:** پاش ئەوەی کەئەم خەڵکە سووتان، چییان دەمێنێ تا بسووتێ؟
و:اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ)النساء٥٦**، واتە: ئەوانەی ک بێ بڕوان بە ئایەتەکانمان،دەیان خەینە ناو ئاگرێک، هەرکاتێک پێستەکانیان سووتێنرا، یەکسەر پێستێکی تریان بۆ دروست دەکەینەوە،بۆ ئەوەی بەردەوام ئەم ئازارە بچێژن... کەواتە، هەر بەشێکی ئەو ئادەمیزادەی دەسووتێت یەکسەر بۆی دروست دەبێتەوە.

**پرسیار:** ئایا بێزاری ئەم خەڵکەی ناو دۆزەخ دەگاتە چ ئاستێک؟
**وەڵام:** خەڵکی لە دۆزەخ هێندە بێزار و ماندوون، ئامادەن هەموو شتێک بکەن بە قوربانی خۆیان، بەس بۆ ئەوەی لە دۆزەخ پێی دەربچن، هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ،وَصَاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ،وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ،وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ،كَلَّا)المعارج١١-١٥**، واتە: تاوانبار، لەم ڕۆژە پێی خۆشە کوڕەکەی و خێزانەکەی و براکەی و عەشیرەتەکەی کە لە دونیا پشتیان دەگرت و هەرچی خەڵکی سەر زەوی هەیە بیکات بە لاگێڕی سەری خۆی بەس بۆ ئەوەی ڕزگاری بێ لە ئازار و ئەشکەنجەی ئاگری دۆزەخ(بەڵام اللَّه ڕزگاری ناکات و دەفەرمووێ:)نەخێر،(ڕزگارت ناکەم).

**پرسیار:** ئاسانترین سزا لەدۆزەخ چ سزایەکە؟
**وەڵام:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا مَنْ لَهُ نَعْلاَنِ وَشِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ، يَغْلِى مِنْهُمَا دِمَاغُهُ، كَمَا يَغْلِى الْمِرْجَلُ مَا يَرَى أَنَّ أَحَدًا أَشَدُّ مِنْهُ عَذَابًا، وَإِنَّهُ لأَهْوَنُهُمْ عَذاباً)**رواه البخاري و مسلم. واتە: سووکترین ئازار، ئازاری کەسێکە کە دوو نەعلی لەبەردایە و دوو لاستیکی ئاگری پێیە و مێشکی لە تاوا وەک مەنجەڵ دەکوڵێ، پێی وانییە کە کەس ئازاری لەو زیاتر بێ،بەڵام کەچی سووکترین ئازاریشە لە دۆزەخ.

**پرسیار:** چۆن ئاگری دونیا بەراورد دەکرێ لەگەڵ ئاگری دۆزەخ؟

**وەڵام:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(نارُكمْ هذِهِ اللَّتي توقِدونَ جُزءُ مِنْ سَبعينَ جُزءاً حَر جَهَنمَ،قالوا: واللَّه إنْ كانَتْ لكافية يارَسولُ اللّهِ،قالَ فَانَّها فصِّلَتُ بتسعةٍ وسِتّين جُزءاً كُلُهنَّ مِثلُ حَرِّها)** البخاري و مسلم، واته: ئەو (ئاگرە) گەورەیەی کە ئێوە لە دونیا دەیکەنەوە بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ، ئەوانیش گوتیان: هەر ئەوەندە ئاگری دونیا بەس بوو(تا تاوانبارانی پێ بسووتابا)ئەویش فەرمووی:ئاگری دۆزەخ شەست و نۆی بەسەر ئاگری دونیاوە هەیە، هەر بەشەو گەرمیەکەی وەک گەرمییەکەی دونیا وایە،کەواتە ئاگرێ دۆزەخ شەست و نۆجار بەقەد ئاگری دونیا گەرمترە.

**پرسیار:** دوا کەس لە تاوانباران کە لە ئاگری دۆزەخ دەردەچێ کێیە؟

**وەڵام:** هیچ کەس لە کافر و بێ بڕوایان نایەنە دەر،تەنها ئەو گوناهبارانە نەبێ کە گوناهەکانیان بە ئاگر نەبێ لێ هەڵنەوەراون.

دوا کەس لەوانەی کە لە دوای تۆڵە سەندنەکەی لە دۆزەخ دێتە دەرەوە کەسێکە دەڕوا و بەردەبێتەوە ناو ئاگر، تا ئەو دەمەی لە ئاگر دەرباز دەبێ و (ئاوڕ دەداتەوە بە دۆزەخ دەڵێ:) پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە منی لەچنگ تۆ دەرباز کرد،لە دوورەوە دارێک دەبینێ و دەڵێ:ئەی پەروەردگار بمبە ژێر ئەو دارە بۆ ئەوەی بحەسێمەوە و هەندێک لە ئاوەکەی بخۆم،اللَّه تعالی ش دەفەرمووێ:ئەو دارەت پێ ببەخشم داوای هیچی ترم لێ دەکەیت؟ ئەویش دەڵێ:نا بەو خوایە داوای چیرت لێ ناکەم و(پەیمانی دەداتی)دوای ئەوە کە دەچێتە ژێر سێبەری دارەکە و هەندێک ئاو دەخواتەوە لەو دەمە اللَّه تعالی دارێکی تری پێ نیشان دەدات، کە گەلێک لە دارەکەی پێشوو جوانتر و ڕێک و پێکترە،بڕوادارەکەش کە چاوی بە دارەکە دەکەوێت خۆی پێ ناگیرێ و دەڵێ: بمبە ژێر ئەو دارەش تا نەختێک لەژێریا بحەسێمەوە و هەندێک ئاوی لێ بخۆم..ئیتر داوای چیترت لێ ناکەم، اللَّه تعالی ش دەفەرمووێ:ئەی تۆ پەیمانت نەدامێ داوای چیترم لێ نەکەیت؟ئێستا ئەگەر پێت ببەخشم داوای شتی تریشم لێ دەکەیت،ئەویش پەیمانی پێ دەدات داوای شتی تری لێ نەکات..ئەم جارە اللَّه تعالی دارێکی تری پێ نیشان دەدات لەنزیک بەهەشت کەلە هەردوو دارەکانی پێشوو دڵڕفێنتر و جوانتر بوو..ئەم جارەش وەکو جاران پیاوەکە لەگەڵ اللَّه دەدوێ و داوای دارەکە دەکات و پەیمانیشی دەداتێ کە داوای چیتری لێ نەکات، کاتێ کە دەچێتە ژێر ئەو دارەش،گوێ لەدەنگی گوێ لەدەنگی بەهەشتیەکان دەبێ، دیسان خۆی پێ ناگیرێ و داوا لە اللَّه دەکات کە بیخاتە بەهەشت..اللَّه تعالی ش پێی دەڵێ:ئەی ئادەمیزاد چ شتێک چاوت تێر دەکات وات لێ دەکات کەداوای چی ترم لێ نەکەیت؟دەتەوێ هەموو دونیات بدەمێ تاوەکو ڕازی بیت؟ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم گاڵتەم پێ دەکەیت کە تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانی؟ئینجا اللَّه تعالی پێ دەکەنێ و پێی دەفەرمووێ: من گاڵتەت پێ ناکەم، بەڵام من دەسەڵاتم بەسەر هەموو شتێک هەیە کە بیکەم، ئینجا اللَّه تعالی دەیباتە بەهەشت...**رواه مسلم.**

**پرسیار:** ئایا دۆزەخ ئێستا لەبوون(وجود)دا هەیە؟

**وەڵام:** بەڵێ، هەروەک الله تعالی دەفەرمووێ: **(وَ اتَّقُوا النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ)**ال عمران١٣١،واتە: خۆتان لە ئاگرێک بپارێزن کەوا بۆ بێ بڕواکانمان ئامادە کردووە.

**پرسیار:** بەهەشت چییە؟

**وەڵام:** بەهەشت باخ و بێستانێکە کە اللَّه تعالی دایناوە بۆ ئەو کەسانەی کە بڕوادارن و کردەوەی چاک ئەنجام دەدەن کە فراوانیەکەی بەقەد فراوانی ئاسمان و زەوییە،هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ)**ال عمران١٣٣،واتە: بەهەشتێکە فراوانیەکەی بەقەد ئاسمانەکان و زەوییە کە بۆ پارێزگاران لە تاوان ئامادە کراوە.

**پرسیار:** بەهەشت بەچەند ناو لە قورئان دا هاتووە؟

اللَّه تعالی بەزۆر ناو لە قورئان ناوی بەهەشتی هێناوە کە ئەمانەی خوارەوەن:

( المأوى، عدن، خلود، الفردوس، دار السلام، جنات النعيم، المقام الأمين).

**پرسیار:** بەهەشت چۆنە؟

**وەڵام:** اللَّه تعالی دەربارەی چۆنیەتی بەهەشت دەفەرمووێ: **(يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ،بِأَكْوَابٍ وَ أَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ،لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ،وَفَاكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ،وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ،وَحُورٌ عِينٌ،كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ،جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ)**الو اقعة١٧-٢٤، واتە: مناڵی جوان و بێ موو لە دەوریان خول دەخۆن،بەخۆو بە فنجان و سوراحی و پەرداخی پڕ لەشەراب،هەرکاتێ بیخۆنەوە دووچاری سەریەشە و بێهۆشی نایەن، (ئینجا ئەم بەهەشتە)سەوزە و میوەجاتێکی وای لێیە کە بۆخۆیان هەڵی بژێرن،لەگەڵ گۆشتی باڵندەیەک کە دڵیان ئارەزووی لێ هەبێ،ئینجا حۆری چاو گەورەی وایان پێشکەش دەکرێ کەلە جوانیان وەکو مۆری و مەرجان وان،ئەمە پاداشتی ئەم کردەوە چاکانەیە کەلە دونیا کردوویانە..

هەروەها اللَّه تعالی لەفەرموودەیەکی قودسی دا دەفەرمووێ: **(أَعددتُ لِعَبادِي الصالحينَ ما لا عَيْنٌ رَأَت ولا أُذُنٌ سَمِعَت ولا خَطَرَ على قَلبِ بَشَر)**رواه الترمذي، واتە: بۆ بەندە چاکەکانی خۆم ئامادەم کردووە،شتی وا کە هیچ چاوێک نەیبینیوە و هیچ گوێیەک نەی بیستووە و بەسەر هیچ دڵێکیشدا نەهاتووە.

**پرسیار:** کۆسک و خشت و خاک و خۆڵی بەهەشت چۆنە؟

وەڵام: پێغەمبەری ئازیز ﷺ لەبارەیان دەفەرمووێ: **(لبنةٌ مِنْ فِضَةٍ ولَبِنَةٌ من ذهبٍ ومِلاطُها المسكُ الأذفرُ وحصباؤها اللؤلؤُ والياقوتُ وتربتُها الزَّعفرانُ من دخلُها ينعَمْ لا يبؤسُ ويخلدْ ولا يموتُ ولا تَبلى ثيابُهم ولا يفني شبابُهم)**الترمذي، واتە: کۆشکەکانیان بەجۆرێک دروست کراوە،کە خشتەکانی بریتیە لە زێڕ و زیو،نێوان هەردوو خشتیش بریتیە لە جۆرە بۆنێک پێی دەڵێن:(المسک الأذفر)ئینجا ناواخنی ژوورەکەش بە مۆری و مەرجان ڕازێراوەتەوە،خاک و خۆڵی ژوورەکەش جۆرە خۆڵێکە پێی دەڵێن: (زەعفەران)هەرکەسێک بچێتە ناوی هەر لە خۆشی دا دەژی و بەهیچ جۆرێک تووشی کڵۆکی نابێ، بە نەمریش دەمێنێتەوە و مردنی بەسەردا نایە و جلەکانیان کۆن نابێ و گەنجیەتیەکەیان بەسەر ناچێ.

**پرسیار:** چ پلەیەک لەبەهەشت لە هەموو پلەیەک خۆشترە؟

وەڵام: لە بەهەشت (١٠٠)پلە هەیە، لەنێوان ئەوانیش بەهەشتی فیردەوس خۆشترین بەهەشتە هەروەک پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(في الجَنةِ مائَة درجَةٍ مابَينَ كُلَ دَرجتَينْ كما بَينَ السَماءِ والأرض والفردَوسُ أعلاها دَرجةَ ومِنها تَفجرُ أنهارُ الجنَّةِ ومِنْ فَوقَها يَكونُ العَرشُ فإذا سَألتُمْ اللَّهُ فَاسألوهُ الفِردوسَ)**رواه البخاري والترمذي، واتە: لە بەهەشت(١٠٠)پلە هەیە، نێوان هەر پلەیەک تا پلەیەک نێوان ئاسمان و زەویە بەهەشتی فیردەوسیش لەسەرووی هەموویانە،کە سەرچاوەی ئاوی بەهەشت لەوێیە،لەسەر ئەم بەهەشتەش بارەگای اللّه ی لێیە، بۆیە ئەگەر داوای شتێکتان لە اللّه کرد داوای بەهەشتی فیردەوسی لێ بکەن.

**پرسیار:** ڕووبارەکانی بەهەشت چۆنن؟

وەڵام: اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(مَّثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى)**محمد١٥،واتە: نموونەی ئەو بەهەشتەی کە پەیمانمان لێ بەبەهەشتیەکان داوە،ڕووبارەکانی بریتین لە ئاوی پاک و سازگار چەندین ڕووباری شیر کە تام و بۆنی بەهیچ جۆرێک تێک ناچێ و چەندین ڕووباری ئارەق کەزۆر بەتامە بۆ ئەوانەی کە دەیخۆنەوە و چەندین ڕووباری تریش لە هەنگوینی پاڵفتە کراویان بۆ هەیە.

**پرسیار:** دار و درەختەکانی بەهەشت چۆنن؟

**وەڵام:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(انَّ في الجنَّةِ لشَجَرة يَسيرُ الرّاكبُ في ظِلِّها مائَةَ عامٍ لا يَقْطَعُها)**رواه الترمذي، واتە: لە بەهەشت داری وای لێیە کەوا پیاو(١٠٠)ساڵان بەسواری بەژێریدا دەڕوات و سێبەرەکەی کۆتایی نایە.

**پرسیار:** ژوورەکانی بەهەشت چۆنن؟

**وەڵام:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(إنَّ في الجنَّةِ لغُرفاً يُرىَ ظُهورِها مِنْ بطونِها وَبطونِها مِنْ ظُهورُها)**رواه الترمذي. واتە: بەهەشت ژووری وای لێیە کەلە جوانیان لە دەرەوە ژوورەوەی دیارە لە ژوورەوەش دەرەوەی دیارە.

**پرسیار:** ئەهلی بەهەشت چۆنن؟

**وەڵام:** ئەهلی بەهەشت بەم شێوەیەی خوارەوەن:

١) اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(إِنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَاكِهُونَ هُمْ وَأَزْوَاجُهُمْ فِي ظِلَالٍ عَلَى الْأَرَائِكِ مُتَّكِئُونَ لَهُمْ فِيهَا ةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ سَلَامٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ)**يس٥٥-٥٨،واتە: بەڕاستی هاوڕێیانی بەهەشت لەم ڕۆژەدا سەرقاڵی خواردنی میوەجاتەکانن خۆیان و خێزانەکانیان لەسەر سیسەم لەژێر سێبەرێکا شانیان داناوە، ئینجا هەرچی سەوزەیەک داوا بکەن اللّه پێیان ئەدا و ماوە ماوە لەلای اللّه وە بەبەزەیشەوە سەلامیان لێ دەکرێت.

٢)پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ: **(أَهْلُ الْجَنَّةِ جُرْدٌ مُرْدٌ كُحْلٌ لا يَفْنَى شَبابُهُمْ، وَلا تَبْلَى ثِيابُهُمْ)**رواه الترمذي، واتە: هاوڕێیانی بەهەشت نە موو نە ڕیشیان لێ نایەت و چاوەکانیشیان پڕە لەکل، نە گەنجیەتیان بەسەر دەبرێ و نە جلەکانیشیان کۆن دەبێ،

٣)هەروەها دەفەرمووێ: **(مَنُ ماتَ آهْلُ الجَنَّةُ مِنْ صَغيْر أو كَبير يُردونَ أبناءَ ثَلاثِينَ في الجَنَّة لا يَزيدونَ عَليها أبَداً و كَذالِكَ أهلُ النَّارِ)**رواه الترمذي. واتە: هەرکەسێ بمرێ لە ئەهلی بەهەشت چ بچووک بێ چ گەورە،دێنە سەر دۆخی تەمەنی(٣٠)ساڵی، نەکەم دەبنەوە و نە زیادیش دەبن،ئەهلی دۆزەخیش بەهەمان شێوەن.

٤)هەروەها دەفەرمووێ: **(إِنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى أَشَدِّ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ فِي السَّمَاءِ إِضَاءَةً، لَا يَبُولُونَ، وَلَا يَتَغَوَّطُونَ، وَلَا يَتْفِلُونَ، وَلَا يَمْتَخِطُونَ، أَمْشَاطُهُمُ الذَّهَبُ، وَرَشْحُهُمُ الْمِسْكُ، وَمَجَامِرُهُمُ الْأَلُوَّةُ الْأَنْجُوجُ عُودُ الطِّيبِ، وَأَزْوَاجُهُمُ الْحُورُ الْعِينُ، عَلَى خَلْقِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ آدَمَ ؛ سِتُّونَ ذِرَاعًا فِي السَّماء و لِكُلِ واحِدٍ مِنهُم زوجَتان يُرى مُخ ساقِمها مِنْ وَراء**

**اللَّحمُ مِنْ الحُسْن لا أختِلافَ بَينَهُم ولا تَباغُضَ قُلوبُهم قَلبُ واحِدٍ يُسَبِحونَ بُكرةَ وَعِشياً)** رواه الشيخان والترمذي،
واتە: یەکەم کۆمەڵ کەدێنە بەهەشت شێوەیان لەمانگی چواردە دەکات،ئەوەی لەدوای ئەمانیشەوە دێن شێوەیان لە ئەستێرەیەکی پرشنگدار دەکات و بەجۆرهک نەمیز هەیە و نە پیسایی دەکەن و نە تف و نە چڵمیشیان هەیە، ئەم شانەیەی کە بەکاری دەهێنن لە زێر دروست کراوە ئارەقەکانیشیان لەمیسک پێک هاتووە بۆندارترین بخورد لەم ڕۆژەدا دادەگیرسێنن،خێزانەکانیان حۆری عەینن و لەسەر یەک ڕەوشت ڕاهێنراون، شێوەیان لە ئادەم دەکات کەوا(٦٠)باڵ درێژ بووە بەرەوە ئاسمان،هەریەکێکیش لەوانە دوو ئافرەتی بۆ هەیە، ئافرەتەکان هێندە جوانن لە جوانیان مۆخی ناو ئێسکیان لەگەڵ دیارە،ئینجا ئەم دوو ئافرەتە هیچ رق و بوغزێکیان لەگەل یەکدا نییە،دڵی هەردووگیان لەیەک دڵ پێک هاتووە و بەیانیان و ئێواران خوای خۆیان بەپاک ڕادەگرن.

**پرسیار:** ئافرەتەکانی بەهەشت چۆنن؟

**وەڵام:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(وَلَوْ أَنَّ امْرَأَةً مِنْ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ اطَّلَعَتْ إِلَى الْأَرْضِ لَأَضَاءَتْ مَا بَيْنَهُمَا وَلَمَلَأَتْ مَا بَيْنَهُمَا رِيحًا وَلَنَصِيفُهَا خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا)** رواه البخاري والترمذي،واتە: ئەگەر یەک ئافرەت لە ئافرەتانی بەهەشت سەر دەربێنێتە سەر زەوی ئەوا نێوان ئاسمانەکان و سەر زەوی ڕووناک دەکاتەوە و هەموو کون و کەلەبەرێکی ئەم زەوییە بۆندار دەکات،ئەو چارۆگەیەی کەلە سەریشی دەکەن بەنرخترە لە دونیا و ئەوەشی کەلە دونیا دا هەیە.

**پرسیار:** یەکەم کەس کە دەچێتە بەهەشت کێیە؟

**وەڵام:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(أنا أوَلَ مَنْ يَقرعُ بابَ الجَنَّةِ..)** رواه مسلم،واتە: من یەکەم کەسم کەلە دەرگای بەهەشت دەدەم.

**پرسیار:** ئایا بەهەشتیەکان خوای خۆیان دەبینن؟

**وەڵام:** بەڵێ هەموو بەهەشتیەک الله تعالى دەبینێ، تەنها دۆزەخییەکان نەبێ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ يَقُولُ:اللهُ تَبارَكَ وَتَعالَى: تُرِيدُونَ شَيْئًا أَزِيدُكُمْ فَيَقُولُونَ أَلَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنَا أَلَمْ تُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ وَتُنَجِّنَا مِنْ النَّارِ قَالَ:فَيَكْشِفُ الْحِجَابَ، فَمَا أُعْطُوا شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنْ النَّظَرِ إِلَى رَبِّهِمْ عَزَّ وَجَلَّ)** رواه مسلم والترمذي، کاتێ کە ئەهلی بەهەشت چوونە بەهەشت اللّه تعالى پێیان دەڵێ: ئایا چیترتان دەوێ تاکو بۆتانی زیاد بکەم ئەوانیش دەڵێن: ئەی رووی ئێمەت سپی نەکردووە،ئەی نەتبردوینە بەهەشت، ئەی لە ئاگر دەربازت نەکردین؟ئینجا لەو دەمە ئەو پەردەی لە نێوان اللّه و (پاشان)خەڵکی هەیە، لادەدرێت و هەرهەموویان بە چاوی خۆیان خوای خۆیان دەبینن؟! هیچ شتێک لەم کاتەدا لە بینینی اللّه خۆشتر نییە.

**پرسیار:** ئایا ئێستا بەهەشت دروست کراوە؟

**وەڵام:** بەڵێ، هەروەک اللّه تعالى دەفورمووێ: **(وَسَارِعُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ)** ال عمران١٣٣، واتە: پێشبرکێ بکەن بۆ لێبوردەیی اللّه تعالى و بەهەشتێک کە بەرینایی بەقەد ئاسمانەکان و زەوییە،کە بۆ پارێزگارانمان ئامادە کردووە.

**پرسیار:** ئایا بەهەشتی ودۆزەخییەکان یەکتری دەبینن؟ئایا چی بەیەکتر دەڵێن؟

**وەڵام:** بەڵێ هەردوولا یەکتر دەبینن قسەش لەگەڵ یەکتر دەکەن، بۆ نموونە: بەهەشتیەکان ڕوو لە دۆزەخییەکان دەکەن و دەڵێن: **(وَنَادَىٰ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابَ النَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا ۖ قَالُوا نَعَمْ ۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ)** الاعراف٤٤، واتە: بەهەشتیەکان بانگی دۆزەخییەکان دەکەن و دەڵێن:ئێمە دەستمان کەوت لەو بەهەشتەی کە اللّه پەیمانی پێ دابووین، ئایا ئێوەش دەستان گەیشت لە ئازار و سزای ئەو دۆزەخەی کە کاتی خۆی پەیمانتان پێ درابوو؟ گوتیان بەڵێ: ئینجا لەم کاتەدا بانگ کەرێک بانگ دەکاو ئەڵێ: نەفرەتی اللّه لەوانەبێ کە زۆردار و ستەم کارن.

هەروەها دۆزەخییەکان ڕوودەکەنە بەهەشتیەکان و پێیان دەڵێن: **(وَنَادَىٰ أَصْحَابُ النَّارِ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ أَنْ أَفِيضُوا عَلَيْنَا مِنَ الْمَاءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ ۚ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى الْكَافِرِينَ،الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ۚ فَالْيَوْمَ نَنسَاهُمْ كَمَا نَسُوا لِقَاءَ يَوْمِهِمْ هَٰذَا وَمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ)** الاعراف٥٠-٥١، واتە: دۆزەخییەکان بانگی بەهەشتیەکان دەکەن و دەڵێن:هەندێک ئاو یان لەو خواردنەی بە ئێوەی بەخشیوە بماندەنێ،(بەهەشتیەکان)پێیان دەڵێن:اللّه ئەوانەی لەسەر بێ بڕوایان حەرام کردووە،ئەو کافرانەی کە هینی اللّه یان بە گەمە و گاڵتە گرتبوو ژیانی دونیا فریوی پێ خواردبوون،بۆیە ئێمەش ئەمڕۆ لە یادیان دەکەین هەروەک چۆن ئەوان کاتی خۆی دیداری ئەم ڕۆژەیان لەیاد کردبوو نکوڵیان لە ئایەتەکانی ئێمە دەکرد.

**پرسیار:** (الأعراف)چییه؟

**وەڵام:** (الاعراف)شوێنێکه دەکەوێته نێوان دۆزەخ و بەهەشت،کە بریتیە لە شوێنی ئەو کەسانەی کە خێر و شەڕ، یان چاکە و خراپەیان وەکو یەکە،هەروەک اللّٰه تعالی دەفەرمووێ: **(وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ ۚ وَعَلَى الْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّا بِسِيمَاهُمْ ۚ وَنَادَوْا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ أَن سَلَامٌ عَلَيْكُمْ ۚ لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ،وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَارُهُمْ تِلْقَاءَ أَصْحَابِ النَّارِ قَالُوا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ،وَنَادَىٰ أَصْحَابُ الْأَعْرَافِ رِجَالًا يَعْرِفُونَهُم بِسِيمَاهُمْ قَالُوا مَا أَغْنَىٰ عَنكُمْ جَمْعُكُمْ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ،أَهَٰؤُلَاءِ الَّذِينَ أَقْسَمْتُمْ لَا يَنَالُهُمُ اللَّهُ بِرَحْمَةٍ ۚ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمْ وَلَا أَنتُمْ تَحْزَنُونَ)**الاعراف٤٦-٤٩،واتە: لەنێوان بەهەشت و دۆزەخ پەردەیەک هەیە لێکی جیا کردوونەتەوە و لەسەر بەرزی ئەو پۆپەی ئەم پەردەیە کەلە نێوان بەهەشت و دۆزەخ دایە، چەند پیاوێک هەیە کە هەموو ئەهلی بەهەشت و دۆزەخ بە دیمەن دەناسن،ئەم(پیاوانە)بانگی بەهەشتیەکان دەکەن و دەڵێن:دروودی خواتان لەسەربێ(لەو کاتەدا اللّٰه تعالی دەفەرمووێ:)ئەم پیاوانە نەچوونەتە بەهەشت و کەچی زۆریش تامەزرۆنە بۆ چوونە ناوی،کاتێکیش کە ڕوودەکەنە دۆزەخییەکان (پێیان دەڵێن): خودایە مەمانگێڕە بە کۆمەڵی زۆردار و ستەمکاران، ئینجا ئەم پیاوانە بانگ ئەکەن لەچەند پیاوێک کە بەسیما و شێوەکانیانەوە دەیانناسن و پێیان دەڵێن:تاقم بوون و کۆبوونەوەکەتان(بە گەورە تەماشا دەکرد)بەڵام هیچ سوودی پێ نەگەیاندن و خۆ بەگەورە زانینیشتان هەر بە پووچی مایەوە و سوودی پێ نەگەیاندن، (هەروەها)پێیان دەڵێن:ئایا ئەم تاقمە مسوڵمانە بوو(لەو دەمە ئاماژە بۆ بەهەشتیەکان دەکەن) کەوا کاتی خۆی سوێندتان دەخوارد و پێتان وابوو کەناکەونە بەر ڕەحمەتی اللّٰه؟(کەواتە ئێستا اللّٰه بەهەشتی پێ بەخشیون؟)(ئینجا بەهەشتیەکان دەڵێن): فەرموون بڕۆنە ئەو بەهەشتە کە بۆتان ئامادە کراوە و هیچ ترس و بیمتان لەسەر نابێ و دڵگرانیش نابن...

**پرسیار:** قەزاو قەدەر(القضاء والقدر)چییه؟

**وەڵام:** یەکێکە لە شەش بنچینەکانی بیروباوەڕی مرۆڤی موسڵمان، واتە مرۆڤ بێ بڕوا هەبوون بەوە کە خۆشی و ناخۆشی، چاک و خراپ، قەزاو قەدەری اللّٰه تعالی یە، بە مرۆڤێکی موسڵمان و بڕوادار دانانرێ،چەمک و واتای(قەزاو قەدەر)یش زانایان بەزۆر جۆر لێکیان داوەتەوە، بۆ نموونە: (راغب الأصفهاني) دەربارەی ووشەی(قدر)دەڵێ: (قەدەر)یانی ڕوون کردنەوەی ئەندازەی شت...ئەوە کە ئەو شتە بگیرێ بە ئەندازەیەکی تایبەتی، دەربارەی ووشەی(قضاء)یش دەڵێ:(قضاء)یانی جێبەجێ کردنی شتێک،جا ئەو شتە قسە بێ یان کردەوە. وە قەزای(اللّٰه)لە قەدەر تایبەتی ترە چونکە (قەدەر)بریتیە لە ئەندازەگیری (تقدیر) بەڵام (قەزا) بریتە لە دابڕین و جێبەجێ کردن، هەندێک زاناش گوتویانە، قەدەر وەکو ئەو شتە وایە کە بۆ پێوان ساز کرابێ، وە قەزا وەکو پێوان وایە.

کەواتە (قەدەر)یانی: ئەندازەگیری و نەخشەکێشان و بەرنامەدانانی اللّٰه تعالی بۆ هەرچی هەبووە و هەیە و دەبێ، هەر لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد،(قەزا)یانی:حوکم کردنی اللّٰه جێبەجێ کردنی ئەو شتانەی لە کەلە ئەزەلەوە زانیاری و ئیرادەی بێ سنووری پەیوەندییان پێوە بەستوون لە کات و شوێنی تایبەتی دا و بە شێوە و چۆنیەتی دیاری کراویان.

**پرسیار:** بڕوا بوون بە(قەزا و قەدەر)یانی چی؟

**وەڵام:** واتە: بڕوا بوون بەوەی کە هەموو شتێک، مادی یان نامادی، زانیاری و ئیرادەی اللّٰه تعالی لە ئەزەلەوە پەیوەندیان پێیەوە هەبووە، وە هەرچی هاتوونە دی یان دێتە دی بەپێی ویستی اللّٰه تعالی هاتۆتە دی یان دێتە دی و بەبێ ئیرادەی اللّٰه تعالی هیچ شتێک نایەتە دی وبەرگی بوون ناپۆشێ. اللّٰه تعالی ش بۆیە اللّٰه یە چونکە بەدیهێنەر و پەیداکەری غەیری خۆیەتی.

**پرسیار:** ئایا ئینسان تاچەندی ئازادە لە ئاقار قەزا و قەدەر؟

**وەڵام:** پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە پیویستە پێشەکی هەرکەسێک کە خۆی بە موسڵمان بزانێ سێ (٣) خاڵی گرنگ لەبەرچاو بگرێ و بڕوایەکی پتەوی دوور لە دوودڵی پێیان هەبێ:

١)هیچ شتێک نییە مومکین بێ هەبێ و لەژێر ڕکێفی زانیاری و ویستی خۆیدا نەبێ، هەرچی هەبووە و هەیە و دەگونجێ پەیدا بێ لە ئەزەلەوە لەوەدەمەیدا کە جگە لە اللّٰه تعالی هیچ شتێک نەبووە، اللّٰه تعالی زانیاری هەبووە لەسەر پەیدا بوونی، هەروەک اللّٰه تعالی دەفەرمووێ: **(وَيَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ)**ال عمران٢٩، واتە: اللّٰه تعالی هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لەزەویدا هەیە دەزانێ.

٢)اللّٰه تعالی دادگەر(عادل) و کاربەجێ (حکیم)ە، بە جۆرێک ستەم لەهیچ لە دروستکراوەکانی خۆی ناکات و هیچ کارێکی بێ جێشی لێ ناوەشێتەوە. هەروەک اللّٰه تعالی دەفەرمووێ: **(أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ)**التین٨، واتە: ئایا اللّٰه دادگەرترین و حوکم گێڕ و فەرمانڕەوا نییە؟یان دەفەرمووێ: **(كَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا)**النساء٩٢، واتە: اللّٰه تعالی زانا و کارزانە.

٣)ئینسان ئازادە و بەویستی خۆی دەژی، هەروەک اللّٰه تعالی و کاربەجێ دەفەرمووێ: **(فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ)**الکهف٢٩،واتە: جاکێ دەیەوێ بابڕوا بێنێ و کێش دەیەوێ بابڕوا نەیەنێ و(کافربێ).

ئینجا بۆ وەڵامی پرسیارەکەش هەر لەکۆنەوە سێ(٣)جۆرە وەڵام ساز کراون:

*وەڵامی جەبرییەکان(الجبرية):

دەڵێن: بەڵێ اللَّه هەر لە ئەزەلەوە کوفر وخراپەی لە کافر وخراپەکاران زانیوە و ویستووە هەر بۆخۆشی ئەو کوفر و خراپانەی تێدا خولقاندوون و مرۆڤ لە دەست و توانا ویستی اللَّه تعالی وەکو(قەڵەمێک)وایە لە چنگ نوسەردا و هەرچی دەیکات و لێی وەدی دێت لە چاکە و خراپە خۆی دەستی تێدا نییە و اللَّه پێی دەکات.

*وەڵامی موعتەزیلەکان(القدرية):

دەڵێن: نەخێر، اللَّه ویستی لەسەر تاوان و خراپەی تاوانباران نەبووە و بەدیهێنەری کردەوەکانی مرۆڤ نییە، ئاواش نەبێ دادگەری اللَّه ناچەسپێ.

*وەڵامی جەماوەری موسڵمانان(جمهور المسلمين)کەلە کۆنەوە بە(اهل السنة)ناسراون، دەڵێن: شتێکی ئاشکرایە کەئەم بوونەوەرەی تێیدا دەژین سێ جۆرە دروستکراو(مخلوق)ی تێدا هەن:

١)تۆپزی لێ کرا و بێ ئاگا: کە ماددەی بێ گیان و ڕووەکە، بۆ نموونە: ڕۆژ هەموو بەیانیەک بەناچاری لە ڕۆژهەڵاتەوە دەبێ بێ بۆ ڕۆژئاوا و ئیوارێ ئاوا دەبێ بێ ئەوەی هەست بکات و ئاگاداری ئەو کردەوەی خۆی بێ.

٢)تۆپزی لێ کراوی بە ئاگا: کە گیاندارانن، بۆ وێنە: مێشەنگوین(هەنگ)بەپێی سروشت و غەریزەیەکی خۆڕسک شیلەی گوڵان دەمژێ و هەنگوین دروست دەکات، هەرجەندە هەستیش بە کردەوەی خۆی دەکات، بەڵام بەناچاری و تۆپزی لێکراو(مجبور)ی.

٣)ئازادی ئاگا: کە ئینسانە و هەزارەها کردەوە و ڕەفتاری چاک و خراپی لێ دەپشکوێتەوە بە ئاگاداری و ویستی خۆی.

کەواتە: وەڵامی ڕاستەقینەش بۆ پرسیارەکە، هەر وەڵامەکەی سێیەمە،کە وەڵامی(اهل السنة والجماعة)ە ییە.

**پرسیار:** ئەی وەڵامت چییە دەربارەی هەڵوێستی جەبرییەکان یان موعتەزیلەکان لە بەرامبەر ئازادی و نا ئازادی دەربارەی ڕای جەبرییەکان دەڵێن:

**وەڵام:**

١)ڕاستە اللَّه تعالی لە ئەزەلەوە کوفر و خراپەی لە کافر و خراپەکاران زانیوە و ویستووە، وە ڕاستە اللَّه تعالی وەدیهێنەری هەموو شتێکە، تەنانەت کردەوەی بەندەکانیش، بەڵام ڕاست نییە هەرچی مرۆڤ دەیکات اللَّه پێی دەکات و مرۆڤ هیچ دەستی تێیدا نییە بەڵام وێڕای ئەوە کە اللَّه تعالی یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ بەدیهێنانی کردەوەکان، مرۆڤیش بۆخۆی بە ئیرادەی خۆی کردەوەکان هەڵدەبژێرێ و دیارییان دەکات.

٢)ڕاست نییە کە اللَّه تعالی هەر بۆخۆی تاوان و خراپە بەبەندەکانی دەکات و سزاشیان دەدات، بەڵکو اللَّه تعالی لەسەر ئەو کردەوانە مرۆڤ سزا دەدات کە بۆخۆی ئیرادە و هەڵبژاردنی خۆی ئەنجامیان دەدات.

٣)ئەوەی وای لە جەبرییەکان کردووە کە سیفەتی ستەم(ظلم)و بێ دادی پاڵدەنە لای اللَّه تعالی پاک ئەوەیە کە ویستوویانە لە کاردانەوەی(رد الفعل)ی موعتەزیلەکان بەرگری لە زانیاری و ئیرادە و دەسەڵاتی اللَّه بکەن.

وە دەربارەی مەعتەزیلەکانیش دەڵێین:

١)ناگونجێ بگوترێ اللَّه تعالی ویستی لەسەر تاوان و خراپەی تاوانباران نەبووە چونکە ماقول نییە شتێک لە موڵکی اللَّه تعالی یدا ڕوووبدات بەبێ ئیرادەی ئەو، دیسان ئەگەر بڵێین اللَّه نەی ویستووە بابی کافر کافر بێ و خراپە بکات بەڵام بەپێچەوانەوەی ویستی اللَّه کافر بیر و خراپەی کرد مانای وایە ویستی بەندەیەکمان بەسەر ویستی اللَّه زاڵ کرد، هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَمَا تَشَاءُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ)**التكوير٢٩، واتە: ناتانەوێ تا اللَّه تعالی نەیەوێ.

٢)وەبناگونجێ اللَّه کردەوەکانی مرۆڤی نەخولقاندوون و مرۆڤ خۆی خالیقی کردەوەکانیەتی،چونکە ئەگەر وابڵێین وێڕای ئەوەی کەهەندێک لە دروستکراوەکانی اللَّه مان لەژێر ڕکێفی اللَّه دەرهێناوە هاوبەشیمان بۆ بڕیارداوە چونکە وێڕای ئەوە ئینسانیشمان بە خالیق وبەدیهێنەر لەقەڵەم داوە،اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ)** الزمر٦٢،واتە: اللَّه تعالی بەدیهێنەری هەموو شتێکە، (واتە هەرچی هەیە اللَّه خولقاندوویەتی)

٣)ئینجا ئەوەی کە پاڵی بە(موعتەزیلەکان)ەوە ناوە کە ئاوا لە تەسک کردنەوە و گچکە کردنەوەی ئیرادە و توانای اللَّه وە خۆ کەون بریتی بوو لە چەسپاندن و سەلماندنی دادگەری اللَّه تعالی.

**پرسیار:** کاتێ یەکێک یەکێک دەکوژێ ئایا بەدیهێنەر و بەڕێوەبەری ئەو کوشتنە اللَّه یە یان بابای پیاوکوژ (قاتل)؟ واتە ڕای جەبریەکان ڕاسترە یان مەعتەزیلەکان لە ئاقار ئەم پرسیارە؟

وەڵام: پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەیەنەوە پێویستە ئەم مەسەلە ڕوون بکرێتەوە:

١)زانیاری(علم) و ویست(ارادة)و توانا( قدرة )ی اللَّه تعالی وەکو سێ ئەڵقەی زنجیرێک پێکەوە پەیوەستن لێک جیا نابنەوە، چونکە هەرچی لە ئەزەلەوە زانیاری و ویستی اللَّه پەیوەندیان پێوە بەستبێ حەتمەن هەر بە توانا و دەسەڵاتی ئەویش پەیدا دەبێ.

٢)ویست(ارادة)و ڕەزامەندی(رضاء)ی اللَّه تعالی لێک جودان، چونکە هەرچی ئینسان و غەیری ئینسانیش ئەنجامی دەدات خێر بێ یان شەڕ حەتمە بەپێی ئیرادەی اللَّه تعالی یە و ئەوەی اللَّه ویستی لەسەر نەبێ نابێ، بەڵام مەرج نییە هەرچی بەپێی ویستی اللَّه دێتە دی پێشی ڕازی بێ،چونکە اللَّه بەس بەچاکە ڕازییە و فەرمانی پێدەکات و بە خراپە ناڕازییە و بەرهەڵستیشی لێ کردووە، هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ)**الزمر٦٢،واتە: اللَّه تعالی ڕازی نییە بەندەکانی کافر بن، وە ئەگەر سوپاسی بکەن لێتان ڕازی دەبێ و بۆتان قبوڵ دەکات.

ئینجا بۆ وەڵامی پرسیارەکە، ئێمە دەڵێین ڕای هیچ کامێکیان ڕاست نییە نە بەس اللَّه تعالی بە تەنها ئەو کارەی ئەنجامداوە، تاکو قسەی جەبرییەکان ڕاست دەرچێ، وە نە مرۆڤیش بەتەنها ئەنجامی داوە، تا قسەی موعتەزیلەکان ڕاست دەربچێ، بەڵکو لە ڕاستیدا هەم اللَّه و هەم مرۆڤیش کاریگەریان هەبووە لە هێنانەدی ئەو کارەدا، بابزانین چۆن:

جارێ لەو لایەنەوە کەهەر لە ئەزەلەوە زانیاری و ویستی اللَّه پەیوەندییان بەو کارەوە بەستووە، بە توانای اللَّه ش هاتۆتە دی، ئەوە اللَّه تێیدا بەشدارە دیسان لەو لایەنەوە کە بابای پیاو کوژ بە ویست و هەڵبژاردنی خۆی ئەو کارەی ئەنجام داوە، مانای وایە ئەویش تێیدا بەشدارە.

بۆ نموونە: گریمان کورسیەکی کارەبایی هەیە جێی مرۆڤێک دەبێ تێیدا دابنیشێ کابرای دانیشتوو بۆ کوێ بوێ بۆ ئەوێ دەچێ، بۆ مەی خواردنەوە یان بۆ جیهاد، وە ئەو کورسیە بەهۆی دینەمۆیەکەوە کاربکات و بەسەری ڕابکات، وە کابرای دانیشتوو بۆ کێ بوێ یارمەتی بدات و کورسیەکەی بۆ بئاژوێ، جار جارەش ئاگاداری بکاتەوە پێی بڵێ: کوڕە هەرچی بکەی بۆ کوێ مەبەستت بێ یارمەتیت دەدەم و دەستت ناگرم، بەڵام فلان کار مەکە خراپە و سزای لەسەرە فلانە ئیش بکە و پاداشتی لەدوایە، بێگومان پیاوی نێو کورسی دیارە بەویستی خۆی چاکە و خراپە دەکات، بەڵام نەک بەتەنیا و سەربەخۆ، بەڵکو بە یارمەتی و هاوکاری ئەو کەسەی کەلەسەر دینەمۆیەکە و کورسی یەکەی بۆ بەجووڵ دێنێ، ئینجا دیارە کابرای نێو کورسیەکە ناتوانێ بڵێ: کە من بۆخۆم بەتەنها بێ یارمەتی هیچ کەس چاکە و خراپەکانم کردوون و ناشتوانێ بڵێ: من بە تۆپزی ئەو کردەوانەم پێ کراون و هیچ دەستم تێیاندا نەبووە دەجا مەسەلەی کاریگەری مرۆڤیش سەبارەت بە کردەوەکانی بەوەمان شێوەیە.

اللَّه تعالی ش لە بەرامبەر ویستی ئادەمیزاد دەفەرمووێ: **(فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ)**الكهف٢٩، واتە: جاکێ دەیەوێ با بڕوا بێنێ و کێ دەیەوێ با کافر بێ.

**پرسیار:** ئەی بۆچی اللَّه دەفەرمووێ:(فَيُضِلُّ اللَّهُ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي مَن يَشَاءُ)ابراهيم٤،واته: اللَّه تعالى كەسێكى بوێ گومڕای دەكات و هەركەسێكی بوێ ڕێنموویی دەكات، ئایا ئەم ئایەتە واناگەیەنێ كە ئادەمیزاد بۆخۆی وەدیهێنەری كردەوەكانی خۆی نییە؟

**وەڵام:** نەخێر، بەڵكو ئەم ئایەتەش بەڵگەیە لەسەر ئازادی مرۆڤ، چونكە اللَّه تعالى دەیەوێ كەسێک گومڕا بكات، كە ئەو ئینسانە بۆ خۆی گومڕایی هەڵبژاردبێ، كەسێكیش ڕێی ڕاستی هەڵبژاردبێ اللَّه تعالى ڕێی ڕاستی پێ ئەبەخشێ، هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: (فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَن يُضِلُّ)النحل٣٧،واته: بێگومان اللَّه تعالى ڕێنمایی گومڕا بوون ناكات، واته كەسێك گومڕایی هەڵبژێرێ (اللَّه گومڕایی دەكات). هەروەها دەفەرمووێ: (فَإِنْ أَسْلَمُوا فَقَدِ اهْتَدَوا)ال عمران٢٠.واته: ئەگەر موسڵمان بوون(ئەو دەمە)ڕێنمایی(اللَّه)وەردەگرن.

**پرسیار:** ئایا بڕوا بوون بە قەزا و قەدەر دەبێتە هۆی پاڵدانەوە و واز هێنان لە كارەكانی دونیا؟

**وەڵام:** نەخێر: بەڵكو بڕوا هەبوون بە قەزا و قەدەر مایەی جووڵان و كاركردن و خەبات و ڕەنج دانە، چونكە بەبێ هەوڵ و ڕەنج دان هیچ بۆ ئینسانێک نایەتە دی، هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: (وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ)النجم٣٩، واته: هیچ شتێک بۆ مرۆڤ نییە جگە لەوەی كە هەوڵی بۆ دەدات.

**پرسیار:** ڕێنمایی كردنی اللَّه تعالى (الهداية)چەند بەشە؟

**وەڵام:** ڕێنمایی كردنی اللَّه تعالى دەكرێت بە چوار بەش:

یەكەم: ڕێنمایی كردنی بوون(هداية الفطرة)بۆ ئەو مەبەستەی كەلە پێناویدا دروست كراوی، هەروەک كاتی خۆی (فرعون) لە پێغەمبەر(موسى) عليه السلام ی پرسی: كێ پەروەردگاری ئێوەیە؟

لە وەڵامدا گوتی: (قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَىٰ كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَىٰ) طه٥٠، واته: گوتی پەروەردگاری ئێمە ئەو اللَّه یە كەوا هەر شتە و سیما و شێوەی دروست كردنی خۆی داوەتێ ئەمجا ڕێنمایی كردووە.

اللَّه تعالى مریشكی بەجۆرێ دروست كردووە و ڕێنمایی كردووە كەوا لە هەفتەی سێیەمدا، نەختێک باڵەكانی لەسەر هێلكەكانی بڵند دەكاتەوە بۆ ئەوەی جوجەڵەكانی بەئاسانی ئۆكسجین(٢O) وەرگرن و هەناسە بدەن جا ئەگەر وانەبوایە جووجەڵەكان بە هەناسە سواری دەمرن، دیسان اللَّه تعالى بەجۆرێكی وا(سەگی)دروست كردووە كەوا بەبێ چاودێری كردن و سەرپەرشتی شەوان هەمووی بە پاسەوانیەوە بباتە سەر.

بێگومان هەموو بوونەوەرێک لەسەر زەوی بۆ مەبەست و پەیامێک دروست كراوە و ئەویش بۆ چ مەبەستێک دروست كراوە بەجێی دەهێنێ.

دووەم: ڕێنمایی كردن: ئەمەش پەیامی پێغەمبەران و پیاو چاكانە، مەبەست لەم ڕێنمایی كردنە بڕینی ڕێگەی بیانوی بەندەكانە لەسەر(اللَّه)كە دەفەرمووێ: (رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ)النساء١٦٥،واته: پێغەمبەرانی موژدەدەر بە پاداشت و ترسێنەر بە سزا بۆ ئەوەی خەڵكی ئیتر هیچ

بیانویەکیان نەمێنێ لەسەر اللَّه وە لەپاش ناردنی ئەم پێغەمبەرانە،هەرکەسیش پاش ئەم ڕێنمایی کردنە گومڕا بێت ئەوە بێگومان بە ئاگاداری و زانینەوە گومڕا بووە.

هەروەها دەفەرمووێ: **(وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَىٰ عَلَى الْهُدَىٰ)**فصلت١٧،واتە: ئێمە ڕێنمایی گەلی (ثمود)مان کرد، کەچی ئەوان کوێرییان پێ خۆشتر بوو لە ڕێنمایی ،هەر لەم بوارەدا اللَّه تعالى بە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دەفەرمووێ: **(وَ إِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ)**الشورى٥٢،واتە: بەڕاستی تۆ ڕێی نیشاندەری ڕێگای ڕاستی.

سێیەم: ڕێنمایی کردنی یارمەتی دان (هداية التوفيق) بۆ کردەوەی چاک ئەمەش تەنها بەدەستی خۆیەتی،ئەم ڕێنمایی کردنە لەو کارانەیە کەوا لە توانای هیچ کەس دانییە تەنها اللَّه نەبێت: **(تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ)**هود٨٨، واتە: سەرخستن و یارمەتی دانم تەنها بەدەست اللَّه تعالى یە.

دیسان قورئان پێمان دەڵێ:هچ ئادەمیەک توانای ڕێنمایی کردنی یارمەتی دانی نییە،تەنانەت پێغەمبەریش کە اللَّه تعالى پێی دەڵێ: **(إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ)**القصص٥٦،واتە: بێگومان تۆ ناتوانیت ڕێنمایی ئەو کەسانە بکەیت کە خۆشت دەوێن، بەڵام اللَّه تعالى هەرکەسی بوێ ڕێنمایی دەکات.

چوارەم: ڕێنمایی کردنی باوەڕدارەکان بۆ مالەکانیان لە بەهەشتدا: اللَّه تعالى ئاگاداری کردوون کەوا بەهەشت بەرین و فراوانە، کەوا بوو ئایا خەڵکەکە چۆن ئەتوانن بەئاسانی ماڵەکانیان تیا بدۆزنەوە،هەروەک اللَّه تعالى دەفەرمووێ: **(وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ،سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ،وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ)**محمد٤،٥،٦، واتە: ئەوانەی کەلە ڕێگەی اللَّه تعالى شەهید بوون، کردەوەکانیان وون نابێ و اللَّه تعالى لە داهاتوودا ڕێنموونیان ئەکا و بارو دۆخیان چاک ئەکا ئەمجا ئەیانخاتە ئەو بەهەشتەوە کەپێی ناساندوون، ئەوانیش بەم ڕێنموونیە ماڵەکانیان تیا ئەدۆزنەوە.

فەرموودەی اللَّه تعالى **(سَيَهْدِيهِمْ)** لە پاش شەهید بوون لە پێناوی اللَّه تعالى هاتوە کەوا اللَّه تعالى پاش مردنیان ڕێنماییان ئەکات بەرەو ماڵەکانی بەهەشت، کەوا پێی ناساندوون ئەوانیش بەم ڕێنمایی کردنە ماڵەکانیان ئەدۆزنەوە.

**پرسیار:** ڕێنمایی کردنی یارمەتی دان،کێ پێی بەختەوەر دەبێ؟

**وەڵام:** اللَّه تعالی ئەم ڕێنماییە بەکەسێک ئەبەخشێ،کە ئەم دوو خەسڵەتەی تیا بێتە دی:

یەکەم: پێغەمبەران بکات بە چاوساغ و چرای ڕێ نیشاندەریان و ڕازی بوون بە ڕێنماییەکانیان، هەر کەسێک باوەڕی بە پێغەمبەران نەبێ مل پێچی لە ڕێنمایی کردنیان بکات،لەڕێنمایی کردنی یارمەتی دان(التوفیق)بێ بەش ئەکرێ، بۆ نموونە:

ئەگەر شۆفێرێک پرسیاری لێ کردیت کەوا ڕێگەی پێ نیشان دەیت ئنجا پاش ئەوەی تۆش ڕێنموونیت کرد ڕێزی قسەکانی گرتیت و سوپاسی کردیت ئەوا جارێکی تر ئەگەر ئەم کابرایە ئوتۆمبیلەکەی پەکی کەوت مافی لەسەرت هەیە یارمەتی بدەیت. بەڵام ئەگەر ڕێنموونیەکەی تۆی وەرنەگرت و چەنەبازی و زمان درێژی کرد لە ڕووتا، ئیتر هیچ مافێکی لەسەرت نامێنێ ئەگەر جارێکی تر ئوتومبیلەکەی پەکی بکەوێ.

نموونەی بەرز و باڵاش تەنها شایەنی اللَّه تعالی یە.

دووەم: بوونی ئارەزووی کردەوەی چاک و خێر لەناو دڵ و مێشکی ئەو کەسەدا،چونکە اللَّه تعالی هەر مرۆڤێک بەگوێرەی نیاز و کردەوەی خۆی ڕێنمایی دەکات و دەفەرمووێ: **(فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ)**الليل٥-٧.واتە: ئەو کەسەی ببەخشێ و لە اللَّه بترسێ و بڕوای بێ بەچاکە،زوو یارمەتی ئەدەین بۆ ڕێی ئاسان(کە چاکەیە).

هەروەها دەفەرمووێ: **(وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ)**الليل٨-١٠.واتە: ئەو کەسەش ڕژدی و ڕەزیلی بکات خۆی بێ نیاز بزانێ و بڕوای نەبێ بەچاکە زوو ڕێی سەختی بۆ ئاسان ئەکەین.

**پرسیار:** قەزا و قەدەر دەکرێت بە چەند بەش؟

**وەڵام:**

١)ئەو قەزاو قەدەرەی کە بەدەست خۆی نییە وەک(کورتی و درێژی و جوانی و ناشرینی و زیرەکی و تەمەڵی).
ئەمانە باس کران هیچیان بەدەست ئینسان نییە، هەروەک اللّٰه تعالى دەفەرمووێ: **(هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاءُ)**ال عمران٦،ئەو خوایەی کەوا چۆن بیەوێ لەناو منداڵداندا وێنە و نەخشەی ئێوە دەکێشێ.
کەوا ئینسان لەم خاڵەدا سەربەستی نییە واتە(مُسَیر)ە و(مُخَیر)نییە، بۆیە لەسەریان بەرپرسیار نییە.

٢)ئەو قەزا و قەدەرەی کە پێویستی بە چارەسەرکردن هەیە:
بۆ نموونە قسەخۆش دەبێ چارەسەر بکرێ و قوتابی دەبێ بخوێنێت و ئاگر دەبێ توخنی نەکەویت....
کەواتە: هەرکام لە نەخۆشی و قوتابی و ئاگر لە قەزا و قەدەرەو بڕیار دراوە بەڵام پێویستیشیان بە ماندوو بوون هەیە تاوەکو چارەسەری بکەیت، هەروەک دەگێڕنەوە کاتێک کە(عومەری کوڕی خەتتاب)ڕەزای خوای لێ بێ ویستی بچێت بۆووڵاتی (شام)ئاگاداریان کردەوە کەوا پەتایرشانەوە (الطاعون)لەم وڵاتەدا بڵاو بۆتەوە، ئەویش بەمە سەردانەکەی دواخست.
دەڵێ کە (أبو عبیدەی کوڕی جراح)ڕەزای خوای لێ بێ پێی گوت: ئەی میری موسڵمانان ئایا لەدەست قەدەری اللّٰه تعالى هەڵدێی؟ عومەریش لە وەڵامدا پێی گوت: لە دەست قەدەری اللّٰه تعالى هەڵدێم بۆ دەست قەدەری اللّٰه تعالى، کەواتە قەزاو قەدەر نابێتە هۆی پاڵدانەوە وکۆشش نەکردن.

٣)ئەوەی کە ئینسان تیایا سەربەستە لە سنووری ئەم سەربەستیە بەرپرسیارە، هەروەک اللّٰه تعالى دەفەرمووێ: **(فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ)**الكهف٢٩،واتە: هەرکەسێ دەیەوێ با باوەڕ بێنێ و هەر کەسێکیش دەیەوێ با باوەڕ نەهێنێ و کافر بێ.

**پرسیار:** ئەنجام و سوودی بڕوابوون بە قەزا و قەدەر چییە؟

**وەڵام:** ئەنجام و شوێنەواری بڕوابوون بە قەزا و قەدەر بریتیە لە:

یەکەم: خۆڕاگرتن لە بەرامبەر بەڵاو تەنگانەدا و بێزاری دەرنەبڕین و خەفەت نەخواردن بەهۆی لەدەست چوونی بەرژەوەندی و قازانجێکی دونیایی.

دووەم: لەخۆبایی نەبوون بەهۆی وەدەست هێنانی قازانج و بەرژەوەندییەک، هەروەک اللّه تعالی بۆ هەردوو خاڵ دەفەرمووێ: **(مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ،لِّكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ)**الحديد٢٢،٢٣،واتە: هیچ بەڵایەکتان توش نابێ نە لە زەوی و ماڵ و نەلەخۆتاندا مەگەر پێش خولقاندنی نووسرابێ، ئەوەش بۆ اللّه تعالی ئاسانە، بۆ ئەوەی نە بۆ شتێک کەلە دەستان دەچێ دڵتەنگ بن، وە نەبۆ شتێک کە دەتانداتێ دڵخۆش بن.

سێیەم: ترسان لە مردن و نەسڵەمینەوە لەو ڕوودا و کارەساتانەی کە دژوارن و دەردەسەری و ئەرک و ئازاریان بەدواوەیە.

هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(قُل لَّن يُصِيبَنَا إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا)**التوبة٥١،واتە: بڵێ تووشمان نابێ ئەوە نەبێ کە اللّه تعالی بۆی نووسیوین،(ئەوەش کە نوسیویەتی هەردەبێ ببێ، کەواتە ترس و لەرزی ناوێ).

چوارەم: نائومێد نەبوون بەهۆی تاوانبارییەوە و لەخۆبایی نەبوون بەهۆی چاکەکارییەوە،پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(فو الله إن أحدكم أو الرجل يعمل بعمل أهل النار حتى ما يكون بينه وبينها غير باع أو ذراع، فيسبق عليه الكتاب فيعمل بعمل أهل الجنة فيدخلها، وإنَّ الرجلَ ليعمل بعمل أهل الجنة حتى ما يكون بينه وبينها غير ذراع أو ذراعين، فيسبق عليه الكتاب فيعمل بعمل أهل النار فيدخلها)**رواه البخاري، واتە: کەسی وا هەیە کردەوەی دۆزەخیانی لێ دەپشکوێتەوە هەتا باسکێکی دەمێنێ بگاتە دۆزەخ(یان باڵێک) بەڵام نووسراوی قەدەری اللّه پێشی لێ دەگرێتەوە و کردەوەی بەهەشتیان دەکات و دەچێتە بەهەشتێ،وە هی واهەیە کردەوەی بەهەشتیان دەکات هەتا باسکێک یان دوو باسکی نامێنێ بیگاتی،(یەکسەر)نووسراوی ئەزەل پێشی دەکەوێتەوە وکردەوەی دۆزەخیان دەکات و دەچێتە نێوی.

پێنجەم: خۆیەکلاکردنەوە بۆ اللّه و پشت بە اللّه بەستن، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: **(مَنْ أحَبَّ أنْ يَكُنَ أقْوَى النَّاس فَليَتوَلُ عَلَى اللّهِ)**أبن أبي حاتم،واتە: هەرکەسێک پێی خۆشە لە هەموو کەس بەتواناتر بێ با پشت بە اللّه تعالی ببەستێ.

شەشەم: ئینسان هەموو کات توانای خۆی دەخاتە کار بۆ چاکەکاری و پەسەندکاری تاکو لە اللّه تعالی نزیک بێتەوە و شایستەی چوونە بەهەشت چەپاڵە دران بێ لە دۆزەخ ....هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُ جَزَاءً الْحُسْنَىٰ)**الكهف٨٨،واتە: بەڵام هەرکەسێ بڕوا بێنێ و کردەوەی چاک بکات ئەوە پاداشتی چاکتری بۆ هەیە.

**پرسیار:** ئایا ئەم عەقیدەیەی کە باسمان کرد، چ عەقیدەیەکی پێ ئەڵێن؟
وەڵام: ئەو عەقیدەیەی کە باس کرا عەقیدەی(سەلەفی ساڵح)ی پێ ئەڵێن.

**پرسیار:** (سەلەف)کێیە؟
**وەڵام:** سەلەف ئەم دەستەیەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەیان دەفەرمووێ: **(انَّ خَیرُکُم قرني ثمَّ الَّذینَ یلونَهُم ثمَّ الَّذینَ یلونَهُم)البخاري و مسلم**، واتە: چاکترینتان ئەوانەن کەلە سەردەمی من دا ژیاون،ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان.
عولەمایان ئەفەرموون: سەلەفی ئەوکەسەیە کەئاکارو ئەخلاقی وەك پێغەمبەر ﷺ و صەحابە بێت، بۆیە پێویستە هەموو مان وابین سەلەف یەعنی پێشینەکانمان
پێغەمبەری خوا ﷺ جارێك لەمەجلیسێك دانیشتبوو (فاطیمە)هات لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت و پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی چپان بەگوێیا دەسی کرد بەگریان، دوایی شتێکی کەی چپان بەگوێیا ئینجا دەسی کرد بە پێکەنین، خاتوو عائیشە (رەزای الله تعالی لێ بێ) لێی پرسی ئەوە چیبوو بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ جارێك لەبنە گوێت چپاندی گریای و جاری پێکەنیت، گوتی: ناتوانمنم سرِی پێغەمبەر ﷺ ئاشکرا بکەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد فاطیمە باسی کرد و فەرمووی لەو مەجلیسەیا پێی گوتم: ئەی فاطیمە ئەوە من مردنم نزیك بۆتەوە ماوەیەکی کە من ئەمرم دەسم کرد بەگریان، دوایی پێی گوتم:
**(نعم السلف أنا لك)**متفق علیه باشترین پێشین بۆتۆ منم شوێنی وتارەکان و ئاکارەکان و وتەکان و دینەکە بکەوە نزیکترین کەسم لەمنەوە تۆی دوای من بەمن ئەگەیتەوە هەر بۆیە (٦)مانگی نەبرد فاطیمە وەفاتی کرد بۆیە پێکەنیم.
سەلەفی ئەم ئومەتە کە بریتین لە پێغەمبەری خوا ﷺ و صحابەو تابعین ئەوانەی لەوکاتە باشەیا ژیاون و باشترین تەتبیقی قورئانیان کردوە و سەر ڕاستانە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرەکەیان ﷺ دەبن تاکو دەمرن تەنازوڵ ناکەن لەعەقیدە و بیروباوەڕیان.

**پرسیار:** تایبەتمەندییەکانی سەلەف چین؟

**وەڵام:** ئێمە کاتێک دەڵێین سەلەفی واتە:

١)خەوارج نین تەنها بە گوناهێ خوێنی موسڵمان حەلاڵ کەن.

٢)(رافضي)نین هاوەڵانی پێغەمبەری ئازیز ﷺ کافر کەن.

٣)لەوانەش نین کە گۆڕانکاری و لێکدانەوەی نابەجێ بۆ سیفەتەکانی اللَّه تعالی دەکەن، وەک(موعتەزیلەکان).

٤)اللَّه تعالی بەهیچ لە دروستکراوەکانی ناچوێنن وەک (مشبّه)کان.

٥)سۆفی و شێخ پەرست و گۆڕ پەرستیش نین.

٦)دەمارگیریان بۆ ووتەی هیچ پێشەوایەک نییە کاتێک کە زانیان ووتەکانیان پێچەوانەی ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ.

٧)(تعطيل)ی ناوو سیفەتەکانی اللَّه ناکەن.

٨) سەرۆك و کاربەدەستانی وڵات ناکەن بە وەلی ئەمر گەر حوکم بە قورئان نەکەن.

٩) دژایەتی ئەهلی جیهاد و موجاهیدان ناکەن و بە خەواریجیان نازانن.

**پرسیار:** بەرنامەی وەرگرتن لای سەلەفیەکان چییە؟

وەڵام: مەبەست لە بەرنامەی وەرگرتن، ئەوەیە کە سەلەفی ساڵح بەپێی بەرنامەیەکی تایبەت مامەڵە لەگەڵ واقیع دەکەن، واتە:

١-هەرشتێک کۆک(موافق)بێ بە قورئان و سونەت وەری دەگرن هەرشتێکیش پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێ رەتی دەکەنەوە.

٢-هیچ کەسێکیان لەلا معصوم نییە غەیری پێغەمبەر ﷺ نەبێ.

٣-کۆڕ(أجماع)ی سەلەفی ساڵح لەلایان بیانوو(حجه)ی شەرعیە و خەڵکیش لەسەریانە کە وەری گرن.

٤-هیچ گوتەیەک و هیچ ڕایەک وەرناگرن بەبێ هەڵسەنگاندنیان بە قورئان و سوننەت و اجماع.

٥-لاملی ناکەن لەگەڵ قورئان و سوننەت بەپێی ئەقڵ یان ڕاو بۆ چوون یان پێوان(قیاس) تەسلیمی شەرعن.

٦-کۆمەڵکاری(الجماعة)لای سەلەفیەکان کەشتی ڕزگار بوونە لەگۆبەندی دونیا و ناخۆشی ڕۆژی دوایی.

**پرسیار:** ئامانجەکانی بانگەوازی سەلەفی چین؟

**وەڵام:** بانگەوازی سەلەفی لەم سەردەمەدا لەپێناو چەند ئامانج و مەبەستێکی گرنگ دایە:

١)کردنە یەکی موسڵمانان لەژێر یەک بیروباوەڕدا و یەک ڕێڕەوی تەشریع و یاسادا کە قورئانە.

٢)پێگەیاندنی موسڵمانی پاک و دوور لەهەموو هاوتاپەرستیەک و ئەفسانە و دەرمارگیریەک.

٣)پاک کردنەوەی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە هاوتاپەرستی و بیدعە و ئەفسانە و هەموو جۆرە شتێکی هەڵبەستراو ڕازێنراو.

٤)دژایەتی کردنی هەموو بیر و بۆچونێکی کوفر کەهاتۆتە نێو کۆمەڵگەی ئیسلامی.

٥)ڕزگار کردنی جیهانی ئیسلامی لەژێر چنگی دوژمنانی ئیسلام، ئەویش بە جیهادکردن دەکرێ.

**پرسیار:** گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ڕێڕەوی سەلەفی چین؟

**وەڵام:** تایبەتمەندییەکانی ڕێڕەوی سەلەفی بریتین لە:

١)پەیوەست بوون بە قورئان و سوننەت و تێگەیشتنیان لەسەر ڕێڕەوی سەلەفی ساڵح، وەک سەرچاوەیەک بۆ یاساو شەرع و وە هەڵسەنگاندنی هەر ووتەیەک پێیانەوە.

٢)یەکخواناسی بکرێتە بنچینەی خاڵی دەست پێکردن و خاڵی کۆتایی، واتە هەموو ئیشێک بۆ ئەمەبێ،

٣)پەیوەست بوون بەیەک بوون و یەک ڕیزی موسڵمانان، وە ڕێ نەدان بە لێک ترازان و پارچە پارچە بوون.

٤)دیار کردنەوە و جیاکردنەوەی (حەق و ناحەق)و(یەکخواناسی و هاوتاپەرستی)و(سوننەت و بیدعە).

**پرسیار:** تاقمی ڕزگاربوو(الفرقة الناجحة)کێن، یان پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ دەکرێن بە چەندین تاقم، گشتیان دەچنە دۆزەخ تەنها یەک تاقم نەبێ ئایا ئەم تاقمە کێن؟

**وەڵام:** تاقمی ڕزگاربوو، ئەوکەسانەن کە لەسەر ڕێگەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەڕۆن، هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(وَإِنَّ بني إسر ائيل تَفَرَّقَتْ عَلَى أثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِلَّةً، وَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلاَثٍ وَسَبْعِين مِلَّةً ،كُلُّهُمْ فِي النَّارِ إلاَّ مِلَّةً وَاحِدَةً،مَا أَنَا عَلَيْهِ و أصْحَابي)**رواه الترمذي، واتە: بەنی ئیسرائیلیەکان بوون بە حەفتاو دوو(٧٢)تاقم، ئومەتی منیش دەبێتە حەفتاو سێ(٧٣)تاقم هەر هەموویان دەچنە ناو ئاگر، تەنها تاقمێک نەبێ: ئەوانەن کە لەسەر ڕێی من و هاوەڵانم دەڕۆن.

**پرسیار:** نیشانەکانی تاقمی ڕزگار بوو چین؟

وەڵام: کۆمەڵی ڕزگاربوو چەند نیشانەیەکیان هەیە کە بریتین لە:

١-کۆمەڵێکی کەمن و کۆمەڵێکی زۆریش دوژمنایەتیان دەکەن، اللّٰه تعالی ش پێیان دا هەڵدەڵێ و دەفەرمووێ: **(وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ)**السبأ١٣،واتە: کەمێک لەبەندەکان سوپاس گوزاری منن.

بۆیە کەمینە و کۆمەڵێکی کەمن کە سەر ڕاستانە پەیوەستن بە قورئان و سوننەت.

پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرمووێ: **(طُوبي لِلغُرباء:أُناسٌ صالِحٌ،في أُناسٌ سُوء كَثيرٍ،مَنْ يُعصيهِمْ أكثَرُ مِمَّن يُطعِهِم)**صحيح رواه أحمد، واتە: خۆشی بۆ غەریبان، کە کۆمەڵە خەڵکێکی چاکن،لەناو کۆمەڵێکی زۆری خەڵکی خراپ دا ناسراون،ئەو کەسانە کەبەگوێیان ناکەن گەلێ زیاترن لەوانەی کە بە گوێیان دەکەن.

٢-هەموو ئەو کەسانەی کە لەسەر ڕێڕەوی سەلەفی ساڵحن بریتین لە تاقمی ڕزگار بوو.

**پرسیار:** بنچینەکانی کاری تاقمی ڕزگاربوو چین؟

**وەڵام:** تاقمی ڕزگاربوو لەسەر چەند بنچینەیەک کاردەکەن وەکو بەرنامە بەپێی ئەم خاڵانەی خوارەوە:

*ئەم تاقمە کار و کردەوەکانیان لەسۆنگەی کتێبی اللّٰه تعالی پاشان سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵدەبڕن، هەروەک پێغەمبەری ئازیز دەفەرمووێ: **(تَرَكْتُ فِيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّو ابَعْدَهُمَا: كِتَابَ اللَّهِ وَسُنَّتِي)** أخرجه الدارقطني في "السنن" (٤/٢٤٥) ، والبزار في "مسنده" (٨٩٩٣) ، والحاكم في "المستدرك" (٣١٩) واتە: دوو شتان لەنێو بە جێدەهێڵم(ئەگەر خۆتانی پێوە بگرن بەهیچ جۆرێک گومڕا نابن، ئەوەش کتێبی اللّٰه(قورئان)و سوننەتەکانی منن.

*تاقمی ڕزگاربوو: هەرکاتێک دووچاری کێشەیەک بوون یەکسەر دەگەڕێنەوە سەر فەرمانی اللّٰه تعالی پاشان پێغەمبەر ﷺ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، ئەویش بەپێی ئەم ئایەتەی خوارەوە: **(فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ)**النساء٥٩،واتە: ئەگەر لەهەر شتێکا گیربوون،یەکسەر بگەڕێنەوە سەر فەرمانی اللّٰه و پێغەمبەر ﷺ گەر ئێوە بڕواتان بە اللّٰه تعالی و بە ڕۆژی دوایی هێناوە...

*تاقمی رزگاربوو: قسەی خۆ بەپێش قسەی اللّٰه تعالی پاشان پێغەمبەرەوە ﷺ ناخەن، هەروەک اللّٰه تعالی دەفەرمووێ: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ)**الحجرات١، واتە: ئەی بڕوادارینە قسەی خۆتان بەپێش قسەی اللّٰه تعالی پاشان پێغەمبەر ﷺ مەخەن.

هەروەک(ابن عباس)یش ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرمووێ: **(أخشى أن تنزل عليكم حجارة من السماء،أقول لكم رسول الله ،و تقولون قال أبوبكر و عمر)** من لەوە ئەترسم لە ئاسمانەوە (بەرد)تان بەسەرا بێتە خوارەوە لەوەی کە من دەڵێم پێغەمبەری خوا ﷺ وا دەفەرمووێ، ئێوەش بڵێن ئاخر(أبوبكر و عمر)یش وا دەفەرموون.

تاقمی ڕزگاربوو: کارەکانیان لەسەر یەک خواناسیيەوە ئەنجام ئەدەن کە بریتیە لە الله بەیەک زانین و بەتەنها پەنا بردنە بەر ئەو خۆ یەکلاکردنەوە بۆ ئەو،هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَقَالَ اللَّهُ لَا تَتَّخِذُوا إِلَهَيْنِ اثْنَيْنِ إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ)**النحل٥١، واتە: دوو خوا بۆخۆتان بڕیار مەدەن و مەیان پەرستن،چونکە خوای ڕاستەقینەی ئێوە تەنها خوایەکە و بەس.

*تاقمی ڕزگاربوو: هەمیشە سوننەت و ئاکاری پێغەمبەر ﷺ زیندوو دەکەنەوە، لە کاتێکا کە ئەم سوننەتە لەنێو خەڵکی غەریب بێ، هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(إنَّ الإسلَامَ بَدَأ غَرِيبًا وَسَيعودُ غَرِيبًا كَما بَدأ فَطُوبى لِلغُرَبَاءِ الَّذِينَ يُصْلِحُونَ إذَا أَفْسَدَ النَّاسُ)**رواه مسلم،واتە: بێگومان ئیسلام بە غەریبی دەستی پێکرد کاتێکیش کە دەگەڕێتەوە بۆ هەمان شێوە بەغەریبی دەگەڕێتەوە،خۆشی بۆ ئەو غەریبانەی کە چاکە دەنێنەوە دوای ئەوەی کە خەڵکی بەرەوە زەلکاوی خراپی ڕێ گرتوو بوون.

*تاقمی ڕزگاربوو:دەمارگیریان بۆ قسەی هیچ شێخ و کەسێک نییە تەنها قسەی اللّه پاشان پێغەمبەر ﷺ نەبێ.

تاقمی ڕزگاربوو: ئەو تاقمەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەیان دەفەرمووێ: **(لا تزالُ طائفةٌ من أمتي ظاهرينَ على الحق،لا يضرُّهم من خذلهُم حتى يَأْتِي أمرُ اللهِ)**رواه مسلم،واتە: بەردەوام تاقمێک لە ئوممەتی من لەسەر ڕاستی دەمێننەوە، زیانبار نابن بەوانەی پشتگیریان ناکەن تاوەکو فەرمانی اللّه تعالی دێتە جێ.

*تاقمی ڕزگاربوو: ڕێز لە پێشەوایانی ئاینی دەگرن بەبێ هیچ دەمارگیرییەک هەر قسەیەک کە لەزاری پێشەوایان دەردەچێت، پێوەر بۆ قسەکانیان قورئان و سوننەتە،هەر قسەیەک پێچەوانەی ئەم دوو سەرچاوەیە بوو دەکێشرێ بە دیوارا، هەروەک ئیمامی (شافعی)ڕەحمەتی خوای لێ بێ وای فەرمووە.

*تاقمی ڕزگاربوو: فەرمان بە چاکە دەکەن و بەرهەڵستی لە خراپە دەکەن، هەروەک اللّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ)**ال عمران١٠٤،واتە:دەبا لە ئێوە ئوممەتێک هەبن کەبانگ بۆشتی چاک بکەن و فەرمان بەچاکە و بەرهەڵستی لە خراپە بکەن.

*تاقمی ڕزگاربوو: داوا لەخەڵکی دەکەن کەوا خۆیان بگرن بە سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ.

*تاقمی ڕزگاربوو: هەموو یاسا داهێنراوەکان دیمۆکراسی و عەلمانی..هتد دەبوغزێنن و داوای حوکمی ئیسلامی دەکەن و هەوڵی دووبارە پیادە کردنەوەی دەدەن.

*تاقمی ڕزگاربوو: بانگی خەڵکی دەکەن بۆ جیهاد، بەهەر سێ وەسیلەوە کە بریتین: لە جیهادکردن بە(زمان و ماڵ و بە گیان) هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفسِكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ)**صحيح رواه أبو داود،واتە: جیهاد بکەن لەگەڵ هاوبەشس دانەران بە ماڵ و بە گیان و بە زمان.

کەواتە دەتوانین بڵێین پوختەی وەڵام ئەوەیە کە سەلەفییەکان لەسەر(٣)بنچینە کار دەکەن، کە بریتین لە: (یەکخواناسی و شوێن کەوتنی پێغەمبەر ﷺ و خۆپاک کردنەوە لە گوناح).

**پرسیار:** ئایا مەرجە کە تاقمی ڕزگاربوو، ئەم تاقمە بێت کە اللَّه تعالى لە دونیا سەریان بخات؟
**وەڵام:** نەخێر،مەرج نییە هەموو تاقمێکی ڕزگار بوو اللَّه سەرکەوتنیان لەسەر دەستا بێنێت...

**پرسیار:** ئەی کێن ئەو کەسانەی کە اللَّه تعالى سەرکەوتنیان لەسەر دەستا دێنێ؟یان ئایا کۆمەڵی سەرکەوتوو (الطائفة المنصورة) کێن؟
**وەڵام:** موجاهیدان و زانایان کۆمەڵی سەرخراون، هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(لا تزالُ طائفةٌ من أمتي على الدينِ ظاهرينَ عَلَى الحَق يُقاتِلونَ وهُمْ أهلُ العِلْم)**رواه البخاري، بەردەوام کۆمەڵێک هەن لە ئوممەتی من کەلەسەر حەقن و شەڕ دەکەن لەڕێگەی اللَّه تعالى، ئەویش خاوەن زانیاریە(توحید)یەکانن.
زانایانیش وەڵامی جیاجیان هەیە لە بەرامبەر ئەم پرسیارە، بۆ نموونە:

١)(ابن حجر): ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: تاقمێکن لە(قدس)پێیان دەڵێن:(شامي)و خاوەن هێزێکی زۆرن بۆ جیهادکردن لەڕێگەی اللَّه تعالى.

٢)ئیمامی(النووي)ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: دەگونجێ کە ئەم تاقمە فرە کۆمەڵێک بن لە هەموو جۆرە بڕوادارێک کە بریتین لە: (موجاهیدان و فەقیهەکان و ڕیوایەی کەران و ڕاڤەکەران و فەرمان بە چاکە و ڕێگران لە خراپە و دونیا نەویست و خواناسان و...هتد.

٣)(ابن المبارك)ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێ: ئەم تاقمە بریتین لە خاوەن فەرموودەکان (أصحاب الحديث)
پوختەی قسانی کۆمەڵی سەرکەوتوو بریتین لەو کەسانەی کە دەستیان گرتووە بە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ و دەست پێشخەری فەرمانی اللَّه تعالى پاشان پێغەمبەر ﷺ نین، جیهادیش دەکەن لە ڕێگەی اللَّه تعالى.

**پرسیار:** موسڵمان چۆن دەبن بە تاقمی سەرکەوتوو؟یان مسڵمان چۆن سەردەکەون؟

**وەڵام:** موسڵمان بە سێ شت سەردەکەون کە بریتین لە:

١)یەکخواپەرستی تەوحید: واتە بەتەنها یەک خوا پەرستی و غەیری ئەو کەسی تر نەپەرستن و بەتەنها داوا لە اللَّه تعالی بکەن و....هتد هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: **(قُلُوا لا الَهَ الاَ اللّهُ تُفْلِحوا)**الأمام أحمد، واتە: بڵێن: (لا اله الا اللّه)و سەردەکەون.

٢)برایەتی: واتە: موسڵمانان لەسەر ئاستی برایەتی و لە پێناو اللّه و تەبایی کار لەگەڵ یەکدا بکەن و مشوور گێڕی کاری یەکتر بن.

بۆیە پێغەمبەری خوا دەفەرمووێ: **(الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بعضهُمْ بَعضاً)**متفق عليه، واتە: بڕوادار بۆ بڕوادار وەک قەڵایەکی پتەو وان کە هەندێکیان هەندێکیان بەهێز دەکەن.

٣)خۆئامادەکردن( الأعداد): دوای بڕینی دوو قۆناغەکەی پێشوو ئینجا هەوڵی خۆ ئامادەکردن بدرێ بۆ بەرپەچدانەوەی هەر هەڕەشەیەک کەلە چارەنووسی ئیسلام و موسڵمانان دەکرێ.

هەروەک اللَّه تعالی دەفەرمووێ: **(وَأَعِدُّوا لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ)**الأنفال٦٠، واتە: بۆیان ئامادە بکەن لەوەندە هێزەی لەتواناتاندا هەیە.

**لە کۆتایی اللّه تعالی ماندووبونمان قبول بکات لە دوعاکانتان بێبەشمان مەکەن ڕەحمەتان لێبێت**

**هیوادارم سوودی هەبوبێت**

**اللَّهُمْ اجْعَلْ عَمَلِي كُلَّهُ صَالِحاً وَاجْعَلْهُ لِوَجْهِک خَالِصاً وَلا تَجْعَلْ أَحَدٍ فِيهِ شَيْئاً**